## پەراوێزەکان:

(١) الموسوعة العربية الجمهورية العربية السورية / رئاسة الجمهورية، هيئة الموسوعة العربية، المجلد١٣، ط١، دمشق، ٢٠٠٥، ص٣٩٤، (مادة العلم ، محمد وليد الجلاد).

(٢) عبدالرحمن محمدامین زەبیحی، قاموسی زمانی کوردی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٧، ل٥٦.

(٣) بۆ زانیاری بڕوانە: عبدالرحمن محمدامین زەبیحی، قاموسی زمانی کوردی، بەرگی دووەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٩، ل٢٢٨" گیو موکریانی، فەرهەنگی کوردستان، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ١٩٩٩، ل١٣، ٩٩.

(٤) نفس المصدر .

(٥) الموسوعة العربية العالمية ، مجلد ١٦، ط٢، الرياض، ١٩٩٩، ص٣٨٤.

(٦) الموسوعة العربية الجمهورية العربية السورية / رئاسة الجمهورية ، هيئة الموسوعة العربية، المجلد١٣، ط١ ، ص٣٩٤.

(٧) ئی.م. دیاکۆنۆف، میدیا، و: بورهان قانع، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، دار الحرية، بەغدا، ١٩٧٨. ل١٥٩-١٦٠.

(٨) ئارتوور کریستێنسێن، ئێرانی سەردەمی ساسانییەکان، لە فارسییەوە وەرگێڕانی: سەلاحەددین ئاشتی، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٦٢٢.

(٩) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: عبدالرحمن مزوری، کاوەیێ ئاسنگەر ئەفسانا نو هاتیە چێکرن، "هاڤیبون" (گۆڤار)، بەرلین، ژمارە(١٨) ٢٠٠٧، ل٧-٣٤.

(١٠) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ئارتوور کریستێنسێن، ئێرانی سەردەمی ساسانییەکان، لە فارسییەوە وەرگێڕانی: سەلاحەددین ئاشتی، ل٦٢٢-٦٢٤، سەرجەمی بەرهەمی حوسێن حوزنی ، بەرگی یەکەم ،کۆکردنەوەی: دەزگای ئاراس، هێنانە سەر رێنوسی نوێی کوردی: مەحموود زامدار، پێداچوونەوەی : عەبدوڵڵا زەنگەنە و فەخرەدین ئامێدی ،هەولێر، ٢٠٠٧، ل٧١-٧٢.

(١١) الموسوعة العربية الجمهورية العربية السورية / رئاسة الجمهورية ، هيئة الموسوعة العربية، المجلد١٣، ط١ ، ص٣٩٤.

(١٢)الموسوعة العربية الميسرة، المجلد الثاني، دار النهضة للطبع و النشر، لبنان، ١٩٨٠، ص١٢٢٥.

(١٣)الموسوعة العربية الجمهورية العربية السورية / رئاسة الجمهورية ، هيئة الموسوعة العربية، المجلد١٣، ط١ ، ص٣٩٨.

(١٤) نفس المصدر.

(١٥) احمد بن علي القلقشندي ، صبح الاعشى في صناعة الانشاء ، ج٤، شرح وعلق عليه وقابل نصوصه: محمد حسين شمس الدين، دار الكتب العلمية ، بيروت، ١٩٨٧" د.محسن محمد حسين، الجيش الايوبي في عهد صلاح الدين ، دار اراس للطباعة والنشر(١٩٠)، اربيل،٢٠٠٣، ص١٠٦.

(١٦)،الموسوعة العربية الجمهورية العربية السورية / رئاسة الجمهورية ، هيئة الموسوعة العربية، المجلد١٣، ط١ ، ص٤٠٠.

(١٧) الموسوعة العربية الميسرة، المجلد الثاني، ص١٢٢٥.

(١٨) احمد تيمور ، تأريخ العلم العثماني ، القاهرة ، ١٣٤٢هـ، ص١٩.

(١٩) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: محمد القدوسي، علم مصر تأريخ القتال والاستقلال، "دبي الثقافية" (مجلة) ، دبي، العدد(٢٧)، أغسطس ٢٠٠٧، ص١٢١-١٢٤.

(٢٠)الموسوعة العربية الجمهورية العربية السورية / رئاسة الجمهورية ، هيئة الموسوعة العربية، المجلد١٣، ط١ ،ص٤٠١.

(٢١) نفس المصدر .

(٢٢) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د.سعد بشير اسكندر ، قيام النظام الأماراتي في كردستان وسقوطه مابين منتصف القرن العاشر و منتصف القرن التاسع عشر، دار الشؤون الثقافية العامة ، بغداد ٢٠٠٥ ، ١٢٣، ص٣١١-٣٢٥.

(٢٣) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عبدالرقيب يوسف، الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى ، الجزء الثاني ، القسم الحضاري، ط٢، دار اراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠١، ص١٢٣-١٢٥.

(٢٤) ئەولیا چەلەبی ، کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا ، و: سەعید ناکام ، لە بڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٩، ل٢٤٤.

(٢٥) عبدالحميد اسماعيل، مێژووی ئاڵای (کۆمەڵەی خۆیبوون) لە تورکیا، "هەتاو" (گۆڤار)، (هەولێر)، ژمارە(١٨٠)، ٣٠/٦/١٩٦٠. ل٩.

٢٦ Dîroka Ala Kurdan

http://www.xirabetuwa.com/Sections-artid-١٩.html

*(١)-Ev stran ji alî Prym û Socin lî Kurdistanê ji devê Cano û ، Yahudîyekî Zaxoyî ku navê wî Pînhas e, hatîye girtin. Ji bo agahdarîyên zêdetin ên li ser vê sitranê binêre:*

-Prym und Socîn, Kurdîsche Sammlungen, Erzählungen u. Lieder în Dîalekt des Tûr 'Abîdîn, St. Petersbourg, ١٨٨٧, r. ٦٤

(٢٧) الدليل العراقي لسنة ١٩٣٦ ، ص١٢٢" السيد عبدالرزاق الحسني ، تأريخ الوزارات العراقية ، ط٧، دار الشؤون الثقافية، بغداد، ١٩٨٨، ص٣٢٩.

(٢٨) کوردستانی عێراق لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا ، لە ئینگلیزییەوە وەریگێڕاوە: سەلمان عەلی، پێشەکی و پێداچوونەوەی: سدیق ساڵح، یەکەم بەرگ، بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٥، ل٢١.

(٢٩) "ژین" (ڕۆژنامە)، سلێمانی ، ژمارە(١٤٥٧)، ١٩٥٩/٧/٢، ل١.

(٣٠) د. عبدالفتاح علي البوتاني، التطورات السياسية الداخلية في العراق ١٤ تموز ١٩٥٨– ٨شباط ١٩٦٣، دار سپيريز للطباعة والنشر– دهوك، مطبعة خاني، دهوك، ٢٠٠٧، ص٥٤.

(٣١) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د.جلیلی جەلیل، هەندێ سیمای ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووری کورد لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، وەرگێڕانی: ئەنوەر قادر محەمەد لە ڕووسییەوە، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٣، ل١٥٤.

(٣٢) هەمان سەرچاوە، ل١٥٨.

(٣٣) هەمان سەرچاوە، ل١٦١" د . صلاح محمد سليم هروری ، تەڤگەرا ئیرشاد و ئیرتقایا کوردی و سەرهەڵدانا بەدلیسێ یا سالا ١٩١٤، "مەتین" (گۆڤار)، دهۆك، خولا (٤)، ژ (١٣٣)، تیرمەها ٢٠٠٥، ل٤٣.

(٣٤) جەمیل توران، گوڵە بەفرینەی خوێناوی، وەرگێڕانی لە یۆنانییەوە: عەلی فەتحی، چاپخانەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٣٣–٣٤.

(٣٥) هەموو ناوچە هاوسێکانی ڕۆژئاوای دێرسیم بەرەو سێواس دەگرێتەوە ، هانز –لۆکاس کیسێر، ڕاپەڕینی کوردە عەلەویەکانی دەرسیم ١٩١٩–١٩٢١ (قۆچگیری) ، لەفرەنسییەوە وەرگێڕانی: نەجاتی عەبدوڵڵا، بنکەی ژین، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل١٧.

(٣٦) اسماعیل حەقی شاوەیس، شۆڕشگێڕی قوچ گیری، "ڕۆژی نوێ"( گۆڤار)، سلێمانی، ژمارە(٤)، تەمووزی ١٩٦١، ل٦" ژمارە(٥) ئابی ساڵی ١٩٦١، ل٢٣. وەك نوری دەرسیمی یەکێ لە ڕابەرانی شۆڕشی قۆچگیری ساڵی ١٣٣٧ك/ ١٩٢ — نوسیویە ، نەخشەیان لە شۆڕشەکەدا بەر لە هەر شتێك دەرکردنی بەیاننامەی ئازادی کوردستان و بەرزکردنەوەی ئاڵای کوردستان بووە لەسەر شاری هۆزات.

(٣٧) بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە شۆڕشی قۆچگیری بڕوانە: د.نوری دەرسیمی ، دەرسیم لە مێژووی کوردستاندا، و: د.ئەحمەد فەتاح دزەیی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١، ل١٥٦، ١٦٧، ١٩٣" الاثار الكاملة للدكتور أحمد عثمان أبوبكر ، اعداد: ازاد عبيد صالح، مركز ژين لأحياء التراث الوثائقي والصحفي، مطبعة شڤان، سليمانية، ص٤٠.

(٣٨) س.ج. ادموندز، كرد و ترك و عرب ، ترجمة: جرجيس فتح الله ، دار التآخي، بغداد، ١٩٧١، ص٣٤" ئەحمەد خواجە ، بەرگی یەکەم، چ. شەفیق بغداد، ١٩٦٨، ل٥٥.

(٣٩) ئەحمەد خواجە، چیم دی، بەرگی یەکەم ، ل٩٩" بەرگی سێیەم، لە دوای لاپەڕە ١٠٠ لاپەڕەکە خۆی ژمارەی بەسەرەوە نییە دیارە ئەو ئالایە لەگەڵ ئالای جەمعیەتی تەشکیلاتی ئیجتماعی کورد جیایە.

(٤٠) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: رەفیق حیلمی، یادداشت، چ٢، ل ٥١٢–٥١٣.

(٤١) رەفیق حیلمی، یادداشت، چ٢، ل٥٣٠.

(٤٢) بڕوانە: د.عیزەدین مستەفا رەسول ، دیسان ئالای کوردستان ، سایتی خەندان ، ڕۆژی ٢٠١٠/٨/٣١.

(٤٢) رەفیق حیلمی، یادداشت، بەشی یەکەم، چاپی دووەم، چاپخانەی رۆشنبیری و لاوان، هەولێر، ١٩٨٨، ل ١٢٧–١٦٥.

(٤٤) ئەو کۆمەڵەیە چاپخانەیەکی بچووکی نوێی لە پەترپاکییەی کلدانی لە دیار بەکر کڕیوە کە بە یەکەم چاپخانەی کوردی لە کوردستان دانراوە ، بەو چاپخانەیە رۆژنامەیەکیان بە ناوی (گازی) بەچوار لاپەڕە دەرکردووە . بۆ زانیاری پتر بڕوانە: اكرم جميل باشا، مذكراتي، ت: د.قدري الدياربكري، ط٣، دياربكر، ٢٠٠٧ ص٢٥.

(٤٥) اكرم جميل باشا ، مذكراتي ، ص٢٤–٢٥.

(٤٦) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: ئیسماعیل گوێڵداش، جەمعییەتی تەعالیی کوردستان، وەرگێڕانی: زریان رۆژهەلاتی، بنکەی ژین، ز(١٢٧)، سلێمانی، ٢٠١١، ل١٣.

(٤٧) اكرم جميل باشا ، مذكراتي ،ص٢١.

(٤٨) بيار مصطفى سيف الدين، السياسة البريطانية تجاه تركيا وأثرها في كوردستان ١٩٢٣–١٩٢٦، دار سبيريز للطباعة و النشر ، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٤، ص٢١.

(٤٩) اكرم جميل پاشا، مذكراتي، ص٤٠.

(٥٢) مالمیسانژ، پێگەی کەمال فەوزی بتلیسی لە رێکخراوەکانی کوردا، لە تورکییەوە وەرگێڕانی: زریان رۆژهەلاتی، پیداچوونەوەی: سدیق سالح، بنکەی ژین، چ. شڤان، سلێمانی،٢٠٠٧، ل٢٠٣،٢٠٦.

(٥١) هەمان سەرچاوە،ل٢٠٦ـ٢٠٧.

(٥٢) هەمان سەرچاوە،ل٢١٠.

(٥٣) بۆ زانیاری پتر بروانە: عەلی تەتەر نێروەیی ، بزاڤا سیاسی ل کوردستانێ ١٩٠٨-١٩٢٧، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ - هەولێر ، دەزگەهێ سپیریز یا چاپ و وەشانێ ، دهۆك. کۆمەڵەی تەعالی کوردستان لە ٢٠ ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٨ بە سەرۆکایەتی شێخ عەبدولقادری نەهری دامەزراوە. بۆ زانیاری زیاتر بروانە: نێروەیی ، ل١٥٠.

(٥٤) زنار سلوپی في سبيل كوردستان، ترجمة: رضوان علي باديني، رابطة كاوة للثقافة الكردية ، بيروت ، ١٩٨٧، ص٦٩" قەدری جەمیل پاشا (زنار سلوپی) دۆزی کوردستان، و: فەیزوڵلا برایم خان و بارزان وهاب، لە بلاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری هەرێمی کوردستان ، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی بیر (١٢) چ٣، دیار بەکر، ٢٠٠٧ ، ل٧١" منذر الموصلي ، الحياة السياسية والحزبية في كوردستان ، ١٩٩٢،ص٢٥٨. ئەوەی ( موسلی ) یش هەر لە سلوپی وەرگیراوە.

(٥٥) بروانە: ئیسماعیل گوێڵداش، جەمعییەتی تەعالیی کوردستان، وەرگێڕانی: زریان رۆژهەلاتی، ل٢٦٤-٢٦٥.

(٥٦) جەمال نەبەز، کۆبەرهەم ،ژمارە (٧) زنجیرەی وتاری وتوێژ لەگەڵ دەزگەی راگەیاندنی گشتی، ژمارە(٢)، چ١، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٤٠٢.

(٥٧) قەتلوعامی کورد لە تورکیا ، لە فەرانسییەوە وەرگێڕانی ، پێشەکی و پەراوێزنووسینی: نەجاتی عەبدوڵلا، لە بلاوکراوەکانی جڤاتا وەلاتیێ کوردا (خۆیبوون)، ژمارە(٢) بنکەی ژین، چ، شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل٥٣.

(٥٨) مالمیسانژ، پێگەی کەمال فەوزی بتلیسی لە رێکخراوەکانی کورددا، لە تورکییەوە وەرگێڕانی : زریان رۆژهەلاتی، ، ل٩٩.

(٥٩) حامید گەوهەری، کۆماری کوردستان، ل١٥١-١٥٢.

(٦٠)جەمال نەبەز، کۆبەرهەم ،ژمارە (٧) زنجیرەی وتاری وتوێژ لەگەڵ دەزگەی راگەیاندنی گشتی، ژمارە(٢)، چ١، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٤٠١.

(٦١) بۆ زانیاری پتر بروانە: دیوانی ئەحمەد موختار جاف، ئامادەکردن و بەراوردکردن و لێکدانەوە و پێشەکی بۆ نووسینی: پرۆفسیۆر دوکتۆر عیزەدین مستەفا رەسووڵ، چ. الادیب، بەغدا، ١٩٨٦.

[62] بڕوانە: یادداشتەکانی مەیجەر نوئێل لە کوردستان، وەرگێڕانی: حسین احمد جاف و حسین عثمان نێرگسەجاری، چ.ئۆفسیت حسام، بەغدا، ١٩٨٤.

([63]) جەمال نەبەز، س. پ، ل ٤٠٢.

([64]) بڕوانە: جەمال نەبەز، هـ. س، ل ٤٠٢.

(٦٥) بڕوانە: هلبين محمدامين المزوري ، حزبي هيوا – الامل – ١٩١٩–١٩٤٦، دراسة تأريخية سياسية، دار سپيريز للطباعة والنشر ، مطبعة حاجي هاشم، اربيل، ٢٠٠٨، ص٦١هـ.

([66]) جەمال نەبەز، س. پ..، ل٤٠١.

(٦٧) روهات الاكوم: خويبون و ثورة اگرى، الترجمة العربية: باشراف رابطة كاوة للثقافة الكردية، مراجعة: شكور مصطفى، مطبعة اوفيست هتولير ، اربيل، ٢٠٠٠، ص٢٣. سەبارەت بەو بنەماڵەیە عەبدوڵلآ زەنگەنە وردەکاری باشی بۆ کردووە و زۆرترین ئاگاداری لەبارەیەوە نووسیووە و وەك خۆشی نووسیوویە، وردەکاری و سەروسۆراخ و بەدواداچوونی پتری دەوێت. بۆ زانیاری پتر بڕوانە: ڕۆژی کورد، ئامادەکردن و لێکۆڵینەوەی: عەبدوڵلآ زەنگەنە، پێشەکی: د.ئیسماعیل شوکر، بنکەی ژین، چ.شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٩٦–١٠٠.

(٦٨) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: سەرجەمی بەرهەمی حسین حوزنی، کۆکردنەوە و لەچاپدانی دەزگای ئاراس، بەسەرپەرشتی: د.کوردستان موکریانی، هێنانە سەر ڕێنووسی نوێی کوردی: مەحموود زامدار، پێداچوونەوەی: عەبدوڵلآ زەنگەنە و فەخرەدین ئامێدی، بەرگی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٦٠٦–٦٠٧، (لێرەدا خاکی لەجیاتی فانی نووسراوە)، هەمان سەرچاوە.

(٦٩) بڕوانە: عەلی تەتەر نێرەیی، ل١٥٠.

([70]) ئیسماعیل گوێڵداش، جەمعیەتی تەعالیی کوردستان، وەرگێڕانی زریان ڕۆژهەلآتی،ل٦٦.

[71] "ژیان"(ڕۆژنامە)، سلێمانی، ژمارە(٢٤١)، ٢٩/مایسی/١٩٣٠.

(٧٢) سەرجەم بەرهەمی حوزنی موکریانی، ل٥٢٤–٥٢٥.

(٧٣) هەمان سەرچاوە، ل٥٢٨–٥٢٩.

(٧٤) هەمان سەرچاوە، ل٥٣١.

(٧٥) بەڵگەنامەی بەریتانیایی ژمارە(٧٧٨١/ ٣٧١ F.O) سلێمانیە ١٢/١٢/١٩٢١بە وەرگرتن لە(د.عثمان علي، دراسات في الحركة الكوردية المعاصرة١٨٣٣ـ١٩٤٦، منشورات مكتبة التفسير، اربيل، ٢٠٠٣،ص٣٦٧" کریس کۆچیرا، وەرگێڕانی: محەمەد ڕەیانی، چاپخانەی صدف تاران، ١٣٦٩(١٩٩٠)، ل٩٤.

(٧٠) لاهوتی، کوردستان و کورد، د. جەبار قادر لە روسییەوە کردوویە بە کوردی و تێبینی لەسەر نووسیوە، "هەزارمێرد" (گۆڤار)، سلێمانی، ژمارە(٣) ئاداری ١٩٩٨، ل١٧٢.

(٧١) د. عثمان علي، دراسات...ص٣٤٨.

(٧٨) "العراق"( جريدة)، بغداد، العدد (١٥٤٣)، ١٩٢٥/٦/١.

(٧٩) مالمیسانژ ، پێگەی کەمال فەوزی بەتلیسی لە رێکخروەکانی کورد دا ، ل٩٩.

(٨٠) هەمان سەرچاوە ،ل٢٠٦.

(٨١) هەمان سەرچاوە ،ل٢٠٧.

(٨٢) مالمیسانژ، ل٢١٠.

(٨٣) عەبدولعەزیز یاموڵکی ، کوردستان و راپەرینەکانی کورد، و: شێرزاد کەریم، ئامادەکردنی: سدیق ساڵح، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم(٣٧)، سلێمانی ١٩٩٩، ل٧٩.

(٨٤) د. كمال مظهر احمد، انتفاضة ١٩٢٥ في كردستان تركيا ، رابطة كاوة للثقافة الكردية(٦٦)، ص٩٠-٩١.

(٨٥) دیدارێك لەگەڵ بەشیر سەبری "میدیا"( رۆژنامە)، هەولێر، ژمارە (٨٢) ، ٢٠٠٠/١٢/١٥، ل٥. ناوبراو ٢٠ ساڵ لێکۆڵینەوەی لەمەڕ کورد لە رووسیا کردووە و ئەندامی لێکۆڵینەوەی کوردییە لە رووسیا. بە وەرگرتن (لە غازی حەسەن، خوێندەواری ، دەزگای ئاراس ، هەولێر، ٢٠٠٠، ل٢٤٤-٢٤٥).

(٨٦) عبدالحمید اسماعیل، مێژووی ئاڵای (کۆمەڵەی خۆیبوون) لە تورکیادا "هەتاو" (گۆڤار) ، هەولێر، ژ(١٨٠)، ٣٠حوزەیران ١٩٦٠، ل٩.

(٨٧) بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە خۆیبون، بروانە: کۆنی رەش ، جمعيه خۆيبون ١٩٢٧ وقائع ثورة ارارات ١٩٣٠، تقديم ومراجعة : الدكتور عبدالفتاح علي بوتاني ، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٠.

(٨٨) کۆنێ رەش، المصدر السابق، ص٤٦-٤٧.

(٨٩) نفس المصدر، ص٤٧.

(٩٠) بیرەوەریەکانی ئیحسان نوری پاشا ، و: وریا قانع ، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر،٢٠٠١، ل٥٩، ٨٥.

(٩١) Dr.BLTCH CHIRGUH,Kurt Sorunu,Kokeni Ve Nedenleri, avesta |KURDOLOJ|, Istanbul, ٢٠٠٩, p.١١٥.

لە وێنەکەدا دوو پێشمەرگە لە سەر شاخێن، یەکیان بە دووربین سەیر دەکات و ئەوەی دیکەش راوەستاوە و لە پشتەوەشیان ئاڵای کوردستان هەڵکراوە. لە ژێر وێنەکەدا بە تورکی نووسراوە:

(٩٢) بڕوانە: قەتلوعامی کورد لە تورکیا، ٢٠٠٨، ل٨٢" د.بلەج شێرکۆ، القضية الكوردية ، ماضى الكورد وحاضرهم، دار اراس للطباعة والنشر، ط٢، مطبعة اراس ، اربيل، ٢٠١١، ص١٩–٢١–٤٠–٧٠–١٠٠.

(٩٣) بڕوانە: قەتلوعامی کورد لە تورکیا، لە فرانسییەوە وەرگێرانی و پێشەکی و پەراوێزنووسینی: نەجاتی عەبدوڵلا، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ٩، ١٦، ٨٢.

(٩٤) بڕوانە: kone Res, Ala Kurdan di Nevbera Bedirxani u Barzaniyande, "Digle" Govara, Hewler) J٢٤,Adar ٢٠٠٠. " ژويس بلو ، مسأله كرد برسى تاريخى وجامعه شناسى، ترجمه: دكتر برويز امين، چ١، تهران ١٣٧٩، ص٤٥.

(٩٥) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: د. عیزەدین مستەفا رەسول، بەشێك لە یاداشتەکانم ، بەرگی یەکەم ، چاپخانەی دەزگای حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل١٢٤–١٢٥.

(٩٦) هلبين محمدامين المزوري ، حزبي هيوا – الامل – ١٩١٩–١٩٤٦، ص٦١" کەریم زەند، گەشتی زەند ، تۆماری تەمەن، بەرگی یەکەم، دەزگای سپیریز یا چاپ و وەشانێ ، چاپخانە وەزارەتە پەروەردێ ، هەولێر، ٢٠٠٤، ل١٤٤" مذكرات نوري شاويس، من منشورات حزب الشعب الديموقراطي الكردستاني، ص٢٤.

(٩٧) طارق جامباز ، هەفتەنامەی (گۆڤار) لە بلاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری– لێژنەی چاپەمەنی ژمارە (٣٦)، چاپخانەی کریستال، هەولێر، ١٩٩٨، ل٩،١٢،٣١.

(٩٨) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: د. یاسین سەردەشتی، چەند راستییەکی مێژوویی سەبارەت بەحیزبی ئازادی کوردستان. www.dimane. com

(٩٩) بۆ زانیاری دەربارەی بڕوانە: حامید گەوهەری : کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس (٢٤٦) ، هەولێر، ٢٠٠٤، ئەرشیفی راپۆرتی کونسول سۆڤیەت لە ورمێ.

(١٠٠) وەزارەتی دەرەوەی رووسیای فیدراتیڤ، ئومر/٣٢٧، پ٣٦٩، لاپەڕەکانی ٥١–٥٤. بە وەرگرتن لە: (حامید گەوهەری: کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان، ل١٥١).

(١٠١) راپۆرتی باڵوێزی سۆڤیەت لە ئێران رۆژی ١٢/١٠/١٩٤٥ لە بەشێك لە راپۆرتی رەوانکراو لە ئێرانەو بۆ گ.م، دیمیترۆف، سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤیەت ،

لەسەر ڕووداوەکانی کوردستان و پارتی ژێکاف ، لە ١٩٤٥/١٠/١٢ ، ئەرشیفی ناوەندی هەلگرتن ، لێکۆلینەوەی بەلگەنامە میژووییەکانی سەردەم ، ف ١٧/ نو ١٢٨ / د٤٤/ لاپەڕەکانی ٧٢-٧٩، بە وەرگرتن لە : ( حامید گەوهەری ، کۆمەلەی ژیانەوەی کوردستان ، ل١٥١).

(١٠٢) سەبارەت بە دامەزراندنی کۆماری کوردستان و قازی محەمەد. بڕوانە : د. یاسین سەردەشتی ، کوردستانی ئێران لێکۆلینەوەیەکی میژوویی لە جولانەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورد ١٩٣٩-١٩٧٩، زنجیرە کتێبی دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی سەردەم(٢٢١) سلێمانی، ٢٠٠٣.

(١٠٣) هەلالە(گۆڤار)، بۆکان، ژمارە (١)، ڕەشەمەی ١٩٤٥،١٣٢٤، ل١١ ، بە وەرگرتن لە( د. هیمداد حوسێن ، ڕۆژنامەوانی کوردی ، ل٧٢٧).

(١٠٤) بۆ زانیاری پتر بڕوانە : هەلکردنی ئالای مقدسی کوردستان لە مەهاباد "کوردستان" گۆڤار ، مەهاباد، ژمارە (٣) خاکەلێوەی ١٣٢٥ (١٩٤٥)، د. هیمداد حوسێن، ڕۆژنامەوانی کوردی لە سەردەمی کۆماری دیموکراتی کوردستان ١٩٤٣-١٩٤٧، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس (٧٧١)، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٥٢٣، حامید گەوهەری ، کۆماری کوردستان ١٩٤٦/١/٢٢- ١٩٤٦/١٢/١٧، چ. حاجی شەهاب، هەولێر ، ٢٠١١ ، ل١٤٤.

(١٠٥) بڕوانە: "کوردستان" ڕۆژنامە، مەهاباد، ژمارە (١)، ١١ ژانویە ١٩٤٦، ل٢، ژمارە(٥)، ٢٠ ژانویە ١٩٤٦، ل٢" ژمارە (٣٧)، ٢٠ ئاوریل ١٩٤٦، ل٢، ژمارە(٤٣)، ٤مە ١٩٤٦، ل٣.

(١٠٦) بڕوانە: حامید گەوهەری ، کۆماری کوردستان، ل٢٥، وێنەی هەیە).

(١٠٧) بڕوانە: د.عیزەدین مستەفا ڕەسول، دیسان ئالای کوردستان، سایتی خەندان، ٢٠١٠/٨/٣١.

(١٠٨) بڕوانە: عبدالحمید اسماعیل ، میژووی ئالای کۆماری کوردستانی ئێران، هەتاو (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (١٨١)، ١٥ی تەموزی١٩٦٠، ل٤٢.

(١٠٩) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مسعود بارزانی ، بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد ١٩٣١-١٩٥٨، وەرگێڕانی: سەعید ناکام، چاپخانەی خەبات، دهۆك، ١٩٩٨، ل١٦٩.

١١٠ بۆ زانیاری پتر بڕوانە: موحسین دزەیی، وێستگەکانی ژیانم، تاریق ئیبراهیم شەریف بە عەرەبی گفتوگۆیەکەی سازداوە، ئیسماعیل بەرزنجی کردوویەتی بە کوردی، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس ژمارە(٨٨٠)، هەولێر، ٢٠٠٩، ل١٠٠-١٠١.

١١١ نامەی فەلەکەدین کاکەیی لە ڕۆژی ٢٠١٢/٨/٨.

(١١٢) بڕوانە: بلاوکراوەی دەزگای ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی پاسۆك لە ١٩٩١/١٢/١٠.

(١١٣) بڕوانە: بەدران ئەحمەد حەبیب، رەمزی نافیع رەشید، ئەو کوردەی ئالای کوردستانی داهێنا، "ئالای ئازادی" (رۆژنامە)، هەولێر، ژمارە ٢١، ١٩٩٢/٤/٢٦، ل ٥-٦.

(١١٤) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: ئازاد عوبێد سالح ، ئالای کوردستان، "ئالای ئازادی"، ژمارە (٢٤)، ١٩٩٢/٥/٢٤، ل٥" د.ئازاد عوبێد، دیسان کێ ئالای کوردستانی داهێنا؟، "K٢١"(گۆڤار)، هەولێر، ژمارە(٧)،٢٠١٠، ل٤١-٤٧.

(١١٥) بڕوانە: محەمەد گۆران، نەریمان خۆشناو، رەمزی نافیع رۆڵەیەکی هەولێری فیداکاری سەربەخۆی کوردستان، "بەدرخان" (مانگنامە)، هەولێر، ژمارە ١٢٥" محەمەد گۆران، نەریمان خۆشناو، رەمزی نافیع ، رۆڵەیەکی هەولێری فیداکاری سەربەخۆیی کوردستان، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان، چاپخانەی نەوا، هەولێر، ٢٠٠٨ "عەبدولستار ئەحمەد سەعدون، ئالای کوردستان لە نێوان شەریعەت و یاسادا، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری ، هەولێر، ل٣٩-٤١. . هیچ ئاماژەیەك بەو وەڵامەی سەرەوە نەکراوە.

(١١٦) بڕوانە: ئازاد عوبێد سالح، ئینجا نۆرەی هەلکردنی ئالایە، "ئالای ئازادی"، ژمارە(٤٤)، ١٩٩٢/١٠/١٨، ل٢.

(١١٧) بڕوانە: ئازاد عوبێد سالح، ئینجا نۆرەی هەلکردنی ئالایە، "ئالای ئازادی"، ژمارە(٤٤)، ١٩٩٢/١٠/١٨، ل٢.

(١١٨) "پەرلەمان"، (رۆژنامە)، هەولێر، ژمارە (٥٣)، ١٩٩٩/١١/٢٤.

١١٩ "وەقایعی کوردستان" (رۆژنامەی رەسمی حکومەتی کوردستان)، هەولێر، ژمارە(٥١)، ٢٠٠٤/١٠/٢٨، ل١٩.

١٢٠ "وەقایعی کوردستان"، ژمارە(٦٢)، ٢٠٠٦/٨/٢٧، ل١١.

(١٢١) "هەرێم"، (گۆڤار)، ژمارە (٣٨٠)، ٢٠٠٦/٩/١٢.

(١٢٢) بڕوانە: عەبدوڵڵا زەنگەنە، "ژینۆ"،(گۆڤار)، لەندەن، ژمارە (٢٨)، کانوونی یەکەمی ٢٠٠١، ل٧-١١.

(١٢٣) ولیم ایغلتن الابن، جمهوریة مهاباد، ترجمة وتعلیق: جرجیس فتح الله، ط٢، مطبعة وزارة التربیة، اربیل، ١٩٩٩، ص٧٦-٧٧.

(١٢٤) عەبدوڵڵا زەنگەنە، ئالای کوردستان هەڵگەڕاوەی هیچ ئالایەکی دیکە نییە، "رۆژنامەنووس" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (١٢)، پایزی ٢٠٠٧، دوابەرگی ناوەوە.

(١٢٥) بڕوانە: موسەدەق توفی، ئالایێ کوردستانێ د دیرۆکیدا، "دهۆك" (گۆڤار)، ژمارە (٣٢) چریا ئێکی ٢٠٠٦، ل٧.

(١٢٦) بڕوانە: فەیسەڵ دەباغ، حیزبی هیوا و شۆڕشی "١٩٤٣-١٩٤٥"ی بارزان، دەزگای بلاوکردنەوەی گولان، چ. رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٧، ل٦٧.

(١٢٧) یوسف ملك، کردستان او بلاد الکرد: مراجعة ومقدمة: د.عزالدین مصطفی رسول، ط٢، منشورات مکتب الفکر والتوعیة في الاتحاد الوطني الکردستاني، السلیمانیة، ٢٠٠٦، ص٣٥-٤٤.

(١٢٨) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: گۆتفرید یۆهانز میوللەر، لە رۆژهەلاتی گڕگرتوودا، بەدران ئەحمەد حەبیب لە ئینگلیزییەوە کردوویە بە کوردی، د. مارف خەزنەدار پێداچوونەوە و پێشەکی و تێبینی لەسەر نووسیوە، هەولێر، ١٩٩٢؛ بەدران ئەحمەد حەبیب، رەمزی نافیع رەشید ئەو کوردەی ئالای کوردستانی داهێنا، "ئالای ئازادی"، ژمارە (٢١)، ٢٦/٤/١٩٩٢، ل ٥-٦.

(١٢٩) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: جەمال خەزنەدار، ئینسکلوپیدیای رۆژنامەگەریی کوردی ١٨٩٨_٢٠١٠، پێداچوونەوە و پوختەکردن: عەبدوڵلا زەنگەنە، لە بلاوکراوەکانی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان/گۆڤاری رۆژنامەنووس (٤)، هەولێر، ٢٠١١، ل ٥٥٢_٥٥٣.

(١٣٠) بڕوانە: فەرهاد پیربال، بزاڤی رۆژنامەگەریی کوردی لە ئەورووپا و ئەمریکا ١٨٩٧-١٩٩٢، "سەنتەری برایەتی" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (٥)، ١٩٩٨، ل١٣٩.

(١٣١) دیدار لەگەڵ مومتاز حەیدەری رۆژی ١٧/٧/٢٠١٢، هەولێر.

(١٣٢) د. ئازاد عوبێد سالح، مەئموون دەباغ: ژیان و خەباتی سیاسی ١٩٣٦_١٩٦٣، " زانکۆ" (گۆڤاری زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر)، ژمارە (٤٢)، سالی ٢٠٠٩، ل٥٣.

(١٣٣) دیدار لەگەڵ جەمال خەزنەدار، لە دایکبوونی هەولێر، رۆژنامەنووسێکی دیارە، هەولێر، ٥/١٢/٢٠١٠.

(١٣٤) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: فلك الدین کاکەیي، القذافي والقضیة الکردیة، منشورات دار آراس للطباعة والنشر (٧٥٩)، اربیل، ٢٠٠٨، ص١٦٢_١٦٥.

(١٣٥) بڕوانە: "TEVGER" (رۆژنامە)، سوید، هژمار (٢)، سالی (١)، ئاداری ١٩٨٩، ل١.

(١٣٦) بڕوانە: دیدار لەگەڵ عەلی جوکل، "هەولێر" (هەفتەنامە)، هەولێر، ژمارە ٢٣، ٣/٥/٢٠٠٧، ل ٦.

(١٣٧) بڕوانە: نافیع دیبەگەیی، دیدار لەگەڵ جەوهەر غەمگین، "هەولێر"، ژمارە ٢٩، ٤/٦/٢٠٠٧، ل٦.

(١٣٨) بڕوانە: نافیع دیبەگەیی، دیدار لەگەڵ سامیە شاکر (مەشخەڵ)، "هەولێر"، ژمارە ٢٤، ١/٥/٢٠٠٧،ل ٦.

([139]) بڕوانە:عەبدوڵلا پەشێو: خەونەکانم هەموویان لە دەوری سەربەخۆیی دەسووڕێنەوە، دیمانە: ئاسۆ حەسەن- محەمەد خدر مەولوود، "هەرێم"(گۆڤار)، هەولێر، ژمارە()، ١/١١/٢٠٠٢، ل١٤.

([140]) بڕوانە: "رووداو" (رۆژنامە)، دیمانە لەگەڵ بورهان مەجید، ژمارە (٣٠)، ٣/١١/٢٠٠٨، ل١٠.

([141]) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: ئازاد مزووری، ئالایێ کوردستانێ سمبولا مەیا نەتەوی دناڤ شعرێن شاعران دە، لە بڵاوکراوەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستان، ژمارە (١٩)، چاپخانەی هاوسەر، هەولێر، ٢٠٠٧ " فەرهاد پیرباڵ، ئاڵای کوردستان، "واتە" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (١٦)، تشرینی دووەمی ٢٠١١.

## لیستی سەرچاوەکان:

### سەرچاوە بە زمانی کوردی:

**بەڵگەنامە**

(١) بڵاوکراوەی دەزگای رۆشنبیری و راگەیاندنی پاسۆك لە ١٠/١٢/١٩٩١.

(٢) ئەرشیفی راپۆرتی کونسوڵی سۆڤیەت لە ورمێ، وەزارەتی دەرەوەی روسیای فیدراتیف، ئومر، ٣٢٧، پ٣٦٩، لاپەڕەکانی ٥١-٥٤ (بەوەرگرتن لە حامید گەوهەری: کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان، هەولێر، ٢٠٠٤).

(٣) راپۆرتی باڵوێزی سۆڤیەت لە ئێران رۆژی ١٢/١٠/١٩٤٥ لە بەشێك لە راپۆرتی رەوانکراو لە ئێرانەوە بۆ گ.م، دیمیترۆف، سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤیەت، لەسەر رووداوەکانی کوردستان و پارتی ژێکاف، لە ١٢/١٠/١٩٤٥ ، ئەرشیفی ناوەندی هەڵگرتن، لێکۆڵینەوەی بەڵگەنامە مێژووییەکانی سەردەم، ف ١٧/ نو ١٢٨ / د٤٤/ لاپەڕەکانی ٧٢-٧٩، (بە وەرگرتن لەحامید گەوهەری، کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان، هەولێر، ٢٠٠٤).

(٤) بەڵگەنامەی بەریتانیایی ژمارە (F.O ٣٧١ /٧٧٨١) سلێمانیە ١٢/١٢/١٩٢١ بە وەرگرتن لە (د. عثمان علي، دراسات في الحركة الكوردية المعاصرة ١٨٣٣ـ١٩٤٦، منشورات مكتبة التفسير، اربيل، ٢٠٠٣، ص٣٦٧.

**کتێب بە زمانی کوردی**

(١) ئارتوور کریستێنسێن ، ئێرانی سەردەمی ساسانییەکان ، لە فارسییەوە وەرگێڕانی سەلاحەددین ئاشتی، سلێمانی، ٢٠٠٦.

(٢) ئـازاد مـزووری، ئـالآیێ کوردسـتانێ سمبـولا مـەیا نەتـەوی دنـاڤ شـعرێن شـاعران دە، لـە بڵاوکراوەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستان، ژمارە (١٩)، چاپخانەی هاوسەر، هەولێر، ٢٠٠٧.

(٣) ئەحمەد خواجە، چیم دی، بەرگی یەکەم ، چ. شەفیق بغداد، ١٩٦٨.

(٤) ــــــــــــ، چیم دی، بەرگی سێیەم، چ. راپەڕین، سلێمانی، ١٩٧٠.

(٥) ئەولیا چەلەبی، کورد لـە مێـژووی دراوسـێکانیدا، و: سـەعید ناکـام ، لـە بڵاوکراوەکـانی کـۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٩.

(٦) ئی.م. دیاکۆنۆف، میـدیا، و: بورهـان قـانع، دەزگـای رۆشـنبیری و بڵاوکردنـەوەی کـوردی، دار الحرية، بەغدا، ١٩٧٨.

(٧) بیرەوەریەکانی ئیحسان نوری پاشـا، و: وریـا قـانع، دەزگـای چـاپ و بڵاوکردنـەوەی موکریـانی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.

(٨) جلیلی جەلیل (د.)، هەندێ سیمای ژیانی کۆمەلآیەتی و سیاسـی و کولتـووری کـورد لـە کۆتـایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، وەرگێڕانی: ئەنوەر قادر محەمەد لـە رووسـییەوە، ستۆکهۆلم، ١٩٩٣.

(٩) جەمیل توران، گوڵە بەفرینەی خوێناوی ، وەرگێڕانی لە یۆنانییەوە: عەلی فەتحی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨.

(١٠) حامید گەوهەری، کۆماری کوردستان ١٩٤٦/١/٢٢– ١٩٤٦/١٢/١٧، چ حاجی شەهاب، هـەولێر، ٢٠١١.

(١١) ــــــــــــ، کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان ، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس (٢٤٦)، هەولێر، ٢٠٠٤.

(١٢) رۆژی کورد، ئامادەکردن و لێکۆڵینەوەی: عەبدوڵلا زەنگەنە ، پێشەکی: د. ئیسماعیل شـوکر، بنکەی ژین، چ. شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥.

(١٣) سەرجەمی بەرهەمی حسێن حوزنی، کۆکردنەوە و لەچاپدانی دەزگای ئاراس، بە سەرپەرشـتی: د. کوردسـتان موکریـانی، هێنانـە سـەر ڕێنووسـی نـوێی کـوردی: مـەحمود زامـدار، پێداچـوونەوەی: عەبدوڵلا زەنگەنە و فەخرەدین ئامێدی، بەرگی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٧.

(١٤) طارق جامباز، هەفتەنامەی (گۆڤار)، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری– لێژنەی چاپەمەنی ژمارە (٣٦)، چاپخانەی کریستال، هەولێر، ١٩٩٨.

(١٥) عەبدولعەزیز یامولکی، کوردستان و ڕاپەڕینەکانی کورد، و: شێرزاد کەریم، ئامادەکردنی: سدیق ساڵح ، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم (٣٧)، سلێمانی ١٩٩٩.
(١٦) عبدالرحمن محمدامین زەبیحی، قامووسی زمانی کوردی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٧.
(١٧) ـــــــــــــــــــــــ، قامووسی زمانی کوردی، بەرگی دووەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٩.
(١٨) عەبدولستار ئەحمەد سەعدون، ئاڵای کوردستان لە نێوان شەریعەت و یاسادا، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری ، هەولێر
(١٩) عەلی تەتەر نێروەیی، بزاڤا سیاسی ل کوردستانێ ١٩٠٨–١٩٢٧، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ – هەولێر ، دەزگەهێ سپیریز یا چاپ و وەشانێ ، دهۆك.
(٢٠) عیزەدین مستەفا ڕەسول (د.)، بەشێك لە یاداشتەکانم ، بەرگی یەکەم، چاپخانەی دەزگای حەمدی ، سلێمانی، ٢٠٠٦.
(٢١) قەتلوعامی کورد لە تورکیا، لە فەرەنسییەوە وەرگێڕانی، پێشەکی و پەراوێز نووسینی: نەجاتی عەبدوڵلا، لە بڵاوکراوەکانی جڤاتا وەلاتیێ کوردا (خۆیبوون)، ژمارە (٢) بنکەی ژین، چ، شڤان سلێمانی، ٢٠٠٨.
(٢٢) غازی حەسەن، خوێندەواری ، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٠ .
(٢٣) قەدری جەمیل پاشا (زنار سلوپی) دۆزی کوردستان ، و: فەیزوڵلا برایم خان و بارزان وهاب، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری هەرێمی کوردستان ، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بیر (١٢) چ٣، دیار بەکر، ٢٠٠٧.
(٢٤) کریس کۆچیرا، وەرگێڕانی: محمد رەیانی، چاپخانەی صدف تاران، ١٣٦٩، (١٩٩٠).
(٢٥) کەریم زەند، گەشتی زەند، تۆماری تەمەن ، بەرگی یەکەم، دەزگای سپیریز یا چاپ و وەشانێ ، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ ، هەولێر، ٢٠٠٤.
(٢٦) کوردستانی عێراق لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا ، لە ئینگلیزییەوە وەریگێڕاوە : سەلمان عەلی، پێشەکی و پێداچوونەوەی : سدیق ساڵح، یەکەم بەرگ، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٥.
(٢٧) گیو موکریانی، فەرهەنگی کوردستان، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ١٩٩٩.

(٢٨) مالمیسانژ، پێگەی کەمال فەوزی بتلیسی لە ڕێکخراوەکانی کورددا، وەرگێڕانی لە تورکییەوە: زریان ڕۆژهەڵاتی، پێداچوونەوەی: سدیق ساڵح، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٧.

(٢٩) مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد، ١٩٣١–١٩٥٨، وەرگێڕانی: سەعید ناکام، چاپخانەی خەبات، دهۆک، ١٩٩٨.

(٣٠) محەمەد گۆران، نەریمان خۆشناو، ڕەمزی نافیع ڕۆڵەیەکی هەولێری فیداکاری سەربەخۆی کوردستان، "بەدرخان" (مانگنامە)، هەولێر، ژمارە ١٢٥". محەمەد گۆران، نەریمان خۆشناو، ڕەمزی نافیع ، ڕۆڵەیەکی هەولێری فیداکاری سەربەخۆیی کوردستان، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان، چاپخانەی نەوا، هەولێر،٢٠٠٨ "عەبدولستار ئەحمەد سەعدون، ئاڵای کوردستان لە نێوان شەریعەت و یاسادا، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر

(٣١) نوری دەرسیمی (د.)، دەرسیم لە مێژووی کوردستاندا ، و: د. ئەحمەد فەتاح دزەیی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.

(٣٢) هانز– لۆکاس کیبسێر، ڕاپەڕینی کوردە عەلەویەکانی دەرسیم ١٩١٩–١٩٢١ (قۆچگیری)، لە فەرەنسییەوە وەرگێڕانی: نەجاتی عەبدوڵا، بنکەی ژین، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠٦.

(٣٣) هیمدادی حوسێن (د.)، ڕۆژنامەوانیی کوردی لە سەردەمی کۆماری دیموکراتی کوردستان ١٩٤٣–١٩٤٧، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس (٧٧١)، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان، هەولێر، ٢٠٠٨.

(٣٤) یاسین سەردەشتی (د.)، کوردستانی ئێران لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لە جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورد ١٩٣٩–١٩٧٩، زنجیرە کتێبی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی سەردەم (٢٢١) سلێمانی، ٢٠٠٣.

### وتاری گۆڤار و ڕۆژنامەکان

(١) ئازاد عوبێد ساڵح، ئینجا نۆرەی هەڵکردنی ئاڵایە، "ئاڵای ئازادی"، ژمارە (٤٤)، ١٨/١٠/١٩٩٢.

(٢) ــــــــــ ، ئاڵای کوردستان، "ئاڵای ئازادی"، ژمارە (٢٤)، ٢٤/٥/١٩٩٢.

(٣)ــــــــــ، دیسان کێ ئاڵای کوردستانی داهێنا؟، "K٢١" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (٧)، ٢٠١٠، ل٤١-٤٧.

(٤) د.ئازاد عوبێد ساڵح، مەئموون دەباغ: ژیان و خەباتی سیاسی١٩٣٦_١٩٦٣، " زانکۆ" (گۆڤاری زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر)، ژمارە (٤٢)، ساڵی ٢٠٠٩.

(٥) اسماعیل حەقی شاوەیس، شۆڕشگێڕی قوچ گیری "ڕۆژی نوێ" (گۆڤار)، سلێمانی ، ژمارە (٤)، تەمووزی ١٩٦١ " ژمارە (٥) ئابی ساڵی ١٩٦١.

(٦) بەدران ئەحمەد حەبیب، ڕەمزی نافیع ڕەشید، ئەو کوردەی ئاڵای کوردستانی داهێنا، "ئاڵای ئازادی" (ڕۆژنامە)، هەولێر، ژمارە ٢١، ١٩٩٢/٤/٢٦.

(٧) "TEVGER" (ڕۆژنامە)، سوید، هژمار (٢)، ساڵی (١)، ئاداری ١٩٨٩.

(٨) "پەرلەمان"، (ڕۆژنامە)، هەولێر، ژمارە (٥٣)، ١٩٩٩/١١/٢٤.

(٩) خالید دەربەندی، دیدارێك لەگەڵ د. بەشیر سەبری "میدیا"( ڕۆژنامە)، هەولێر، ژمارە (٨٢)، ٢٠٠٠/١٢/١٥، ل٥" غازی حەسەن، خوێندەواری ، دەزگای ئاراس ، هەولێر، ٢٠٠٠، ل٢٤٤_٢٤٥. ناوبراو ٢٠ ساڵ لێکۆڵینەوەی لەمەڕ کورد لە ڕووسیا کردووە و ئەندامی لێکۆڵینەوەی کوردییە لە ڕووسیا.

(١٠) دیمانە لەگەڵ بورهان مەجید،"ڕووداو"(ڕۆژنامە)، هەولێر، ژمارە(٣٠)، ٢٠٠٨/١١/٣.

(١١) "ژیان"(ڕۆژنامە)، سلێمانی، ژمارە (٢٤١)، ٢٩/مایسی/١٩٣٠.

(١٢) "ژین"(ڕۆژنامە)، سلێمانی، ژمارە(١٤٥٧)، ١٩٥٩/٧/٢.

(١٣) صلاح هروری (د.)، تەڤگەرا ئیرشاد و ئیرتقایا کوردی و سەرهەڵدانا بەدلیسێ یا ساڵا ١٩١٤، "مەتین" (گۆڤار)، دهۆك، خولا (٤) ژ (١٣٣)، تیرمەها ٢٠٠٥.

(١٤) عبدالحمید اسماعیل، مێژووی ئاڵای کۆماری کوردستانی ئێران ، "هەتاو" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە ١٨١، ١٥ ی تەموزی ١٩٦٠.

(١٥) ________، مێژووی ئاڵای (کۆمەڵەی خۆیبوون) لە تورکیادا"هەتاو"، ژمارە (١٨٠) ، ٣٠ حوزەیران ١٩٦٠.

(١٦) عبدالرحمن مزوری، کاوەیێ ئاسنگەر ئەفسانا نو هاتیە چێکرن، "هاڤیبون" (گۆڤار)، بەرلین، ژمارە (١٨) ٢٠٠٧.

(١٧) عەبدوڵڵا پەشێو: خەونەکانم هەموویان لە دەوری سەربەخۆیی دەسووڕێنەوە، دیمانە: ئاسۆ حەسەن– محەمەد خدر مەولوود، "هەرێم"(گۆڤار)، هەولێر، ژمارە()، ٢٠٠٢/١١/١.

(١٨) عەبدوڵڵا زەنگەنە، ئاڵای کوردستان هەڵگەراوەی هیچ ئاڵایەکی دیکە نییە، "ڕۆژنامەنووس" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (١٢)، پایزی ٢٠٠٧.

(١٩) عەبدوللا زەنگەنە، "ژینو"، (گۆڤار)، لەندەن، ژمارە (٢٨)، کانوونی یەکەمی ٢٠٠١.

(٢٠) فەرهاد پیربال، ئالاّی کوردستان، "واتە" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (١٦)، تشرینی دووەمی ٢٠١١.

(٢١) فەرهاد پیربال، بزاڤی رۆژنامەگەریی کوردی لە ئەورووپا و ئەمریکا ١٨٩٧-١٩٩٢، "سەنتەری برایەتی" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (٥)، ١٩٩٨.

(٢٢) "کوردستان" رۆژنامە، مەهاباد، ژمارە (١)، ١١ژانویە ١٩٤٦، ژمارە (٥) ٢٠ ژانویە ١٩٤٦، ژمارە (٣٧)، ٢٠ ئاوریل ١٩٤٦، ژمارە (٤٣)، ٤ مە ١٩٤٦.

(٢٣) لاهوتی، کوردستان و کورد، د. جەبار قادر لە روسییەوە کردوویە بە کوردی و تێبینی لەسەر نووسیوە، "هەزارمێرد" (گۆڤار)، سلێمانی، ژمارە (٣) ئاداری ١٩٩٨.

(٢٤) موسەدەق توفی، ئالایێ کوردستانێ د دیرۆکیدا، "دهۆک" (گۆڤار)، ژمارە (٣٢) چریا ئێکی ٢٠٠٦.

(٢٥) نافیع دیبەگەیی، دیدار لەگەڵ جەوهەر غەمگین، "هەولێر"، ژمارە ٢٩، ٢٠٠٧/٦/٤.

(٢٦) نافیع دیبەگەیی، دیدار لەگەڵ عەلی جوکل، "هەولێر" (هەفتەنامە)، هەولێر، ژمارە ٢٣، ٢٠٠٧/٥/٣.

(٢٧) نافیع دیبەگەیی، دیدار لەگەڵ سامیە شاکر (مەشخەڵ)، "هەولێر"، ژمارە ٢٤، ٢٠٠٧/٥/١.

(٢٨)"هەرێم"، (گۆڤار)، ژمارە (٣٨٠)، ٢٠٠٦/٩/١٢.

(٢٩) "هەلاڵە" (گۆڤار)، بۆکان، ژمارە (١)، رەشەمەی ١٩٤٥،١٣٢٤، (بەوەرگرتن لە د. هیمداد حوسێن، رۆژنامەوانی کوردی لە سەردەمی کۆماری دیموکراتی کوردستان ١٩٤٣-١٩٤٧، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس (٧٧١)، هەولێر، ٢٠٠٨).

(٣٠) هەڵکردنی ئالای مقدسی کوردستان لە مەهاباد، "کوردستان"( گۆڤار )، مەهاباد، ژمارە (٣) خاکەلێوەی ١٣٢٥ (١٩٤٥).

**کتێب بە زمانی عەرەبی:**

(١) الدليل العراقي لسنة ١٩٣٦.

(٢) الموسوعة العربية الجمهورية العربية السورية / رئاسة الجمهورية ، هيئة الموسوعة العربية، المجلد١٣، ط١، دمشق، ٢٠٠٥، (مادة العلم ، محمد وليد الجلاد).

(٣) الموسوعة العربية العالمية ، مجلد ١٦، ط٢، الرياض ١٩٩٩.
(٤) الموسوعة العربية الميسرة، المجلد الثاني.
(٥) احمد بن علي القلقشندي، صبح الاعشى في صناعة الانشاء، ج٤، شرح وعلق عليه وقابل نصوصه ، محمد حسين شمس الدين، دار الكتب العلمية ، بيروت، ١٩٨٧، د. محسن محمد حسين، الجيش الايوبي في عهد صلاح الدين ، دار آراس للطباعة والنشر (١٩٠) ، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٣.
(٦) احمد تيمور ، تأريخ العلم العثماني ، القاهرة ، ١٣٤٢هـ.
(٧) الاثار الكاملة للدكتور أحمد عثمان أبوبكر ، اعداد: ازاد عبيد صالح، مركز ژين لأبحاث التراث الوثائقي والصحفي ، مطبعة شڤان، سليمانية، ٢٠٠٩.
(٨) اكرم جميل باشا ، مذكراتي ، ت: د.قدري الدياربكري، ط٣، دياربكر، ٢٠٠٧.
(٩) بيار مصطفى سيف الدين ، السياسة البريطانية تجاه تركيا وأثرها في كوردستان ١٩٢٣–١٩٢٦، دار سبريز للطباعة والنشر ، مطبعة وزارة التربية اربيل.
(١٠) بلەج شێرکۆ (د.)، القضية الكوردية ، ماضى الكورد وحاضرهم ، دار اراس، ط٢، مطبعة اراس ، اربيل، ٢٠١١.
(١١) روهات الاكوم : خويبون وثورة اگرى ، الترجمة العربية: باشراف رابطة كاوة للثقافة الكردية ، مراجعة: شكور مصطفى، مطبعة اوفيست هەولير، اربيل، ٢٠٠٠.
(١٢) زنار سلوپى، في سبيل كوردستان، ترجمة: رضوان علي باديني، رابطة كاوة للثقافة الكردية، بيروت ، ١٩٨٧.
(١٣) س.ج. ادموندز، كرد و ترك و عرب ، ترجمة: جرجيس فتح الله، دار التآخي، بغداد، ١٩٧١.
(١٤) سعد بشير اسكندر (د.) ، قيام النظام الأماراتي في كردستان وسقوطه مابين منتصف القرن العاشر ومنتصف القرن التاسع عشر، دار الشؤون الثقافية العامة ، بغداد ٢٠٠٥.
(١٥) السيد عبدالرزاق الحسني ، تأريخ الوزارات العراقية ، ط٧، دار الشؤون الثقافية، بغداد، ١٩٨٨.
(١٦) عبدالرقيب يوسف الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى ، الجزء الثاني ، القسم الحضاري، ط٢، دار آراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠١.
(١٧) عبدالفتاح علي البوتاني (د.)، التطورات السياسية الداخلية في العراق ١٤ تموز ١٩٥٨– ٨ شباط ١٩٦٣، دار سپيريز للطباعة والنشر دهوك، مطبعة خاني ، دهوك، ٢٠٠٧.
(١٨) عثمان علي (د.)، دراسات في الحركة الكوردية المعاصرة ١٨٣٣-١٩٤٦، منشورات مكتبة التفسير، اربيل، ٢٠٠٣.

(١٩) فلك الدين كاكه يي، القذافي والقضية الكردية، منشورات دار آراس للطباعة والنشر (٧٥٩)، اربيل، ٢٠٠٨.
(٢٠) كمال مظهر احمد (د.)، انتفاضة ١٩٢٥ في كردستان تركيا، رابطة كاوة للثقافة الكردية (٦٦)، ٢٠٠١.
(٢١) كۆنى رەش، جمعيه خۆيبون ١٩٢٧ وقائع ثورة آرارات ١٩٣٠، تقديم ومراجعة: الدكتور عبدالفتاح علي بوتاني، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٠.
(٢٢) منذر الموصلي، الحياة السياسية والحزبية في كوردستان، دار رياض الريس للكتب والنشر، لندن، ١٩٩١.
(٢٣) هلبين محمدامين المزوري ، حزبي هيوا – الامل – ١٩١٩-١٩٤٦ دراسة تأريخية سياسية – دار سپيريز للطباعة والنشر ، مطبعة حاجي هاشم، اربيل، ٢٠٠٨.
(٢٤) يوسف ملك، كردستان او بلاد الكرد: مراجعة ومقدمة: د.عزالدين مصطفى رسول، ط٢، منشورات مكتب الفكر والتوعية في الاتحاد الوطني الكردستاني، السليمانية، ٢٠٠٦
(٢٥) ژويس بلو ، مسأله كرد برسى تاريخى وجامعه شناسى، ترجمه: دكتر برويز امين، چ١، تهران ١٣٧٩.
(٢٦) مذكرات نوري شاويس، منشورات حزب الشعب الديمقراطي الكردستاني.

**گۆڤار و رۆژنامه به زمانی عەرەبی**

(١) "العراق"( جريدة) ، بغداد، العدد (١٥٤٣) ، ١٩٢٥/٦/١.
(٢) محمد القدوسي، علم مصر تأريخ القتال والاستقلال،"دبي الثقافية"(مجلة)، دبي ، العدد (٢٧)، أغسطس ٢٠٠٧.

**سەرچاوە بە لاتینی:**

(١) Kone Res, Ala Kurdan di nevbera Bedirxani u Barzaniyande, Govara Digle, J٢٤,Adar ٢٠٠٠

**ماڵپەڕ:**

(١) عیزەدین مستەفا رەسول (د.)، دیسان ئاڵای کوردستان، سایتی خەندان، رۆژی ٢٠١٠/٨/٣١.
(٢) یاسین سەردەشتی (د.)، چەند راستییەکی مێژوویی سەبارەت بەحیزبی ئازادی کوردستان. www.dimane. com

**دیدار:**

(١) دیدار لەگەڵ جەمال خەزنەدار، هەولێر، ٢٠١٠/١٢/٥.

(٢) دیدار لەگەڵ مومتاز حەیدەری، هەولێر، ٢٠١٢/٧/١٧.

**الخلاصة**

للعلم تاريخ قديم، تزامن ظهوره واستخدامه مع ظهور الحضارات، واستخدم (العلم) كرمز للاحترام والمكانة والسيادة، ومصدره الاولى مستنبط من التقاليد العسكرية، فكان لكل حضارة ودولة حتى الشخصيات (علما).

طوال التاريخ حدثت تغيرات كثيرة على - علم -، والعلم كان دوما ملونا، وكل لون يرمز الى معنى خاص به.

والملاحظ لدى الكورد، وقبل القرن العشرين، بان المصادر المتوفرة، لم تحتوي على اية اشارة للعلم، والاهم هو - العلم القومي - والذي يظهر ويتجسد مع تشكيل الدولة القومية.

في القرن العشرين ومع اندلاع الانتفاضات والثورات وتشكيل المنظمات والجمعيات والاحزاب، ظهر (علم) خاص بالشعب الكوردي، فكان متعدد الاشكال والالوان، فكل جهة وحسب وجهة نظرها حددت هذه الاشكال والالوان، الا ان اكثرهم تجسيدا وتمثيلا، هو العلم الذي قامت جمعية التشكيلات الاجتماعية الكوردية بتحديد الوانه وشكله، محتويا على مستطيلات ثلاثة ذات الوان: (الاحمر، الابيض، الاخضر)، مع (شمس مشع) في الوسط، ويحمل كل لون دلالته الخاصة معبرا على الاكثر عن الطبيعة الكوردستانية.

والعلم هذا، اعترف به معظم ابناء شعب كوردستان، وفي اقليم كوردستان، تم سن قانون خاص به، ومرفوع حاليا في الاقليم، كما واعترف به جمعية الجغرافيين الدولية.

# کاریگەری ڕێکەوتنامەی زەهاو لەسەر کوردستان

ئا: قارەمان حیدر رحمان / قوتابی ماستەر

## پێشەکی

سەرەتای دەرکەوتنی دەوڵەتی سەفەوی لە (١٥٠١ز)و پرۆسەی بڵاوکردنەوەی ئاینزای شیعەی دوانزە ئیمامی و دروستکردنی مەترسی لەسەر هەژموونی زلهێزی تازە پێگەیشتووی عوسمانی، لەگەڵ چەند فاکتەرێکی تر بەس بوون بۆ دەوڵەتی عوسمانی بۆ ئەوەی ئاراستەی فراوانخوازیەکانی لە ڕۆژئاوا بگۆڕێت بەرەو ڕۆژهەلات لە پێناو سەقامگیرکردنی دەسەلاتەکەی و بەدەستهێنانی دەستکەوتی زیاتر بۆ دروستکردنی قەوارەی ئیمپراتۆریەتەکەی لە ناوچەکەدا.

دەرئەنجامی هەوڵەکانی سەفەوی لە پرۆسەی فراوانخوازیەکەیدا بریتی بوو لە داگیرکردنی بەشێکی زۆری خاکی کوردستان، کە لە پێناو سەپاندنی سیاسەتەکەی بە ئاگرو ئاسن حوکمی ناوچە کوردیەکانی دەکرد، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کوردەکان ئەوپەری بێزاریان هەبێت لە دەسەلات و شێوازی فەرمانڕەوایی سەفەویەکان بەتایبەتی دوای لابردنی دەسەلاتدارانی کورد لەسەر پۆستەکانیان و دانانی سەرکردە سەربازیە قزلباشەکان لە شوێنیاندا.

هەر بۆیە سەیردەکەین هاتنی هێزەکانی عوسمانی بۆ ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بەگشتی بۆ کوردستان بەتایبەتی گۆڕانکاریەکانی گەورە دروست دەکات و دەبێتە خاڵێکی وەرچەرخان لە مێژووی ناوچەکە، پاش ئەوەی عوسمانیەکان لە شەڕێکی یەکلایی کەرەوە لە دەشتی چالدێران ڕووبەڕووی سەفەویەکان دەبنەوە لە ساڵی (١٥١٤ز)و سەرکەوتنێکی سەربازی گەورە بەدەست دەهێنن و دواتریش

لەگەڵ کوردەکان ڕێکدەکەون بە ناوبژیوانی مەلا ئیدریسی بەدلیسی و بەردەوام دەبن لە بەدواکەوتنی سەفەویەکان لەو ناوچانەی نەخشەو پلانیان بۆ دانابوو دەستیان بەسەردابگرن و زنجیرەیەك سەرکەوتنی یەك لەدوای یەك بەدەست دەهێنن بەسەر سەفەوییەکان.

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە دروست بوونی ئەم ململانێیە لە نێوان هەردوو دەوڵەت تاو نا تاوێك بۆتە هۆی ڕاگرتنی شەڕو ڕاگەیاندنی ئاگربەست و چەندان جاریش هەردوولا پەنایان بردۆتە بەر ڕێکەوتن و بەستنی پەیماننامەی سیاسی بۆ دابەشکردنی بەرژەوەندیەکان لە نێوان یەکتری بە ڕێکەوتن، زۆرترین ئەم بەرژەوەندیانەش پەیوەندی هەبووە بە خاکی کوردستان کە خاوەنی توانایەکی بەهێزی ماددی و مرۆیی بوو، هەربۆیە هەر لە ناو ئەم چوارچێوەدا ڕێکەوتنامەی زەهاو بەسترا لە نێوان هەردوو دەوڵەت لە ساڵی (١٦٣٩ز)، بەو پێیە بەرژەوەندیەکانیان لە کوردستان لەسەر بنەمای دابەشکردنی خاکی کورد دابەشکرد.

پێویستە بگوترێت کە دەمێکە لە سەرچاوە مێژووییەکان، ناوی پەیماننامەی زەهاو هاوتا لەگەڵ مەسەلەی دابەشکردنی کوردستان دێتە پێش، بۆ بەدیارخستنی کاریگەری و ئەنجامەکانی ئەو پەیماننامەیە لەسەر کوردستان بیرۆکەی بە ئەنجام گەیاندنی ئەم توێژینەوەیە دروست بوو.

جێگەی ئاماژەپێکردنە کەوا کارێکی ئاسان نیە کەوا کاریگەری و ئەنجامەکانی ئەو پەیماننامەیە لەسەر کوردستان دیار بخرێت، لەبەر ئەوەی دەقی ڕەسەنی پەیماننامەکە لای هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی وونە، بۆیە توێژینەوە لەو بابەتە پێویستی بە زانیاری زۆر و وردبونەوەی لەسەرخۆ هەیە، بۆ ئەوەی توێژەر بە ئاسانی مامەڵە لەگەڵ ئەو بابەتانە بکات و ڕاست و دروستی زانیاریەکان بەدیاربخات.

بــە هــەر جۆرێــك بێــت توێژینەوەكــەمان لەســەر ڕێكەوتنامــەی زەهــاو و كاریگەریەكانی بەسەر كوردستان بە گوێرەی نەخشەو پلانێك دابەشمان كردووە بۆ سەر سێ تەوەری سەرەكی جگە لە پێشەكیەكەی، لە تەوەری یەكەم دا باسی ڕەوشــی سیاســی كوردســتان پــێش بەســتنی ڕێكەوتنامــەی زەهــاو (١٦٣٩ز)و كاریگەری ململانێی و پەیماننامەكانی عوسمانی و سەفەوی لەسەر كوردستان دەكەین لە ماوەی (١٥١٤–١٦١٨ز)، لە تەوەری دووەمیش دا باس لە بارودۆخ و زەمینەی بەستنی پەیماننامەی زەهاو دەكەین لە ساڵی (١٦٣٩ز)، لە تەوەری سێیەمیشدا باس لە كاریگەری سیاسی و ئابووری ڕێكەوتنامەكە دەكەین لەسەر كوردستان، لە كۆتایشدا ئاماژەمان بەو خاڵانە كردووە كە لە دەرئەنجامی توێژینەوەكە پێگەیشتوین.

شایانی باسە بۆ ئەنجامدانی ئەم توێژینەوە پشتم بە چەندان سەرچاوە بەستووە بەڵام ئەوەی زۆر سوودم لێوەرگرتووە : ن.لازاریف، (مێژووی كوردستان). د.سعدی عوسمان هەروتی: كوردستان والامبراطورية العثمانية(دراسة في تطور سياسة الهيمنة العثمانية في كوردستان ١٥١٤–١٨٥٢م). و كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر(دراسة في علاقاتها الادارية والسياسية والاقتصادية مع ايالتي بغداد والموصل). محەمەد سوهەیل تەقوش: عوسمانیەكان لە دامەزراندنی دەوڵەتەوە تا كودەتا بەسەر خەلافەتدا. سالح هەركی: بەشێك لە پەیماننامەكانی دژ بە كورد. و ئەحمەد حەمەدەمین و دلشاد مەحمود: كاریگەری پەیماننامەی زەهاو (١٦٣٩)، لەسەر كوردستان.

دیارە ئەم توێژینەوە لە كەم و كورتی بەدوور نیە بۆیە دەخوازم بە چاوێكی ڕەخنەگرانەوە سەیربكرێت بۆ ئەوەی لە ئەزموونی داهاتووم سوودی لێوەربگرم.

## تەوەرەی یەکەم

## ڕەوشی سیاسی کوردستان پێش بەستنی پەیماننامەی زەهاو(١٦٣٩ز)

لە سەرەتای سەدەی شانزدەهەمدا کاتێك دەوڵەتی سەفەوی لەسەر دەستی شا ئیسماعیل(١٥٠١-١٥٢٤ز) دامەزرا، دەستیان کرد بە چالاکیە فراوانخوازیەکانیان لە کوردستان و ئاسیای بچووك، لەو کاتەدا دەوڵەتی عوسمانی سەرقاڵی شەڕەکانی بوو لە بەرەی ئەوروپا، بەڵام هەمیشە بەووردی چاودێری پێشهاتە سیاسی و سەربازیەکانی لە ناوچەکە دەکرد، عوسمانیەکان زۆر چاوەڕوانیان نەکرد زوو بڕیاریاندا بخزێنە ناو بازنەی ململانێ پاش ئەوەی هەستیان بە مەترسی فراوانخوازیەکانی سەفەوی کرد لەسەر سنوری ڕۆژهەڵاتیاندا، ئەمەش بە یەکێك لەو هۆکارانە دادەنرێت لە گۆڕینی ئاراستەی فراوانخوازیەکانیان لە ڕۆژئاواوە بۆ ڕۆژهەڵات[1].

هۆکاری سەرهەڵدانی ململانێی عوسمانی و سەفەوی بیروڕای جیاوازی لە نێو سەرچاوە مێژووییەکان لەسەرە، بەڵام هۆکاری سەرەکی سەرهەڵدانی ململانێی نێوانیان دەگەڕێتەوە بۆ چاوتێبڕینی هەردوو دەوڵەت بۆ دەست بەسەراگرتنی ناوچە ستراتیژەکەی کوردستان کە مەبەستیان بوو بیخەنە ژێر قەڵەمڕەوی خۆیان[2].

بێگومان هەریەك لەم دوو دەوڵەتە لە هەندێك لە مەبەستەکانیان بۆ داگیرکردنی کوردستان خاڵی هاوبەشیان هەبووە وەکو سوود وەرگرتن لە تواناکانی ماددی و مرۆیی کوردستان، لە هەندێکی تریش جیاوازبوینە بەتایبەتی بۆ سەفەویەکان کە مەبەستیان بووە ئاینزای شیعەی دوانزدە ئیمامی بەسەر کوردەکاندا بسەپێنن، کە بێ شك عوسمانیەکان لەو مەسەلەیەدا دڵنیابوینە لە کوردەکان چونکە لەسەر ئاینزای سونە بووینە کە ئاینزای عوسمانیەکان بوو،

هەر ئەم هۆکارەشە کە دواتر دەبێتە هۆی نزیك بوونەوەی کوردەکان لە دەوڵەتی عوسمانی و شەڕ لەتەك هێزەکانیان دەکات لە بەرامبەر سەفەویەکان.

لە دوای پەرەسەندنی رووداوەکان هەردوو هێزی عوسمانی و سەفەویەکان لە دەشتی چالدێران لە ۲۳ئابی ۱٥۱٤ز رووبەرووی یەکتری دەبنەوە و لە ئەنجامیشدا عوسمانیەکان سەرکەوتنێکی گەورە لە شەڕەکەدا بەدەست دەهێنن، دواتریش لە ساڵی ۱٥۱٥ز لە رێگای مەلائیدریسی بەدلیسی(*) لەگەڵ میرو سەرۆك هۆزە کوردیەکانی دیاربەکرو ماردین و موسڵ و شەنگارو حەسەن کیفاو عمادیەو جەزیرەی ئیبن عومەر لەسەر دروستکردنی هاوپەیمانەتیەك لە دژی سەفەویەکان لەسەر چەند خاڵێکی دیاریکراو لە نێو خۆیاندا رێك دەکەون، کە رێکەوتنەکە بە شێوەیەکی سەرزارەکی دەبێت لە نێوان هەردوولا[٣]. لە دوای ئەم رێکەوتنەش عوسمانیەکان بە پشتیوانی کوردەکان بەردەوام دەبن لە پرۆسە سەربازیەکانیان دژە سەفەویەکان و زنجیرەیەك سەرکەوتنی یەك لەدوای یەك بەدەست دەهێنن و تاوەکو تەواوی خاکی کوردستانیان دەکەوێتە ژێردەست[٤].

شایانی باسە شەڕی چاڵدێران و سەرکەوتنی عوسمانیەکان لەو شەڕەدا بە خاڵێکی وەرچەرخانی گرنگ دادەنرێت سەبارەت بە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە گشتی و کوردستانیش بەتایبەتی، لەبەر ئەوەی بەر لە هەموو شتێك بووە هۆی دابەشکردنی خاکی کوردستان بە شێوەیەکی پراکتیکی لە نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی، بەشی زۆری کەوتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیەکان و بەشەکەی تریش کەوتە دەستی سەفەویەکان، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی یەکێك لە لێکۆڵەرەوەکان ساڵی ۱٥۱٤ز بە ساڵی شوومی کورد وەسفی بکات، بەڵام توێژەرێکی تر ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە کوردەکان بە سەرکەوتنی

عوسمانیەکان لە شەڕی چاڵدێران ئاسوودە بوون لەبەر ئەوەی لەژێر دەسەڵاتی سەفەویەکان ڕزگاریان بوو[٥].

شەڕی چاڵدێران بووە سەرەتایەك بۆ ململانێی دوورو درێژی نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی، لەدوای ئەم شەڕە بەردەوام هەردوو لایەن بەدوای دەرفەت و هەلی ڕەخساو دەگەڕان و بۆ شەڕکردنی زیاتر لەگەڵ یەکتری، بەتایبەتی سەفەویەکان کە لە قۆناغی دوای چاڵدێران هەوڵی گێڕانەوەی ناوچەکانی ڕۆژئاوای چیاکانی زاگرۆس و کوردستانیان دەدا کە لە شەڕەکان لە دەستیان دابوون[٦].

شایانی باسە دوای ئەوەی بۆ ماوەی بیست ساڵ شەڕ لە نێوان هەردوو دەوڵەتی سەفەوی و عوسمانی بەردەوام بوو لە دواتر بە بەستنی پەیماننامەی ئەماسیا لە ٢٩ی مایسی ١٥٥٥ز کۆتایی هات، ئەم پەیمانەش کە نۆبەرەی پەیمانەکانی ئاشتی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە بوو لە نێوان شا تەهماسبی یەکەمی سەفەوی و سوڵتان سلێمانی قانونی عوسمانی بەسترا و بە سەرەتای چەسپاندنی دابەشکردنی کوردستان لە نێوان ئێران و دەوڵەتی عوسمانیداو بە یەکەمین پەیماننامە دادەنرێ بۆ دیاری کردنی سنوور لە نێوان هەردوو دەوڵەتدا، ئەوەی زەمینەی خۆشکرد بۆ بەستنی ئەم پەیماننامەیە خراپی بارودۆخی ناوەخۆ و هەڕەشەی دەرەکی بوو لەسەر هەردوولا، بە کۆتایە هاتنی ئەم شەڕانە سوڵتان بەشێکی تری لە ناوچەکانی کوردستانی خستە ژێر ڕکێفی دەوڵەتی عوسمانی لەمانەش ناوچەکانی وان و ئەرزەڕۆم شارەزوور بوون، پشکی کوردستانیش لەو شەڕو ناکۆکیانە هەمیشە بریتی بووە لە لەناوبردنی توانای ماددی و مرۆیی، لەبەر ئەوەی ببوە گۆڕەپانی شەڕ، بەڵام ئەم پەیمانە کێشە سنوریەکانی نێوان ئەو دوو دەوڵەتەی چارەسەر نەکرد[٧].

دەكرێ بڵێین زۆربەی ئەو پەیماننامانەی لە نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی بەستراون پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بە كورد هەبووە، بۆیە سەیردەكەین پەیماننامەی ئەماسیا دوای زنجیرەیەك شەڕو ناكۆكی لە نێوان هەردوو دەوڵەت لە ناوەڕۆكی دا هەردوولا جەخت دەكەنەوە لەسەر داڵدەنەدانی نەیارانی یەكتری و لە كاتی دەستگیركردنیان پێویستە بیان دەنەوە دەستی یەكتری[٨]. ئەمەش جگە لە خاڵەكانی تری ناوپەیماننامەكە ڕێكەوتنە لە نێوان هەردوو دەوڵەت لەسەر پەكخستنی جموجوڵی كوردەكان و دروستكردنی بەربەست بوو لەبەردەم ئارەزووی كوردەكان بۆ پشت بەستن بە توانای ماددی و مرۆیی خۆیان بۆ دابینكردنی گوزەران و پیادەكردنی پیشەی هەمیشەییان كە جگە لە كشتوكاڵكردن بە شێوەیەكی سەرەكی پشتیان بەستاوە بە كاری شوانكاری و بۆ ئەم مەبەستەش لە نێوان سنووری هەردوو دەوڵەت هاتوچۆیان كردووە، چونكە پێكهاتەی سەرەكی كوردەكان كۆچەری و نیمچە كۆچەرو نیشتەجێ بووینە، هەروەها هەردوو دەوڵەت مەبەستی سەرەكیان بریتی بووە لە كۆنترۆڵكردنی ناوچەكانی ستراتیژی لە كوردستان و سوود وەرگرتن لە تواناكانی ماددی و مرۆیی[٩].

هەرچۆنێك بێت جارێكی تر هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی كەوتنەوە شەڕ لە دژی یەكتری، ئەمجارە لەگەڵ هاتنە سەر حوكمی شاعەباسی یەكەم (١٥٨٧-١٦٢٩)و بیركردنەوەی لە چارەسەركردنی باری ناوەخۆیی و دەرەكی وولات و یەكلایەكردنەوەی بەرەی شەڕەكان لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا، هەڵسا بە ڕەوانەكردنی نوێنەری خۆی بۆ دەوڵەتی عوسمانی بە مەبەستی ئاشتەوایی لە ئەنجامدا هەردوولا بۆ جارێكی تریش لە ٢١ی مارتی ١٥٩٠ز پەیماننامەیەكی تریان بەست كە لە سەرچاوە توركیەكان بە پەیماننامەی فەرهاد پاشا و لە سەرچاوە فارسیەكانیش بە پەیماننامەی نەورۆز ناسراوە بەپێی ئەم پەیماننامەیە

ئێرانیەکان دەستیی هەڵگرت لە ئازەربایینجان و شارەزوور و بەشێك لە کوردستان بۆ تورکەکان، دووبارە هەردوو دەوڵەت جەختیان دەکردەوە لەسەر دالّدەنەدانی نەیارانی یەکتری، کە هەم دیسان مەبەستیان کورد بووە لەو بەندە لە ناو ڕێکەوتنەکەیاندا، هەمیشە بە گشتی هەردوو دەوڵەت دەپرژانە سەر مەسەلەی کوردو دابەشکردنی خێرو بێری خاکی کوردستان و گۆشەگیرکردنی جموجۆڵی ئابووریان بۆ سوودی تایبەتی خۆیان[١٠].

دەکرێت بڵێین ئەم پەیماننامەو چەندان پەیمانی تریش کە لە دوای ئەم پەیمانانە هاتوون وەك پەیماننامەکانی نسوح پاشا (١٦١١ز و ئەستەمبۆل ١٦١٣ز و سەراو ١٦١٨ز) لە دوای شەڕو ململانێیەکی دورو درێژ هاتووە، کە لە دوای ئەوەی دیسان سەفەویەکان شەڕیان هەڵگیرساندەوە لە ساڵی ١٦١٢ز و توانیان ئەو ناوچانە بگرنەوە کە لە پێشتر لەدەستیان دابوو تەنها شارەزوور نەبێت، لە ماوەی نێوان (١٦٢٣-١٦٢٤ز) هێزەکانی ئێرانی دەستیان گرت بەسەر بەغداو هەموو عێراقی عەرەبی لەگەڵ هەردوو شاری موسڵ و بەسرەو ئەوانی تریش. لە کاتی شەڕەکانی شا عەباسی سەفەویدا کوردەکان لە ڕیزی پیشەوەی هێزەکانی ئێرانی بوون تەنانەت خان ئەحمەد خانی ئەردەلان خۆی دەستی گرت بەسەر بەغدا[١١].

سەیردەکەین ئەم پەیماننامانە کاریگەری زۆریان هەبووە لەسەر کوردستان، لەبەر ئەوەی ئەگەر سەیری بەندەکانی بکەین دەبینین باسیان لە چارەسەرکردنی تەنگژەی سنووری نێوان هەردوولا کراوە، ئەوەش ڕوون و ئاشکرایە کە لەو کاتەدا کوردستان کەوتبووە نێوان هەردوولا دەوڵەت و کاتێك باسی سنور دەکەن مەبەستیان دابەشکردنی کوردستان بووەو لە نێوان خۆیاندا، لە کاتی پەیمان بەستنەکەش کامیان بەهێزتر بوایە پشکی زیاتری لە خاکی کوردستان بەردەکەوت[١٢].

## تەوەرەی دووەم

## ڕێکەوتنی هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی لە زەهاو ساڵی ١٦٣٩ز

ڕێکەوتنامەی زەهاو لە ١٧ی مایسی ساڵی ١٦٣٩ز لە شاری زەهاوی کوردستانی لە نێوان هەردوو دەوڵەتی ناکۆکی سەفەوی بە سەرکردایەتی شا عەباسی یەکەم و دەوڵەتی عوسمانی بە سەرکردایەتی سوڵتان و موڕادی چوارەم مۆرکرا(١٣).

سەبارەت بە گفتوگۆکانی ئەم دوو دەوڵەتە لەو ڕێکەوتنامەیە، مەسەلەی سنووری نێوان هەردوولا بەتایبەتیش ناوچە کوردنشینەکان کە بە درێژایی سەدەیەك بۆتە هۆکاری شەڕو ململانێی نێوانیان، تەوەری سەرەکی پێکهێنابوو(١٤).

ئەم ڕێکەوتنامەیە بە بەردی بناغە دادەنرێت لە جێگیرکردنی سنوور لە نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی وە لە دواییدا بووە ڕێگا خۆشکەر بۆ دابەشکردنی کوردستان لە نێوانیاندا، وە جیاوازی ئەم ڕێکەوتنامەیە و ڕێکەوتنامەکانی تر ئەوەبوو کە ئەم ڕێکەوتنامەیە تەنها ڕێکەوتنامەیەك نەبوو بۆ ئاشتی بەڵکو ڕێکەوتنێکیش بوو بۆ دیاریکردنی سنوور وە هەردوولا ڕێکەوتن بە دیاریکردنی هەندێ لە ناوچە خێڵەکیەکان و قەڵاکان کە سەر بە کام دەوڵەت دەبن و ڕووخاندنی هەندێك لە قەڵاکان لە چوارچێوەی ئەم ڕێکەوتنە(١٥).

شایانی باسە دوای ئەوەی هەردوو دەوڵەت ڕێکەوتنامەی زهاو لە ساڵی ١٦١٨ز ئیمزاکرد، ماوەیەك هێمنی و ئارامی باڵی خۆی کێشابوو بەسەر پەیوەندیەکانی نێوانیان، لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا بارودۆخی دەوڵەتی عوسمانی بەوپەڕی خراپی تێپەڕدەبوو لە ئەنجامی هاتنی کۆمەڵێك سوڵتانی لاواز لە دوای مردنی سوڵتان قانوونی (١٥٦٦ز)، و دەست تێکخستنی ئینکشاریەکان لە

كاروبـاری نـاوەخۆی دەوڵـەت، لـە بەرامبــەردا بـارودۆخی نـاوخۆیی دەوڵـەتی سەفەوی بە ئاستێكی گەشەكردویی تێپەڕدەبوو بەهۆی هەوڵ و كۆششەكانی شـا عەباسی یەكەم لە پێناو پێشخستنی بارودۆخی وولات(١٦). بەم جۆرەش هـەردوولا بە گومانەوە سەیری باری ناوەخۆیی یەكتریان دەكرد و ئەگەری كەوتنەوەی شەڕ لە نێوانیاندا لە هەموو كات چاوەڕوان دەكرا(١٧).

شیاوی باسە هۆكاری سەرهەڵدانەوەی شـەڕی ئـەمجارە هەڵگەرانـەوەی بـەكر سۆباشی(*) بوو لە ساڵی ١٦١٩ز لە بەغدا، چـونكە بـەكر سۆباشـی كـاتی بـانگی هەڵگەڕانەوەكەیدا هانای بۆ شا عەباسی یەكەم بـردو ئـەویش بـە دەرفـەتی زانـی خـۆی لـەو مەسـەلەیە هـەڵبقورتێنێ و دووبـارە پەیوەندیـەكانی نێـوان ئـەم دوو دەوڵەتـە چـوونەوە قۆنـاغی ئـاڵۆزو تونـد، كاتێـك شـا عەباسـی سـەفەوی هێـزی سـەربازی ئامـادەو سـازكرد بـۆ ئـەوەی بـچێتە هانـای بەكرسۆباشـی، دەوڵـەتی عوسمانی هەستی بە ناسكی بارودۆخەكـە كـردو ڕاسـتەوخۆ ڕەزامەنـدی دەربـڕی لەسەر دامەزراندنی بەكر سۆباشی وەك والی لەسەر ویلایەتی بەغدا، ئەمەش بووە هــۆی ئــەوەی بــەكر سۆباشــی مەســەلەی هاوكــاری ســەربازی ســەفەویەكان ڕەتبكاتەوە. بەم جۆرە پلانی سـەفەویەكانی لـە گـۆڕ نـا بـۆ دەسـتگرتن بەسـەر بەغدا، بەڵام شا عەباسی سەفەوی ئەم دۆخەی قبووڵ نەكردو بڕیاری داگیركردنی بەغدای دا وەك تۆڵەسەندنەوەیەك لە بەكر سۆباشی و لە ٢٨ی تـشرینی دووەمـی ١٦٢٣ سەفەویەكان چوونە ناو بەغداو داگیریان كرد(١٨).

سوپای سەفەویەكان نەیان توانی لە بەغدا خۆڕاگرین و بمێننەوە بۆ ماوەیەك، لەم ماوەیەشدا هەوڵی زۆر درا بۆ ئاشتەوایی و وەستاندنی شەڕ تەنانەت لە لایەن خـودی شاعەباسـەوە، بـەڵام هـیچ سـودێكی نـەبوو، چـونكە هـەردوولا زۆر بـە گرنگیەوە دەیانڕوانیە پێگەی شاری بەغدا، هەر بۆیە عوسمانیـەكان لـە بەرامبـەر

دەست درێژی سەفەویەکان بێدەنگ نەبوون، لەو کاتەدا کە سولتان موڕادی چوارەم (١٦٢٣-١٦٤٠) سولتانی عوسمانی بوو سوپایەکی گەورەی ئاراستەکرد بۆ گەڕاندنەوەی ئەو ناوچانەی کەوا لە دەستیان دابوو، سوپاکەش لە سالی ١٦٢٤ دەستی کرد بە پرۆسە سەربازیەکەی بە هاوکاری و پشتیوانی ژمارەیەك لە میرانی کورد[١٩]. دوای ئەوەی سوپای عوسمانی توانی دەستبگرێت بەسەر هەردوو شاری موسڵ و کەرکوك، ئینجا ڕووی کردە شاری بەغداو بۆ ماوەی نۆ مانگ گەمارۆیی دا، بەلام دواتر سوپای عوسمانی گەمارۆی سەر شارەکەی هەلگرت و هێزەکانی پاشەکشەیان کرد، لە ئەنجامی بەرگری بەهێزو خۆڕاگری سوپای سەفەوی، چونکە لە لایەن خودی شا عەباسی سەفەوی سەرپەرشتی دەکر[٢٠].

جێگەی ئاماژەپێکردنە کە هەوڵەکەی عوسمانیەکان هەرچەندە سەرکەوتوو نەبوو بەلام نەبووە هۆکارێك بۆ ئەوەی عوسامنیەکان دەست بەرداری بەغدا بن، هەر بۆیە لە هەوڵەکانیان بەردەوام بوون جارێکی تریش سولتان موڕادی چوارەم سوپایەکی بە سەرۆکایەتی سەدری ئەعزەم خەسرۆ پاشاو بە هاوڕێیەتی هەریەك لە سەید خانی میری بادینان و میرە بەگی میری سۆران و ژمارەیەك لە خەلکی ناوچەکە ڕەوانەکرد[٢١]، لە سالی ١٦٣٨ سولتان موڕادی چوارەم دەستی گرت بەسەر بەغدا[٢٢].

عوسمانیەکان ئەوپەڕی توندوتیژی بەکارهێنا بەرامبەر بە سوپای سەفەوی و خەلکی شیعە مەزهەبی بەغداو ئەم هێرشە بە یەکێك لە ڕووداوە ڕەشەکانی مێژووی بەغدا دادەنرێت بەهۆی ئەم ڕەشە کوژییەی عوسمانیەکان لە بەغدا ئەنجامیان دا، لەسەر بڕیاری سولتان موڕادی چوارەم سەربازەکانی عوسمانی هەر ئێرانیەکان بینی بوایە ڕاستەوخۆ دەیان کوشتن، بە جۆرێك سەرچاوەکان

ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە خەڵکی لەبەر بۆنی تەرم و مردووەکان نەیدەتوانی لە بەغدا بمێنێتەوە(٢٣).

شایانی باسە سوڵتان موراد لە ١٧ی شیاتی ١٦٣٩ز بەغدای بەجێهێشت بەرەو تەبریز و توانی دەستبگرێت بەسەر تەبریز، بەڵام کەش و هەوای ساردو کەمی خۆراك و پیتاك بوونە هۆی نارەحەتکردنی بارودۆخی سوپای عوسمانی و کە دواتر بووە هۆکاری هەڵگەڕانەوە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی سوڵتان موراد هێزەکانی بکشێنێتەوە، دواتر شا سەفی هەوڵیدا کەوا عێراق بگێڕێتەوە ژێر ڕکێفی خۆیان و لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیەکان دەری بهێنێت، ئەنجامی ئەم هەوڵەی شا سەفی بووە هۆی ئەوەی هەردوو لایەن بگەنە ڕێکەوتنێك بۆ ئاشتی و ڕێکەوتنامەیەکیان بەست کە ناسراوە بە ڕێکەوتنامەی زەهاو لە ١٤ی محەرەمی ساڵی ١٠٤٩ی کۆچی کە دەکاتە ١٧مایسی ١٦٣٩ز، کە جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی عێراق بمێنێتەوە وەك ویلایەتێکی عوسمانی و مانەوەی ئیروان لە چوارچێوەی سنوری دەوڵەتی سەفەوی(٢٤).

یەکێك لە خاڵە هەرە گرنگەکانی پەیماننامەکە دیاریکردنی سنووری نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی بوو، لێرەشدا بە گوێرەی ئەو پەیماننامەیە سنووری دەوڵەتی عوسمانی لەو ناوچانە پێکدەهات: جەسان، بەدرە، مەندەلی، درەنە، و دەرەتەنگ کە گشتیان لەژێر قەڵمرەوی ئەیالەتی بەغدا بوون، هەروەها ئەو سنوورە درێژ دەبۆوە تا دەگاتە ئەو ناوچەیەی کە پێی دەوترێ سەرپیل لە زەوی و زارەکانی دەوروبەریەوە لەگەڵ هەردوو تیرەی زیائەددین و هارونی لە هۆزی جاف، ئەمانە هەمویان دەکەونە سنووری قەڵەمرەوی عوسمانییەوە، جگە لەمانەش ئەو دەشتانەی دەکەونە ڕۆژئاوای قەڵای زنجیرو قەڵای زەڵم گشت چیاکانی دەوروبەری تا دەگاتە شارەزوورو قەڵای

قزلجە موڵکی دەوڵەتی عوسمانیەوە بۆ دەوڵەتی سەفەوی نیە دەست بخاتە نێو کاروباری ناوخۆی هیچ کام لەو قەڵاو گوندو شاخ و تەپۆلکانەی کە دەکەونە خاکی ئەخسخە، قارس، وان، شارەزوور، بەغداو بەسرا، بەڵام ئەوەی تایبەتدارە بە سنوری دەوڵەتی سەفەوی پێکدێت لەو قەڵایانەی کە دەکەونە بەشی دووەمەوە لە نێوان مەندەلیەوە تاکو دەگاتە دەرەتەنگ لەگەڵ ئەو گوندو باخچەو قەڵایانەی هەورەمان و مەریوان، لەگەڵ هەردوو تیرەی بیرەو زەردووی لە هۆزی جاف، بەمەش بۆ دەوڵەتی عوسمانی نیە دەست بخاتە نێو کاروباری ناوخۆی ئەو ناوچانەوە، ئەوە لە لایەك، لە لایەكی تریشەوە لە بەندێکی پەیماننامەکەدا بڕیارە تێکدان و کاولکردنی هەریەك لە قەڵای قوتور و مانکۆ لە نزیك وان و قەڵای مەغازیرد لە نزیك قارس و قەڵای زنجیر درابوو. ئەوە سەرەڕای ئەوەی هەندێك بەندی دیکەی دووبارە وەکو پەیماننامەکانی پێشوو لە ناوەڕۆکی پەیماننامەکە ئاماژەی پێکرابوو[٢٥].

دوای ئەوەی نێردراوی هەردوو دەوڵەتی ڕەزامەندی خۆیان لەسەر بەندەکانی پەیماننامەکە دەربڕی، ئینجا ناوەڕۆکەکەی بۆ شا سەفی ڕەوانەکراو، ئەمیش بە نامەیەك ڕەزامەندی خۆی لەسەر ڕاگەیاندو لە ڕێگای محەمەد قولی خان نامەکەی بۆ سوڵتانی عوسمانی ڕەوانەکرد، کاتێکیش محەمەد قولی خان گەیشتە ئەستەمبۆڵ پێشوازیەکی گەرمی لێکراو بە خزمەتی سوڵتان گەیشت، بەمەش سوڵتان مورادی چوارەم ڕەزامەندی لەسەر ناوەڕۆکی پەیماننامەکە پیشاندا و بە نێردراوی شا دا نامەیەکی بۆ شا ڕەوانەکرد[٢٦]. هەروەها نێردراوی شا لە گەڕانەوەشید لە بەغدا نامەیەکی دیکەی لە مستەفا پاشاوە پێ ڕاسپێردرا تا ئەوەی بیگەیەنێتە دەستی شا.

ئەوەی پەیماننامەی زەهاو لە پەیماننامەکانی دیکە جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە تەنیا پەیماننامەی ئاشتەوایەتی لە نێوان هەردوو دەوڵەتدا نەبوو، بەڵکو پەیماننامەی بنبڕکردنی گێرمە و کێشەی سنووری نێوان هەردوولا بوو کە لە شەڕی چاڵدێرانەوە دەستی پێکردبوو[٢٧]. سەرەڕای ئەوەی ئەم پەیماننامەیە بوو بەربەردی بناغەی پەیماننامەکانی دواتر کە لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی دەبەستران[٢٨]، بۆیە یەکێك لە سەرچاوەکان ئەو پەیماننامەیەی بە پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتی ناوزەند کرد[٢٩].

ناکرێ ئەوەش لە بیر بکەین کە ئەم ڕێکەوتنامەیە نەك هەر تەنها سنووری کوردستانی دابەشکرد لە نێوان ئەم دوو دەوڵەتە بەڵکو عەشیرەتە کوردیەکانیش لە نێوان ئەم دوو هێزە دابەشکران، ئەم ڕێکەوتنامەیەش بووە هۆی ئەوەی کەوا ئاشتی باڵی بکێشێ بەسەر پەیوەندیەکانی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە بۆ ماوەی نزیکەی هەشتا ساڵ و بووە بنەمایەك بۆ زۆربەی ڕێکەوتنەکانی تری کەوا لە نێوان ئەم دوو دەوڵەتە بەستران لە دواتر، لەبەر ئەوەی زیاتر ڕوونتر و ووردتر بووە لە ڕێکەوتنامەکانی تری پێش خۆی[٣٠].

## تەوەرەی سێیەم

## بەندەکانی ڕێکەوتنامەی زەهاو

سەبارەت بە بەندو خاڵەکانی ڕێکەوتنامەی زەهاو کەوا لە نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی بەسترا لە ساڵی ١٦٣٩، ئاماژە بە گرنگترین خاڵەکانی دەکەین کە بریتین لە:

یەکەم/ ئەم ناوچانە بۆ دەوڵەتی عوسمانی دەبن، بەدەرە، جەسان، مەندەلی، درنە، درتنك، سەرمینل و ئەو گوندانەی دەکەونە نێوان قەڵای زنجیر تا قەڵای زەڵم لە لێوارەکانی شارەزوور هەموو شاخەکانی دەوروبەری ئەم قەڵایە تا ئەو دەروازەیەی بۆ شارەزوور دەڕوات و کە خاڵی سنوری هەردوو دەوڵەت پێك دێنێت، جگە لە قەڵای قزلجە و دەوروبەری.

دووەم/ دەبێ حکومەتی ئێران دەست وەرنەدات و خۆی لە قەرەی هەموو ئەو قەڵاو زەویانەی دەکەونە سنووری فارس و وان و شارەزوور و بەسرە و ئەو قەڵایانەی دیکە کە سنوری عوسمانی دەپارێن.

سێیەم/ دەبێ حکومەتی ئێران دەستی لە جنێودان بە خەلیفەی ڕاشیدین و ئەسحابەکان هەڵبگرێ.

چوارەم/ ئەو قەڵایانەی دەکەونە ئەو بەرەو لە نێوان مەندەل و دەرتەنك و شوێنەکانی (بیرەو یەکەو زومر و دهاوا)و گوندو قەڵاکانی ڕۆژهەڵاتی قەڵای زنجیر و میهرابان و دەوروبەریان بۆ ئێزانن و نابێ دەوڵەتی عوسمانی دەست لە کارو باریان وەربدات.

پێنجەم/ هەردوو تیرەی (پیرەو زەردووی) عەشیرەتی جاف سەر بە ئێران دەمێننەوە.

شەشەم/ ڕوخاندنی قەڵای زنجیر و هەردوو قەڵای قوتور و ماکۆ کە دەکەونە سەرووی وان لە کوردستانی باکوردا قەڵای (موغازبرد) کە دەکەوێتە ناوچەی قارس.

حەوتەم/ هەردوو دەوڵەتە دەست لە کاروباروی یەکتر نەدەن[31].

بەپێی ئەم پەیماننامەیە سنووری نێوان هەردوو دەوڵەت لە قەفقازەوە تاکو سەرڕووی کەنداو ئاخسقە، قارس، وان، شارەزوور، بەغدا، بەسرە دیاری کرد. لەم دابەشکردنەدا: مەریوان، قەڵای مەریوان، دەرتەنگ، لەگەڵ هۆزەکانی پیرەو زەردویی بەر ئێران کەوت، بەدرە، جەسان، مەندەلی، سەرمیل، درنە، قەڵای زەڵم، قزڵجە، سەرچاوەی چەمی چەقان لەگەڵ هۆزەکانی زیائەدین و هارونی لە ئێلی جاف بەر عوسمانی کەوت، ئێران بەڵێنی دا ئیتر لە مینبەری مزگەوتەکانەوە واز لە سوکایەتی بە خەلیفەکانی ڕاشدین و ئەسحابەکانی پێغەمبەر(د.خ) بهێنن، لە بەرامبەردا عوسمانیەکان بەڵێنیاندا کە ڕەفتاری باش بنوێنن لەگەڵ زیارەتکەرانی پیرۆزگاکانی عێراق و حاجیانی ئێرانی لە کاتی سەردانی کردنی شوێن و مەزارگە پیرۆزەکان لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵات و قەڵەمرەوی عوسمانی، لە هەمان کاتدا هەردوولا بەڵێنیان بە یەکتریدا کەوا دالدەی نەیارانی یەکتری نەدەن[32]، لەو خاڵەشدا مەبەستی سەرەکیان کوردەکان بووە، چونکە لەو کاتانەی کەوا میرە کوردەکان ڕووبەڕووی زوڵم و سەرکوتکردن دەبوونەوە لە لایەن یەکێك لەم دوو دەوڵەتە ڕایان دەکردە سنووری دەوڵەتەکەی تر، یاخود هەندێك جاریش بە مەبەستی داواکردنی هاوکاری و یارمەتی پەنایان بۆ دەبردن.

شایانی باسە هەردوو دەوڵەت پێکهاتن کە لە ئاخسقەوە لە قەفقاس بە ناو مەڵبەندەکانی فارس و وان و شارەزوور و بەغداو بەسرە تا سەر ئاوی کەنداو

بەناو جەرگەی خاکی کوردستان تێپەڕی، بە گوێرەی ئەم ڕێکەوتنە دەبوایە قەڵاکانی قووتوور و ماکۆ و مەغازیرد کاول بکرێن و بە چۆڵی بهێڵدرێتەوە، کە پێکهاتنی هاوبەش نەیتوانی ناکۆکیەکانی نێوان سەفەوی و عوسمانی بە تەواوی چارەسەر بکات، بەڵکو دابەشکردنی نارەوای نەتەوەی کوردو ئەرمەن و گورجی و عەرەب و دابەشکردنی ئاین بەپێی مەزهەبە جیاجیاکان بوو، تەنانەت ئەم دابەشکردنە خێڵ و هۆزە جیاجیاکان و پێکهاتەی نەتەوەکانی ناوچە سنوریەکانی بەسەر ئەو دوو دەوڵەتەدا دابەشکرد[٣٣].

شایانی باسە جگە لەم چەند بەندەی ئاماژەمان پێکرد، چەند خاڵی تر هەبوون کە هەردوولا لە سەری ڕێکەوتن کە گرنگترینیان بریتی بوون لە:

یەکەم/ حاجیانی ئێرانی کە لە ڕێگای بەغداو شام ئەچن بۆ بەیت الله الحرام، ئەو والی و حاکم و میرانەی لەسەر ڕێگایاندان ئەبێت ئەمانە بە ئەمینی و سەلامەتی لە شوێنێکەوە بگەیەننە شوێنێکی تر.

دووەم/ بۆ بەهێزکردنی دۆستایەتی و زیادکردنی یەکێتی لە نێوان هەردوو دەوڵەت دا، هەردوولا بڕیاریان دا هەر سێ ساڵ جارێك دەبێت یەکێك لە لایەن دەوڵەتی ئێران وەك بارمتە لە دەوڵەتی عوسمانی دابنرێت و یەکێکی تر لە لایەنی دەوڵەتی عوسمانی بە بارمتە لە لای دەوڵەتی ئێرانی دابنرێت، خەرجیەکانیشیان لە ئەستۆی هەردوولا دەبێت.

سێیەم/ دیلەکانی هەردوولا ئازادبکرێن، کڕین و فرۆشتنیان ڕەوا نیە، هەرکەسێکیان مەبەستی بێت بگەڕێتەوە وڵاتی خۆی، نابێت ڕێگەی لێ بگیرێت[٣٤].

چوارەم/ ئەو سنورەی لە سەردەمی سوڵتان موراد خاندا دیاری کراوە جێبەجێ بکرێت:

١- زەویەکانی کەلهڕ و لوڕ و ئەردەلان بە تەواوی ملکەچ بوون بۆ ئێران.
٢- زەوی خێڵەکانی موکری کە لەسەر سنووری نوێ بوون، دابەشکران بۆ دوو بەش:
أ- نیشتمانی شارەزوور لەژێر فەرمانڕەوایی عوسمانی مایەوە.
ب- چاوخشاندنەوە بە باری ناوچەکانی تر کەوتونەتە ڕۆژهەلات دواخرا، وەك سەقز و زەهاو و درنە و باشووری کرمانشان. هەردوولا ڕێکەوتن کە یەکلایی کردنەوەی ئەم کارە بەجێبهێڵدرێت بۆ ڕێکەوتنەککانی داهاتوو.
٣- ناوچەکانی تری کەوتونەتە تەنیشت ئەم زەویانە، لەسەر باری بەڕێوەبردنی پێشوو مایەوە[٣٥].
یەکەم/ شوێنەکانی نزیك سەقز و سەردەشت و بانە زەهاو تاکو باشووری کرماشان ئەم ناوچانە لە ڕووی کارگێڕیەوە وەکو خۆی بمێنێتەوە.
دووەم/ هیچ لایەکیان یارمەتی هۆز و تیرە یاخی بووەکان نەدەن و نەیان بەگژ یەکتریدا.
سێیەم/ شای سەفەوی بەڵێن بدات پەلاماری قەڵاکانی سەر سنووری دەوڵەتی عوسمانی نەدات[٣٦].

یەکێك لە بەندەکانی ئەم ڕێکەوتنامەیە نیشانکردنی سنوری نێوان ئەو دوو دەوڵەتە بووە، کە خاکی کوردستانی کرد بە دوو بەشەوە، جگە لەوەش کاولکردنی ژمارەیەك قەڵا بوو لە ناوچە کوردیەکان وەك قەڵای قوتور لە ناوچەی وان، هەروەها قەڵای مەغاربرد و قەڵای زنجیر لە نزیك فارس، سەرەڕای ئەو ڕێگای لە هۆزە کۆچەریەکان قەدەغەکرد لە هاموشۆکردنی گەرمیان و کوێستاندا هۆزی جافیشی کرد بە دوو بەشەوە[٣٧].

سنجاق باجەلان(سنجاقی زەهاو) كە سەر بە ویلایەتی شارەزوور بوو بە گوێرەی بەڵگەنامەكانی عوسمانی كە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شانزەهەم هەروەها شاری مەریوان (مەهریان) ئەو ناوچانەی سەر بەو بوون دەوڵەتی عوسمانی بە گوێرەی ئەم ڕێكەوتنامەیە[٣٨].

## تەوەرەی چوارەم

## كاریگەریی ڕێكەوتنامەی زەهاو لەسەر كوردستان

سەبارەت بە كاریگەریی و ئەنجامەكانی پەیماننامەی زەهاو وە نەبێت تەنها ڕازیبوونی هەردوو دەوڵەت بە دابەشكردنی كوردستان بێت، بەڵكو ناوی كوردستانی عوسمانی و كوردستانی سەفەویشی بە وشەی كوردستانەوە لكاندووە، لەبەر ئەوەی هەردوولا بەپێی بەرژەوەندی و ستراتیژی ئایدۆلۆژیای خۆی گەلی كوردو خاكی كوردستانی لە خزمەتی خۆیدا بەكاردەهێنا، هەربۆیە یەكێك لە لێكۆڵەرەوەكان دەربارەی ئەم پەیماننامەیە دەڵێ: "... كارەساتێكی گرنگ بوو كە تەئسیری كردە سەر هەموو ڕووداوەكانی پاشەڕۆژی مێژووی گەلی كورد"[٣٩].

لە لایەكی ترەوە ئەگەر سەیری كاریگەری پەیماننامەكە بكەین، ئەوا دەبینین كاریگەری بەسەر دەسەڵاتی سیاسی ئەو كاتەی میرە كوردەكانیشەوە هەبووە، كە هەریەكەیان میرنشینێكی بەڕێوەدەبرد و خاوەن قەڵایەكی تۆكمەو بەهێز بوو، بۆ پارێزگاری و بەرگریكردنی دەسەڵاتەكەی دروستی كردبوو، كەچی بە گوێرەی بەندەكانی پەیماننامەكە هەردوو دەوڵەت پێكهاتبوون لەسەر كاولكردن و وێرانكردنی ژمارەیەك لەو قەڵایانەی كەوتبونە سەر سنوور، بەمەش بەدیاردەكەوێت كە ناوچە كوردیەكان چ كارەساتێكیان بەسەر هاتووە[٤٠].

دەكرێ بڵێین پەیڕەوكردنی ئەو سیاسەتە بۆ ئەوە بووە تاكو میرە كوردەكان نەتوانن لە كاتی یاخی بوون قەلاكان بكەن بە حەشارگەو بانگی جیابوونی خۆیان ڕابگەیەنن و هەروەها لەو ڕێگایەشەوە دەسەلاتیان جڵەو بكەن و لە قالبی بدەن، تا هەر كاتێك ویستیان لە دەسەلات لایان بدەن و سەروەرییان پێشێل بكەن[٤١].

خاڵێكی دیكە لە كاریگەری بەستنی پەیماننامەی زەهاو بریتی بوو لە دەست بەتاڵ بوونی هەردوو دەوڵەت دوای پەیمانەكە، بەم شێوەیەش هەردوولا دەستیان كرد بە لێدان و كەمكردنەوەی دەسەلاتی میرنشینە كوردیەكان، لە ڕێگای بەكارهێنانی هەموو شێوازێك لە كوشتن و بڕین و تالانكردنی ناوچە كوردیەكان، جگە لەوەی هەڵدەستان بە نانەوەی دووبەرەكی لە ناو خودی یەك میرنشین و نێوان میرنشینەكان بەگشتی، لە چوارچێوەی سیاسەتی پەرتكەو زاڵبەی كە هەردوو دەوڵەت دژی كورد پیادەیان دەكرد[٤٢].

جگە لەمانەش جێگای خۆیەتی ئاماژە بۆ ئەوە بكەین كە بەندەكانی پەیمانامەی زەهاو كاریگەری هەبووە لەسەر باری ئابووری و كەمكردنەوەی ڕادەی بەرهەمهێنان لە كوردستاندا، چونكە بەپێی بەندەكانی پەیماننامەكە بڕیاری چۆلكردنی بەشێكی زۆر لە ناوچە سنوریەكان درابوو، ئەمەش كاری دەكردە سەر كەمبوونەوەی ڕێژەی بەرهەمهێنا كە دانیشتوانەكەی بە كشتوكاڵكردن و مەڕومالات بەخێوكردنەوە دەیانگوزەراند، بۆیە دەتوانرێت بوترێ ئەگەر كوردەكان بە تەواوەتی پابەندی بەندەكانی ئەو پەیماننامەیە بوونایە، ئەوا لە ڕووی ئابوریشەوە زەرەرمەند دەبوون، چونكە بەندەكانی پەیماننامەی زەهاو سنورێكی توندوتیژترو دابەشبوونێكی جێگیرتری لە كوردستان هێنابووە ئاراوە[٤٣].

كوردەكان لە ئەنجامی ئەو ڕەوشە و ئەو سیاسەتە چەوتانەی هەردوو زلهێزی هەرێمی كە بە كاریان دەهێنا باریان یەكجار خراپ بوو، ئیتر لە توانایاندا نەما چیتر بەرگەی ئەو ڕەوشە پڕ لە فشارە بگرن بۆیە گەلێك بزاڤی چەكداری لە ناوچە جیاجیاكانی كوردستان بەرپابوون كە زۆربەیان داوای ئازادی و ئەنجامدانی چاكسازیان لە هەرێمەكاندا دەكرد(٤٤).

دەكرێ بڵێین ئەو ڕێكەوتنە كاریگەری لەسەر ڕەوشی ئابووری كورد هەبووە بە شێوەیەكی زۆر، بە جۆرێك بەر لە دیاریكردنی سنوور لە نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی لە دوای ڕێكەوتنامەی زەهاو لە ساڵی ١٦٣٩ز، كوردەكان بەتایبەتیش خێڵە كۆچەریەكان سودیان وەردەگرت لە درێژی و پانایی ئەو زەویانەی كەوتبوونە نێوان دەسەڵاتی ئەم دوو دەوڵەتە بۆ گوزەران و ژیانی ڕۆژانەیان بەتایبەتی بۆ مەبەستی شوانكاری، بەڵام دوای ئەم ڕێكەوتنە چالاكی شوانكارانی كورد سنوورداركرد لە دوای دابەشكردنی سنورەكە لە نێوان ئەم دوو دەوڵەتە(٤٥).

شایانی باسە پرۆسەی دابەشكردنی خاكی كوردستان لە نێوان هەردوو دەوڵەتەكانی عوسمانی و سەفەوی جگە لەوەی چالاكی شوانكارانی كوردی سنورداركرد كێشەیەكی تری ئابووری بۆ كوردەكان هێنایە پێشەوە ئەمیش سەپاندنی باج بوو بەسەر جوتیارانی كورد، لە بەرامبەر بەرهەمهێنانی زەوی، كە ئەم مەسەلەیەش باری ژیان و گوزەرانی جوتیاری كوردی زۆر قورس كرد لە ئەنجامی سەپاندنی ئەو ڕێژە باجە زۆرەی لە لایەن هەردوو دەوڵەتەوە دەسەپێنرا سەری، كە كاریگەری دروستكرد لەسەر ئاستی بەرهەمهێنان و كەمبوونەوەی دەستی كاركەری كوردی لەو قۆناغەدا(٤٦).

دوای زاڵ بوون بەسەر نیمچە سەربەخۆیی ناوچە کوردییەکان، عوسمانیـەکان هێزی مرۆیی و ئابوری کوردیان قۆستەوە، بەهەر شێوەیەك کە بۆیان ڕەخسا جا بۆ شەڕە دەرەکیەکان بێت یان بۆ دامرکاندنـەوەی ڕاپەڕینـە ناوخۆییـەکان، ئـەم هۆکارانە کـە ئـەوان لەسـەر خـاکی کوردسـتان ئەنجامیانداوە نـە پەیوەنـدی بـە هەرێمەکەوەیە نە بە کوردستان و کوردەوە هەبووە، بۆیـە ئـەو ڕووداوانـە لەگـەڵ سروشتی نارێکی خاکەکە کە کۆتی گەورەی سەپاند لەسەر گەیشتنی گونـدەکان و خێڵـــەکانی کـــوردی بەرێژەیـــەك بـــچووك و پـــەرتووبلاوە بـــووە هـــۆی دامرکاندنەوەیەکی توندو پەکخستنی گەشـەی کوردسـتان و ڕێگربـوون لەبـەردەم کاری پێشکەوتنی سروشتی[٤٧].

دواجار ماوەتەوە بڵـێین پەیماننامـەی زەهـاو کاریگـەری زۆری بەسـەر خـاکی کوردسـتاندا نەخـشاندووە، بۆیـە تـا ئـەمرۆش مێـژووی گـەلی کـورد قـەرەبووی کاریگەرییەکانی دەداتەوە، لەبـەر ئـەوەی ئـەم پەیمانـە بـە شـێوەیەکی ڕەسمـی کوردستانی لـە نێـوان هـەردوو دەوڵـەتی عوسمـانی و ئێرانـدا دابەشـکرد و بـووە بناغـەی پەیمانـەکانی پـاش خـۆی، پـاش ئـەم پەیمانـە زۆربـەی زەویـەکانی کوردستان بە شێوەیەکی ڕەسمی سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بوون[٤٨].

## ئەنجام

بێگومان پەیماننامەی زەهاو بە نۆبەرە و بناغەی پەیماننامە و ڕێکەوتنامەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی دادەنرێت سەبارەت بە یەکلایی کردنەوەی کێشەکانی سنوری نێوانیان، ئێمەش دوای دیراسەکردنێکی خێرای ئەم ڕێکەوتنامەیە چەند ئەنجامێکمان بەدەست گەیشت، لەمانەش:

١- ئەو پەیماننامەیە پێشی هەموو شتێك ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە ململانێیەکانی هەردوو دەوڵەی عوسمانی و سەفەوی بەر لەوەی ململانێیەکی ئاینی بێت، ململانێیەکی ساسی و ئابوری بووە، دابەشکردنی کوردستانیش لە نێوان خۆیاندا باشترین بەڵگەو بورهانە بۆ ئەم مەسەلەیە.

٢- لە مێژووی ململانێکانی هەردوو دەوڵەتدا، ئەم پەیماننامەیە لە هەموو پەیماننامەکانی تر قورسایی زیاتری هەبووە، بەجۆرێك توانیەتی بۆ ماوەی هەشتا ساڵ ئاشتی لە نێوانیان مسۆگەر بکات.

٣- دابەشکردنی کوردستان و خێڵە کوردیەکان بە گوێرەی ئەو پەیماننامەیە چەند کێشەیەکی لەسەر سنوری نێوان هەردوو دەوڵەت دروستکردووە، وەکو کێشەی هاتوچۆکردن و خاوەنداریەتی ئەو خێڵانە، کە تاکو ئاستێکی زۆر کاریگەری دروستکردووە لەسەر ئاستی بەرهەمهێنان و پێشکەوتنی ژیانی ئابووری ناوچەکە، ئەمەش لەگەڵ خۆیدا توانای مرۆیشی لاوازکردووە، کە دواتر بۆتە فاکتەرێکی بەهێز کوردەکان هەر خەریکی بژێوی ژیان و گوزەرانی خۆیان بن و لە مەسەلە سیاسی و نیشتمانیەکان دوور بکەونەوە.

٤- بەهۆی ڕاوەستانی شەڕو ناکۆکیەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتی سەفەوی و عوسمانی کە زۆربەی شەڕ و ناکۆکیەکان کەوتبوونە سەر خاکی کوردستان، ماوەی هەشتا ساڵ ناوچەکانی کوردستان تاکو ئاستێك ئاسایش و سەقامگیری بەخۆیەوە بینی، هەر بۆیەش لە قۆناغی دواتر وردە وردە قەوارە کوردیەکان هەوڵی سەربەخۆیی و ڕزگاری ئەدەن.

## پەراوێزەکان

١- د.سعدی عوسمان هروتی: کردستان والامبراطوریة العثمانیة(دراسة في تطور سیاسة الهیمنة العثمانیة في کردستان ١٥١٤-١٨٥١م)، ط١، م.خاني، دهوك، ٢٠٠٨، ص٣٦.

٢- ئەحمەد حەمەدەمین، دلشاد مەحموود: کاریگەری پەیماننامەی زەهاو(١٦٣٩) لەسەر کوردستان، چ:ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١١، ل١٤.

٣- ئیدریس بەدلیسی: ئیدریسی کوڕی حسامەدین کوڕی عەلیە، ناسراوە بە بەدلیسی لەبەر ئەوەی خەڵکی شاری بەدلیس بووە، پێی دەگوترا(مەولانا)و (حکیمە دین)، لە بنەماڵەیەکی ئاین پەروەر گەورەبووە... بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە بۆ: د.سعدی عوسمان هروتی، م.س، ص٤٩.

٤- ن.لازاریف: مێژووی کوردستان، و: وشیار عەبدوڵلا سەنگاوی، چ.ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠٠٨، ل١٣٤.

٥- سالح قەفتان: مێژووی گەلی کورد لە کۆنەوە تاکو ئەمڕۆ، بەغدا، ١٩٦٩، ل٢٤٠. د.جەلیلی جەلیل: کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، و.کاوس قەفتان، بەغدا، ١٩٨٧، ل٢٦. نەجاتی عەبدوڵلا: کوردستان و کێشەی سنووری عوسمانی-سەفەوی(١٦٣٩-١٨٤٧)، چ.وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١، ل٢٨.

٦- م.س.لازاریف: کێشەی کورد(١٨٩٦-١٩١٧)، و: د.کاوس قەفتان، بەغدا، ١٩٨٩، ل٤٤.

٧- عبداللە عەلیاوەیی: کوردستان لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی، چ١، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل١٣. حەمید گەردی: پوختەی مێژوونامە، چ١، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤، ل٨٤. ساڵح هەرکی: بەشێك لە پەیمانەکانی دژی کورد، و: سالح هەرکی، چ١، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٨، ل١٢. د.سعدی عوسمان هروتی: م.س، ص٨٨.

٨- نەشیروان مستەفا ئەمین: میرایەتی بابان لە نێوان بەرداشی ڕۆم و عەجەم دا، چ٢، سلێمانی، ١٩٩٨، ل٣٩.

٩- محەمەد ئەمین زەکی: خوصلایەکی تاریخی کوردو کوردستان، مج١، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠٤. ل١٩٢. د.سعدی عوسمان هروتی: م.س، ص٨٩.

١٠- ن.لازاریف: مێژووی کوردستان، ل١٣٦. صالح هەرکی: س.پ، ل١٣.

١١- نەشیروان مستەفا ئەمین: س.پ، ل٤٠. ن.لازاریف: س.پ، ل١٣٦.

١٢- ئەحمەد حەمەدەمین: دلشاد مەحموود: س.پ، ل٢٦.

١٣- کەیوان ئازاد ئەنوەر: چەردەیەك لە مێژووی کورد، چ٥، چاپخانەی ڕەهەند، سلێمانی، ٢٠٠٨. ل١٠٢.

١٤- حەمید گەردی: س.پ، ل٧٦.

١٥- كاميران عبدالصمد أحمد الدوسكي: كردستان في العهد العثماني، ط١، مطبعة الدار العربية للموسوعات، بيروت، ٢٠٠٦، ص١٧٨.

١٦- محمد فريد بگ: تاريخ الدولة العلية العثمانية، بيرو، ١٩٧٧، ص١٥٢.

١٧- د.سعدي عثمان حسين: كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر(دراسة في علاقاتها الادارية والسياسية والاقتصادية مع ايالتي بغداد والموصل)، مطبعة سيما، اربيل، ٢٠٠٦، ص٢٨٢.

* - بەکر سۆباشی سەرۆکی هێزی ئینکشاری بوو لە بەغدا ساڵی ١٦١٩ لە دەسەڵات هەڵگەڕایەوە، بەڵام دواتر دەوڵەتی عوسمانی سازشی لەگەڵ کرد. ئەنجام لەگەڵ گرتنەوەی شاری بەغدا لە لایەن هێزی سەفەویەکان لە ساڵی ١٦٢٣ کوژرا. نەجاتی عەبدوڵلا: س.پ، ل٢٨.

١٨- ئەحمەد حەمەدەمین: دلشاد مەحموود: س.پ، ل٣١.

١٩- هـ.س، ل٣٢.

٢٠- صالح قەفتان: مێژووی نەتەوەی کورد، چاپخانەی سلمان الأعظم، ب.ش، ب.س. ل٣٦٠. کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا، وەرگێڕانی: حەمە کەریم عارف، چ١، هەولێر، ١٩٩٩، ل٧٢.

٢١- محمدامين زكي: خلاصة تاريخ الكرد والكردستان من اقدم العصور التاريخية حتى الان، ت: علي عوني، مصر، ١٩٣١، ص١٩٩.

٢٢- ن.لازاریف: س.پ، ل١٣٨.

٢٣- د.حسن كريم الجاف: الوجيز في تاريخ ايران، دراسة في التاريخ السياسي من ظهور الدولة الصفوية إلى نهاية الدولة القاجارية، ج٣، ئاراس، أربيل، ٢٠٠٨، ص٥٠.

٢٤- د.حسن كريم الجاف: م.س، ص٥١.

٢٥- ئەحمەد حەمەدەمین، دلشاد مەحموود: س.پ، ل٣٩.

٢٦- د.سعدی عوسمان هروتی: م.س، ص١٦٥.

٢٧- نەجاتی عەبدوللا: س.پ، ل٤٣.

٢٨- د.سعدی عوسمان هروتی: م.س، ص١٦٦.

٢٩- ئەحمەد حەمەدەمین، دلشاد مەحموود: س.پ، ل٤٠.

٣٠- د.سعدی عوسمان هروتی: م.س، ص١٦٦.

٣١- عبدالله عەلیاوەیی: س.پ، ل١٤.

٣٢- نەوشیروان مستەفا: کوردو عەجەم: مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێـران، چ٣، چـاپخانەی ڕوون، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٥٤٦.

٣٣- نەوشیروان مستەفا ئەمین: میرایەتی بابان لە نێوان بەرداشی ڕۆم و عەجەم، ل٢٥٢.

٣٤- نەوشیروان مستەفا ئەمین: میرایەتی بابان لە نێوان بەرداشی ڕۆم و عەجەم، ل٢٥٣.

٣٥- أیاد جلال بابان: أسرة بابان الكردیة، ط١، مطبعة دار الزمان، دمشق، ٢٠٠٨، ص٢١.

٣٦- کۆمەڵێك نووسـەر: عوسمانیـەکان، و: سـەلام عەبدولکـەریم، چ٢، چـاپخانەی گـەنج، سـلێمانی، ٢٠٠٨، ل٢١٩.

٣٧- ئاسۆ کەریم: توێژینەوەو(گۆڤار)، ژ٦، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦، ل١١.

٣٨- سالح هەرکی: س.پ، ل١٩.

٣٩- د.عبدالرحمن قاسملو: کوردستان و کورد "لێکۆڵینەوەیەکی سیاسـی و ئـابووری"، وەرگێڕانـی: عبدالله حسن زادە، چ٢، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٦، ل٤٠.

٤٠- ئەحمەد حەمەدەمین، دلشاد مەحموود: س.پ، ل٤١.

٤١- هـ.س، ل٤٢.

٤٢- محمدأمین زکی: م.س، ص٢١٧.

٤٣- ئەحمەد حەمەدەمین، دلشاد مەحموود: س.پ، ل٤٢.

٤٤- ئاسۆ کەریم: س.پ، ل١١٢.

٤٥- نازناز محمد عبدالقادر: سیاسەتی ئێران بەرامبەر بزوتنـەوەی ڕزگـاریخوازی نەتـەوەیی کـورد لـە کوردستانی عێراقدا، چ٢، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠، ل٢٨.

٤٦- عوسمان عەلی، چەند لێکۆڵینەوەیـەك دەربـارەی بزاڤـی هاوچەرخی کـورد، و: کـامران جـەمال بابان زادە، چ١، چاپخانەی ڕۆی نوێ، هەولێر، ٢٠١٠، ل١٥.

٤٧- عوسمان عەلی: س.پ، ل١٧.

٤٨- عبدالله علیاوەیی: س.پ، ل١٥.

## لیستی سەرچاوەکان

**سەرچاوە کوردیەکان:**

١- ئەحمەد حەمەدەمین، دلشاد مەحموود: کاریگەری پەیماننامەی زەهاو(١٦٣٩) لەسەر کوردستان، چ.ڕۆژهەلات، هەولێر.

٢- ئەحمەد محمود خەلیل: مێژووی کورد لە شارستانی ئیسلامیدا، و.زرار عەلی، چ پەیوەند، سلێمانی، ٢٠١٠.

٣- ن.لازاریف: مێژووی کوردستان، و.وشیار عەبدوڵلا سەنگاوی، چ ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠٠٨.

٤- سالح قەفتان: مێژووی گەلی کورد لە کۆنەوە تاکو ئەمرۆ، بەغدا، ١٩٦٩.

٥- د.جەلیلی جەلیل: کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، و.کاوس قەفتان، بەغدا، ١٩٨٧.

٦- نەجاتی عەبدوڵلا: کوردستان و کێشەی سنوری عوسمانی-سەفەوی(١٦٣٩-١٨٤٧)، چ.وەزارەی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.

٧- م.س.لازاریف: کێشەی کورد(١٨٩٦-١٩١٧)، و: د.کاوس قەفتان، بەغدا، ١٩٨٩.

٨- عبدالله عەلیاوەیی: کوردستان لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی، چ١، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٤.

٩- سالح هەرکی: بەشێك لە پەیمانەکانی دژی کورد، و: سالح هەرکی، چ١، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٨.

١٠- حەمید گەردی: پوختەی مێژوونامە، چ١، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤.

١١- نەوشیروان مستەفا ئەمین: میرایەتی بابان لە نێوان بەرداشی ڕۆم و عەجەم دا، چ٢، سلێمانی، ١٩٩٨.

١٢- محەمەد ئەمین زەکی: خوصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان، مج١، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠٨.

١٣- کەیوان ئازاد ئەنوەر: چەردەیەك لە مێژووی کورد، چ٥، چاپخانەی ڕەهەند، سلێمانی، ٢٠٠٨.

١٤- صالح قەفتان: مێژووی نەتەوەی کورد، چاپخانەی سلمان الاعظم، ب.ش، ب.س.

١٥- نەوشیروان مستەفا: کوردو عەجەم، مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێران، چ٣، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی، ٢٠٠٥.

١٦- کۆمەڵێك نووسەر: عوسمانیەکان، و: سەلام عەبدولکەریم، چ٢، چاپخانەی گەنج، سلێمانی، ٢٠٠٨.

١٧- د.عبدالرحمن قاسملۆ: کوردستان و کورد "لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی و ئابووری"، وەرگێرانی: عبدالله حسن زەدە، چ٢، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٦.

١٨- نازناز محمد عبدالقادر: سیاسەتی ئێران بەرامبەر بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کورد لە کوردستانی عێراقدا، چ٢، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠.

١٩- عوسمان عەلی: چەند لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی بزاڤی هاوچەرخی کورد، و: کامەران جەمال بابان زادە، چ١، چاپخانەی ڕێی نوێ، هەولێر، ٢٠١٠.

سەرچاوە عەرەبیەکان:

١- د.سعدی عوسمان هەروتی: كردستان والامبراطورية العثمانية، دراسة في تطور سياسة الهيمنة العثمانية في كوردستان (١٥١٤-١٨٥١م)، ط١، م.خانی، دهوك، ٢٠٠٨.

٢- كاميران عبدالصمد أحمد الدوسكي: كردستان في العهد العثماني، ط١، مطبعة الدار العربية للموسوعات، بيروت، ٢٠٠٦.

٣- محمد فريد بگ: تاريخ الدولة العلية العثمانية، بيروت، ١٩٧٧.

٤- د.سعدي عثمان حسين: كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر(دراسة في علاقاتها الادارية والسياسية والاقتصادية مع ايالتي بغداد والموصل)، مطبعة سيما، اربيل، ٢٠٠٦.

٥- محمدامين زكي: خلاصة تاريخ الكرد والكردستان من اقدم العصور التاريخية حتى الان، ت.علي عوني، مصر، ١٩٣١.

٦- د.حسن كريم الجاف: الوجيز في تاريخ ايران، "دراسة في التاريخ السياسي من ظهور الدولة الصفوية إلى نهاية الدولة القاجارية"، ج٣، ئاراس، أربيل، ٢٠٠٨.

٧- اياد جلال بابان: أسرة بابان الكردية، ط١، مطبعة دار الزمان، دمشق، ٢٠٠٨.

# مێژووی بـارزان و ڕا پەرینەکانی لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم دا

ئامادەکردنی: فاخر عالی عبابکر

## پێشەکی

مێژووی هەموو گەلێك بەپێی بارودۆخ و هەلکەوتەی جوگرافی و هەلومەرجی سیاسی، کۆمەلایەتی، ئابوری چارەنوسەکەی دیاری دەکات و ئاراستە دەکرێ، کاریگەری خۆی لە گۆرەپانی ژیان و کایەکانی تری کارگێری و بەرێوەبردن دەسەلمێنێت، ئەمەش لە کارلێکردن و کاردانەوەکانی ڕەنگ دەداتەوە، هەر چۆنێ بێ گەلی کورد توانیویەتی بە قوربانیدان و شێوەکانی تری خەبات و تێکۆشان کۆلی لێ نەدات، بە پێی تواناکانی خۆی نەپچڕاوە و لەسەری بەردەوام بووە، ئەم قۆناغەی لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم دەستی پێکرد بریتی بووە لە جولانەوەی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد، کە بە شێوەیەکی پلە بەندی دەستی پێکرد، دواتر گەشەی کرد، بە دروستبوونی کاری رێکخراوەی لە چوارچێوەی حزب و کۆمەلە و رێکخراوەکان درێژەیان بەکاردا هەر یەکێکیشیان بە پێی ئاست و قەبارەی جەماوەری خۆی لە نێو شارو شاخ توانیان داخوازی مافەکانی خۆیان بن، بەرامبەر دوژمن بجەنگن، ئەوەی لە سەرەتای سەدەی بیستەم بەدی دەکرێ سەرەتای جولانەوەکانی شێخ عبدالسلام بارزانیە لە

کوردستانی باشور دواتریش بەرەو فراوان بوون دەچێ و تێکەل بە چین و توێژەکانی تری نێو کۆمەلگە دەبێ دەستە کۆمەکی لەگەڵ یەکتر دەسەلاتدارانی عێراق بە خۆیانەوە سەرقال دەکەن، لەسەر ئەم بنەمایە کاری ئەم توێژینەوەیەش لە سنوری ڕوداوەکانی ئەو ماوەیە بەدەر نیە کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیست ڕویانداوە، توێژینەوەکەش لە دەروازیەك و دوو باس پێکهاتوە، دەروازەی باسەکە بە خوێندنەوەیەکی خێرا و پوخت، دور لە درێژ بێژی باس لە ڕوداوەکانی پێش ناونیشانی توێژینەوەکە کراوە وەك بەرچاو ڕونیەك بۆ مێژووی پێش بابەتی لێکۆلینەوەکە، هەروەها لە باسی یەکەمدا بە شێوەیەکی گشتی باسی شوێنی جوگرافی بارزان وە ناو و شێوەو پێکهاتەی هۆزو پەیوەندی کۆمەلآیەتی نێوان هۆزەکان باس کراوە، هەروەها لە باسی دووەمیشدا باس لە سەرەتای دروست بوونی ڕاپەڕین و جولانەوەکانی بارزان کراوە کە سێ جولانەوەی لەخۆ گرتوە، هەروەها باسی جولانەوەی نەتەوەیی کورد و بزوتنەوەی بارزان کراوە، وە لە کۆتایی لێکۆلینەوەکەشدا باسی ئەو ئەنجامانە کراون کە بە دەست هاتوون، ئەم توێژینەوەیە بە شێوەیەکی بابەتی زانستیانە نوسراوە، دور لە لاینگیری بەبێ مەبەستی بەرزکردنەوە یاخود نزم کردنەوەی ناو و ناوبانگی جولانەوەکان.

ئەو سەرچاوانەی بە شێوەیەکی سەرەکی لەم توێژینەوەیەدا بەکار هاتوون بریتین لە کتێبەکانی عەلائەدین سەجادی شۆرشەکانی کورد و کۆماری عێراق، مەعروف چیاووك کارەساتی بارزانی زولم لێکراو، مەسعود بارزانی الحرکە التحرریە الکردیە بەرگی یەکەم لە گەڵ چەند سەرچاوەیەکی تری پەیوەستدار بە بابەتەکەوە، ئەوەی لەسەر جولانەوەکانی بارزان لەڕووی سەرچاوە و زانیاریەکان

تێبینی دەکرێ زانیاری زۆرە بەڵام زۆربەی کتێب و سەرچاوەکان لەو سێ سەرچاوەیان وەرگرتوە کە ئاماژەی بۆکرا، ئەمەش لەکاتی بە دوا گەڕانی سەرچاوە و زانیاری لەسەر لایەنەکانی ئەم بابەتە بەدی کرا، هەروەها هەوڵی ئەوە دراوە پەیڕەوی ڕێبازی لێکۆڵینەوە بکرێ بۆ ئەوەی شێوازێکی ئەکادیمیانە وەربگرێ، لەگەڵ ئەوەشدا مانای ئەوە نیە کە هیچ کەم و کورتیەکی نەبێ، بەڵام زۆر بە دڵنیایەوە کەم و کورتیەکان لە کەمتەرخەمی و بە ئەنقەست نەبووە، ئامانج بۆ هەولدان کارکردنە، بێ گومان هیچ کارێکیش بێ هەلە نابێ، لەبەر ئەوەی ئەگەر کار نەکرێ هەلە چۆن دەکرێ.

## دەروازە

کورد بە درێژایی مێژوو لە شوێن و پلەو پایەکانی خۆیدا توانیویەتی ببێ بە بزوێنەری ڕوداوەکان بە جۆرەها شێوە و بە زەبری هێزو سیاسەتی ئەو دەسەلاتەی کە لە ژێر دەستی دابووە، بە شێوەی میرنشین و دەسەلاتی خۆجێی وەك سەردەمی میرنشینە کوردیەکان لە هەردوو دەولەتی صفوی و عوسمانی، هەر چۆنێ بێ کوردەکان بەخۆشی بێ یا بەترشی بێ توانیویەتیان لەگەڵ قۆناغەکانی مێژوودا گوزەر بکەن و خۆیان بگونجێنن تاکو قۆناغی ژیانیان گەیشتە سەدەی ١٩ سەرهەلدان و جولانی هەستی نەتەوایەتی لە دەولەتی عوسمانی لە هەمان کاتیشدا دەولەتی عوسمانی توشی سستی دەسەلات و بێ هێزی هاتبوو بۆ ئەو مەبەستە پلانێکی خۆ ڕێکخستنەوەی دارشتبوو تاکو بتوانێ کێشەکانی چارەسەر بکات و دەسەلاتی ناوەندیش بەهێز بکاتەوە، دەسەلاتە خۆجێیەکان و میرنشینە کوردیەکان بونە قوربانی ئەم پلانەی دەولەتی عوسمانی

و کۆتایی بە میرنشینەکان هێناو میرنشینی بۆتانیش دوا هەمین میرنشین بوو کە لە سالی ١٨٤٧ لە ناوچوو، دواتریش چەند بزوتنەوەو جولانەوەیەك سەریان هەلدا وەك بزوتنەوەی یەزدان شێر سالی ١٨٥٣ بە تەکتیك و فێلێکی سیاسی بزوتنەوەکە لەبار بردرا، هەرچەندە لە سالی ١٨٧٩ بزوتنەوەی کورانی بەدرخان دەرکەوت بەلام کاریگەریەکی ئەوتۆی نەبوو بەم جۆرە لە دوای ئەم بزوتنەوەی یەزدان شێر بۆشایەك لە سەرکردایەتی سیاسی کورد دروست بوو تاکو سالی ١٨٨٠ شۆرشی شیخ عوبەیدوللای نەهری لەم سەردەمەوە قۆناغێکی نوێ لە بزاڤی کوردایەتی و گەشەکردنی هەستی نەتەوایەتی و هوشیاربونەوەی گەلی کورد چوە قۆناغێکی نوێ و تازەوە توانی گورپوتین بە تواناو لێهاتوی بزاڤی رزگاریخواز بدات مەترسی بۆ سەر دەسەلاتی مەرکەزی عوسمانی و دەولەتی قاجاری و بەرژەوەندیەکانی ولاتە زلهێزەکانی بەریتانی و رووسیا دروست بکات، هەرچەندە شۆرش چەند دەسکەوتێکی سەرەتایی بە دەست هێنا بەلام بە پلانێکی تۆکمەو هەمەلایەنەی ناوبراوان توانرا شۆرشەکە لەبار ببەن و کۆتایی پێ بهێنن، بە کۆتا هاتنی شۆرشەکە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد کۆتای نەهات بەلکو بوو بە چەخماخەی هەموو شۆرش و بزاڤە نەتەوەیەکانی تر کە خۆی لە دواکاری ئازادی و سەربەخۆی و دادپەروەری نێوان چینەکان دەبینیەوە، وە بوو بە سەرەتای دروست بوونی چەند ریکخراو کۆمەلەیەکی نەتەوەیی لە پێش جەنگی یەکەمی جیهانی و هاتنە ئارای بزوتنەوە یاخود شۆرشی نەتەوەیی شێخ عبدالسلام بارزانی کە دواتر باسی لێوە دەکەین، بە شێوەیەکی گشتی ئەوە دەرخستەیەکی ئەو جولانەوەو شۆرشانەی کورد بوو کە لە بەر ئەنجامی بوژانەوەی هەستی نەتەوایەتی سەریان هەلدا و بوون بە درێژە پێدەری خەباتی

نەپساوەی بزاڤی رزگاریخوازی کورد و تاکو ئێستاش هەر بەردەوامە و بەردەوامیش دەبێ تاکو گەیشتن بە مافە رەواکانی گەلی کورد و دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردی وەرگرتنی ڕەزامەندی دانپێدنانی نێو دەوڵەتی لە ئایندەیەکی زۆر نزیك دا.

## * شوێنی جوگرافی بارزان

بارزان[1] دەکەوێتە سەروی باکوری کوردستان ـ عێراق لە چوارچێوەی سنوری کارگێری پارێزگای هەولێر ناوەندەکەشی قەزای مێرگەسورە،قەزاکەش دابەش کراوەتە سەر سێ ناحیە وەك (مێرگەسور، بارزان، شێروان) سنوری بارزان لە بەشی ڕۆژهەلاتی قەزای رواندز و لە رۆژئاوا قەزای ئامێدی (العمادیە) لە بەشی باشوریش قەزای ئاکرێ (عقرە) لە بەشی باکوریش لەسەر سنوری تورکیایە[2]. سروشتی بارزان زۆر کوێستان و شاخ و داخە چاندنی گەنم و جۆی کەمە، میوەی زۆرە، هاتوو چۆیان لەگەڵ موصل دایە[3]. دانیشتوانەکەی بە کشتوکالەوە خەریکن، بە هۆی بونی ناوچەی شاخاویەوە هاموشۆ و پێدا چوونی ئەستەم و بە ماندوبونە، لە رۆژئاواوە زێی ی گەورە لەسەرەتای باشوری بارزانەوە دێت تا دەگاتە گەلی بیخمە و لە باشوری موصل تێکەل بە روباری دجلە دەبێت، وە روباری روکوچك لە باکورەوە دەست پێ دەکات لە باکورەوە دەست پێ دەکات و بە ناوەراستی ناوچەکەدا تێ دەپەرێت و دواتر لەگەڵ زێی ی گەورە بەیەك دەگەن لە نزیك ریزان، لە چیایە ناسراوەکانی چیای شێرین و بوتین و پیران و قەلەندەرو برادۆست و زەردەنەو کوری هوری[4].

## ناوی بارزان

(بەرزان) یاخود (بارزان)[٥]، بە هەردوو شێوە ناوی دەبەن و ناو دەبرێت، ناوی بەرزان لە وشەی بەرزەوە هاتوە لەبەر ئەوەی لە شوێنێکی جوگرافی بەرزەوە دروست بووە و پێیان ووتوە بەرزان، هەندێ کەس ناوی (بارزان) دەیبەنەوە سەر (پارسان) و ئەڵێن واتە (عابدان) و (زاهدان) لەسەر ئەو مانایەی کە ئەم شێخانە زاهد و خواناس بونە بێجگە لەوە ئەم ناوە نەئەبو (پارسان ) بوایە بەڵکو ئەبو (پارسایان) بوایە ئەویش بارزانیان بوایە واتە تاك (مفرد)ی وشەکە بارزانیان بوایە ئەو کاتە کۆیە (جمع)ەکەی دەبوو بە (بارزانیان کان) ئەمەش دیارە شتێکی هەڵەیە دیسان ئەوانە لەسەر ئەو مانایەدا وا ئەڵێن کە گوایە ئەمە لە خواناسی شێخەکانەوە هاتووە لەگەڵ ئەوەدا ناوەکە هەیە لە پێش ئەوەی کە شێخەکان دەست بکەن بە شێخەتیەوە واتە لە پێش کاتی (شێخ تاج الدین) ەوە گوندی بارزان هەیە و ناوی بارزان بوە ئەوەش پێچەوانەی ئەوە نیە کە بارزان ئێستا عەشیرەتەو چۆن ئەبێ ئێستا گوند بێ چونکە هەموو عەشیرەتێك ناوەکەی سەرەتا ناوی باپیرە گەورەیەتی یا ناوی ئەو شوێنە بووە کە لێی دانیشتوون، ناوی (بارزان)یش سەرەتا ناوی ئەو گوندە بوە و بە تێپەربونی کات بڵاوبونەتەوە تا وای لێهاتووە بووە بەناوی عەشیرەت و ناوچەکەکانی شوێنکەوتەی بارزان[٦]. هەروەها مەعروف چیاووك پێی وایە ناوی بارزان بۆ عەشیرەتی (برازی) دەگەرێتەوە یاخود ناوی باپیرە گەورەی ئەوان بوبێ کە مانای هەقناس یان لەوانەیە لە ووشەی "بارسان" ەوە ئالوگۆری بەسەر داهاتبێ کە مانای دەروێشان یان (برازان)ە واتە "اخوان الصفا"[٧]

## * ڕەچەلەك و پێكهاتەی هۆزی بارزان

دەكرێ بڵێین پێكهاتەو سەرهەڵدانی ئەم هۆزە وەكو خانەوادەیەكی دیار و ناسراوی ناوچەكە و دەركەوتنیان وەك بزوتنەوەیەكی سیاسی و چەكداری و ئاینی و تەریقەتی دەگەڕێتەوە بۆ شێخەكان لە زنجیرەی میرەكانی ئامیدی (العمادیە) لەو ماوەیەدا باپیرە گەورەی مسعود لە گوندی هەفنكا نزیك بارزان نیشتەجێ دەبێ زواج لەگەڵ یەك لە كچەكانی گوندەكە دەكات كوڕێكیان لە پاش ئەویش كورەكەیان بەناوی (سعید) دواتریش دەگوازرێتەوە بۆ نەوەكەی بەناوی (شیخ تاج الدین) ئەوەی كۆتایی واتە شیخ تاج الدین زانایەكی ئاینی بە تەقوا بوو ژمارەیەك مریدی لە دەورە كۆبونەوە و تەكیەی بارزان دامەزرێندرا لە دوای ئەویش كوڕەكەی بەناوی (شیخ عبدالرحمن) و دوای مردنی ئەویش كورەكەی هات بەناوی (شێخ عبدالله) كە ناوبانگی بە زوهد و تەقوا دەركردبوو، كورەكەی خۆی (شێخ عبدالسلام)ی ناردە قوتابخانەی نەهری بۆ وەرگرتنی زانستە دینیەكان لەسەر دەستی شێخی گەورە (سید تەهای نەهری) لەدوای مردنی باوكی بەڕێوەبردنی كاروباری تەكیەی گرتە دەست و ژمارەی مریدەكانی گەلێك زیادی كرد و قوتابخانەیەكی دینی لە بارزان دامەزراندو لە هەموو ناوچەكانەوە ڕویان تێ كرد و ژمارەی قوتابیەكانی لە زۆربوندا بوو[8] هەروەها بەهۆی شێخایەتی و تەریقەتەوە هەموو ناوچەكانی مێرگەسور مزوری باڵا و زۆرتر لە زێبار بوون بە مرید و تۆبەكاریان تا لە كۆتایدا بە هەموو خەلكی ئەو ناوچەیە ئەوترا بارزان و بارزانیەكان[9]، وە شێخ عبدالسلام پەیوەندیەكی گەرمی لەگەڵ سەید تەهای نەهری دا هەبوو یەك لە سەردانەكانی حەزرەتی مەولانا خالدی نەقشبەندی بۆ تەكیەی بارزان بووەو، شیخ عبدالسلام یش لەگەلیدا چووەتە

ئەهری بۆ سەردانی سەید تەهای ئەهری. هەروەها ئەو هۆزانەی کۆك بون و مل کەچی تەواویان بۆ شێخ عبدالسلام هەبوو بە هەموو بڕیارو ڕاسپاردەکانی شێخ ڕازی بوون لەم هۆزانە پێك هاتبوون (شیروانی، دۆلۆمەری، مزوری، بەرۆژی، نزاری، گەردی، هەرکی بنەچی) لە هەمان کاتدا ناوی بارزان کورانی ئەم هۆزانەش دەگرێتە خۆ[10] ئەمە بوە هۆی ئەوەی کە یەکگرتویەك لە نێوان عەشیرەتەکانی دراوسێ بیتە کایەوە و عەشیرەتی بارزان دابمەزرێت[11]، بارزانیەکان بەهۆی ئەوەی کە لە ناوچەیەکی وا سەخت و دژواردا نیشتەجێ بوون لە مەڵبەندی شارستانی بەدوور بوون لە ڕووی پێکهاتەی جەستەیی خەلکی لەشساغ و بە هێزن لە ڕووی ڕەوشتیشەوە هێشتا هەر خاوەنی سروشت و داب و نەریتی باوك سالارین[12]، کاتێ (شێخ عبدالسلام) لە سالْی ۱۸۷۲ وەفاتی کرد بە سێ سالْ پێش وەفاتی کتابێکی بە هێزی لەسەر فیقهی ئیسلامی داناوە، دواتر دراوە بە کورەکەی (شیخ محمد) کە ئەویش بە زوهد و تەقوا بەناوبانگ بوە لەسەر دەستی باوکی فێری خوێندن بوە دەرسی لای ئەو خوێندوە، لە سەردەمی ئەودا تەکیەی بارزان دەرچەیەك یاخود مەنفەزێکی زولم لێکراوان بووە (شێخ محمد) لە دوای خۆی پێنج کوڕی بەجێ هێشتووە (شیخ عبدالسلام ی دووەم، شێخ احمد، محمد صدیق، بابو، مەلا موستەفا)، هەروەها ژمارەی گوندەکانی (٤٠٠) گوند دەبێ، بە پێی ئاماری شۆرشی ئەیلول لە کۆتایی شەستەکان ژمارەی دانیشتوانەکانی (۳۵۰۰۰–٤٠٠٠٠) کەس دەبێ[13]. بە پێی تەخمینی مارك سایکس بەشێکی گەورەو گرنگ لە بارزانیەکان شێروانیەکانن کە بە (۱۸۰۰) خێزانی ئەژمار کردون لە دوای ئەوانیش هۆزی مزوریە لە باکوری بارزان لە نزیك گوندەکانی سنوری تورکیا، وە پەیوەندیشیان لەگەڵ نێروەدا

هەیە لە ڕۆژهەڵاتیشەوە هۆزەکانی بەرۆژ و دۆلۆمەرین[١٤]، هۆزی بارزان چەند خاسیەت و تایبەتمەندی خۆی هەیە کە پێی دەناسرێنەوە بەوەی زۆر شەڕکەرو ئازان بە هەموو مانایەك ژێردەستەو مل کەچن بۆ شێخەکانی خۆیان قسە شکاندنی ئەوان بەلای بارزانیەکانەوە نابێ، شێوەی قسەکردنیان شێوەی کوردی بۆتانە مۆسیقای قسەکردنیان ئاوازەیەکی هەیە[١٥] .

## پەیوەندی نێوان هۆزی بارزان و هۆزەکانی تری ناوچەکە

پەیوەندی هۆزی بارزان لەگەڵ ناوچەکانی دەوروبەری خۆی بە شێوەیەکی گشتی پەیوەندیەکی ئاسایی و دۆستایەتی بوە دەکرێ ئەوەش بۆ پایەی ئاینی و تەریقەت بگەڕێتەوە، ئەمەش وایکردبوو کە خەلکانێکی زۆر لە دەوریان کۆببنەوە و پەیوەندی لەگەڵ شوێن وگوندەکانی دەوروبەردا ببەستن، بێجگە لە دوو هۆزی ناوچەکە نەبێت ئەوانیش هۆزی برادۆست و زێباریەکان بوون، ڕەنگە ئەوەش هۆکارو تایبەتمەندی خۆی هەبێ بەو پێیەی لەیەك کاتدا خاوەن پایەی ئاینی و دەسەلاتداری ناوچەی خۆیان بوبن و ڕووبەروی یەکتر بوبنەوە لەسەر بەرژەوەندی هۆزایەتی لە یەکتر گیر بووبن یاخود ئەوکەسانەی زولم زۆریان لەلایەن هەر یەکێك لە هۆزەکان لێکرابێ ڕەنگە پەنای بۆ لایەکەی تر بردبێ ئەوەی لە سەرچاوەکاندا ئاماژەی پێکراوە پەیوەندیەکان لە دوای دامەزراندنی تەریقەتی شێخان و تەریقەت و وەفاتی (شێخ تاج الدین) بە دیار دەکەوێت، ئەوکاتەی شێخ عبدالسلام دەبێتە شێخی تەریقەت و بارزان ناوبانگێکی زۆری دەرکرد و مرید و سۆفیەکی زۆری بۆ پەیدا بوو بەم هۆیەشەوە دەسەلاتێکی باشی پەیدا کرد ئەم جۆرە دەسەلاتەش لەگەڵ ئاغاکانی زێبار و ئاغاکانی تری

دەوروبەر نەدەگونجا بەمەش سەرەتای ناکۆکی و ململانێ دەرکەوت، ئەم ناکۆکیەی نێوان بارزان شێخانی بارزان تا سەردەمی شێخ محمدی کوڕی شێخ عبدالسلامی گەورە بەردەوام بوو دواتر زێبارییەکان مل کەچی شێخانی بارزان بوون، بەڵام ئەم مل کەچ بوونە تاسەر نەبوو هەرکاتێ زێبارییەکان دەرفەتێکیان بۆ برەخسایە لە پلان و بەربەرەکانی بارزان درێغیان نەدەکرد بەو ڕێگایانەی کە لە دەستیان دەهات، هەر هیچ نەبوایە خۆیان لە دەسەڵاتدارانی ناوچەکە نزیک دەکردەوە و لەگەڵیان ڕێك دەکەوتن لە دژی بارزان و هێرشیان دەکردنە سەر، هەروەها دوای فراوانبونی دەسەڵاتی بارزان بەسەر هۆزەکانی دەوروبەر و ناوچەکە وردە وردە دەسەڵاتیان بەهێز تر دەبوو بەتایبەتی ناوچەی مێرگەسور کە عەشیرەتی شێراوانی لێ نیشتەجێ بوو ناوچەکە بەتەواوی بوو بە پارچەیەکی تەواو لە بارزان و سنوری دەسەڵاتەکەی گەیشتە بناری ڕواندز تا ئەوکاتە لە هەر لایەکەوە یەکێك بەرەنگاریان ببایەوە بە هۆی شێخایەتیەوە لایەنی عەشیرەتداریەکەیانی بەهێزتر ئەکرد و ئەوانەی بەرەنگاریشیان ئەبونەوە هیچیان پێ نەدەکرا کە سنوری دەسەڵاتی بارزان گەیشتە ڕواندزو برادۆست (شێخ ڕەشیدی لۆلان) خۆی لە بەریان ڕاگرت و بوو بە کۆسپێکی زل لە ڕێگەی بەرەو پێش چوونی دەسەلاتیان شێخ ڕەشید خۆی بە شێخ دەزانی و ناوچەیەکی بە هێزی مریدین و مەنسوبینی هەبوو ئەو هێزەی شێخەکانی بارزان داوایان دەکرد وەکو شێخیەتی شێخ ڕەشیدیش داوای دەکرد و خۆی بە خاوەنی هەمان هێز ئەزانی و قسەی بەسەر خەڵکدا هەبوو شێخ ڕەشید کە زانی لەگەڵ ئەم هەموو شێخایەتیشدا دەستی ئەو دەستی شێخەکانی بارزان ناشکێنی و بارتەقای بارزان ناکات پاڵی دایە پاڵ حکومەت و هێزێکی پشتیوانی بۆ خۆی زیاد کرد کە

شێخەکانی بارزان بەمەیان زانی بڕیاری هێرشکردنە سەرناوچەی نفوزی شێخ ڕەشیدیان داو بەتەواوی داگیریان کرد و شێخیان بە جارێ کز کرد[١٦]. هەروەها ئەم پەیوەندیە خراپەی نێوان بارزان و برادۆست بۆ هۆز و ناوچەکانی تریش گواستراوەتەوە و پەلاماری ناوچەکانی تریان داوە، ئەم ڕووداوەش لە هێرشی مرید و سۆفیەکانی شێخ ڕەشیدی لۆلان بۆ سەر دۆلی (ڕۆست) دەر دەکەوێت کە بە هۆی ناکۆکی نێوان ئەم دوو هۆزەوە ئەنجام دراوە زیانێکی زۆریان بە گوندەکە گەیاندوەو مەڕو مالاتێکیکی زۆریان بەتالان بردووە تەنها لەبەر ئەوەی گوندی ڕوست شوێنی حەوانەوەو لانەی پێشمەرگەکان بووەو لە لایەن خەلکەکەوە پشتگیری دەکرا[١٧]. بە شێوەیەکی گشتی پەیوەندی نێوان بارزان و هۆزەکانی دەوروبەری گوندی بارزان پەیوەندیەکی ئاسایی و توندو تۆل بوە بە تێکرا مل کەچی بڕیارەکانی شێخی دیاریکراوی خۆیان بونە هەروەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێکرد، بەلام ئەوەی تێبینی دەکرێ پەیوەندیەکەیان لە گەل هۆزی (زێبار) و (برادۆست)[١٨]، پەیوەندیەکی ناکۆك و دوژمنکارانە بوە هۆکاری خراپی ئەم پەیوەندیانەشیان دەکرێ بۆ فراوانکردنی نفوز و دەسەلات و گەورایەتی ناوچەکە بەرژەوەندی تایبەت بووبێ ڕەنگە هەردولاش پاساوی تایبەت بە خۆیان هەبوبێ، هەرچۆنێ بێ پەیوەندیەکانیشیان بە پێی سەردەم و ڕوداوەکان لە هەلکشان و داکشان دابووە لە قۆناغەکانی چارەکی کۆتایی سەدەی بیستەم ناکۆکیی نێوانیان بەرەو کال بونەوە چووە و بەلام بەشێوەیەکی بنبڕ کۆتایی پێ نەهاتوە ئەمەش بە هۆی نا هاوسەنگی هێز و دەسەلاتی نێوان هۆزەکانەوەیە.

## * داواکاری سەرەتایی و دەستپێکی شۆڕشی بارزان لە سەرەتای سەدەی بیستەم

دوای نەمانی دەسەلاتی شێخ عوبەیدوللا و نەفی کرانی بۆ حیجاز، وە گواستنەوەی ناوەندی ئاینی شێخان و تەریقەت لە ناوچەی نەهریەوە بۆ ناوچەی بارزان ناوچەکە بوژانەوەیەکی بەخۆیەوە دی و بوو بە هێزێکی دیاری ناوچەکە و خەلك رویان تێ دەکرد، شێخ عبدالسلام لەسەر هەمان رێبازی باوکی دەرۆیشت و بە کارو هەنگاوەکانی شێخ نشینی ناوچەی بارزان زیاتر پەرەی سەند و فراوان بوو بەهۆی ئەنجامدانی چەند چاکسازییەك لە ناوچەکە ئەو دەستکەوتانەی بەدەست هێنا کە ئەمانەی خوارەوە بەشێکیانن:

١. هەلوەشانەوەی خاوەنداریەتی زەوی.

٢. دابەشکردنی زەوی بەسەر جوتیاران.

٣. هەلوەشانەوەی مارەیی بەزۆر و بە شوودانی زۆرەملێ.

٤. رێکخستنەوەی پەیوەندیە کۆمەلأیەتیەکان لەسەر بنەرەتی دادگەری و یەکسانی.

٥. دروستکردنی مزگەوت لە گوندەکان هەتا ببێتە شوێنی خواپەرستی و مەلبەندێکی تازە بۆ ژیانی کۆمەلأیەتی و رۆحی و سیاسی خەلکی ناوچەکە.

٦. نزیك کردنەوەی زانایانی زۆربەی ناوچەکانی بادینان لەو خوێندنگەیەی لە بارزان دا هەبوو هەتا کار گەیشتە شۆڕشێکی زانستی لە ناوچەکەدا شێخ رێزی لە زانایان دەنا و لە زۆربەی کاروباری سیاسی و زانستی شێخنشینەکەی راوێژی پێ کردون[19].

هەروەها هەر لەسەردەمی شێخ عبدالسلام لە بەهاری ١٩٠٧ لەگەلّ رێبەری تەریقەتی قادری و ژمارەیەکی زۆر لە سەرۆك عەشیرەتی کورد کۆبونەوەیەکیان

کرد لەو کۆبونەوەیەدا بۆ یەکەم جار داخوازی ڕۆشنبیری و بەڕێوەبەرایەتی و دینیان هێنا گۆڕێ و بروسکە ڕەوانەی لای باب عالی کرا کە خاڵەکانی بریتی بوون لە:

١. زمانی کوردی لە ناوچە کوردیەکان بکرێتە زمانی رەسمی.

٢. خوێندن بە زمانی کوردی بێت.

٣. قایمقام و بەڕێوەبەری ناحیە و باقی فەرماندەران لەو کەسانە دیاری بکرێن کە زمانی کوردی بزانن.

٤. هەموو فەرمانێك بە پێی شەریعەتی ئیسلام ئەنجام بدرێت، چونکە ئیسلام ئاینی دەوڵەتە.

٥. باج لە بری کاری سەربازی وەکو خۆی بمێنێتەوە بەمەرجێك بۆ چاککردنی ڕێ و بان و کردنەوەی قوتابخانە لە ناوچە کوردیەکان تەرخان بکرێت[٢٠].

هەروەها لەسەردەمی تورکەکاندا ناوچەی بارزان سالانە باجێکی دیاریکراوی دەدا بە خەزێنەی ویلایەتی موسل و ماوەیەکی درێژ بوو هیچ چەشنە پشێویەکی بە خۆیەوە نەدی بوو بەلاّم لە سالاّنی دوایدا کەمێك پێش جەنگی یەکەمی جیهانی، حکومەتی تورکیا دەی ویست ئامارێك بۆ تۆمارکردنی ناوی گوندەکان و کەسانی عەشیرەتەکان و سەرژمێریەکی مەڕو مالاّتی ئەوێ بکا، شێخەکان ڕەخنەیان لەوکارە گرت و ڕونیان کردەوە کە ئەوانیش لەو عەشیرەتە نا نیشتەجێ یانەن کە کەسانیان ناچێ بۆ سەربازی هەروەکو عەشیرەتەکانی جاف و ئەوانی دیکە ئەو گوندانەش کە ئێستا ئاوەدانن بە گوێرەی هەل و مەرجی ئێستای چیاکان ناجێگیرن کە زۆرجار هەل و مەرج وا پێویست دەکا زۆربەی دانیشتوانەکانی کۆچ بکەن بەرەو جێگایەکی تر بەتایبەتی لە ڕۆژانی قات و قڕی

نەهاتی و گرانیدا ئەو باجەی کە ئێستاش دەیدەن زۆر زیاترە لەو ڕادەیەی زیاترە کە پێویستە بیدەن، بەڵام حکومەتی تورکیا گوێی بەو داخوازییە ڕەوایەی ئەوان نەدا بەڵکو دووجار پەیتا پەیتا سوپای نارده سەریان تا کار گەیشتە ئەو ڕادەیەی شێخ عبدالسلام بە ناچاری خۆی بە دەستەوە بدات[٢١]، هەروەها عەلائەدین سەجادی باس لە هۆکارێکی تر دەکات ئەویش پەنا دانی قایمقامی سەربازی بەناوی (سەفوەت بەگ) لە لایەن شێخ عبدالسلام ەوە کە بە کوشتنی محمود شەوکەت پاشا تۆمەتبار کرابوو، دوای هەڵاتنی لە موسل خۆی گەیاندبوە لای شیخ عبدالسلام،کە (سلیمان نەزیف) لە لایەن ئتحادیەکانەوە کرا بە والی موسل و هەموو جۆرە دەسەڵاتێکی پێدرا لە کوشتن و بڕین و حەپس کردن ئەمە وای لە نەزیف کرد کە داوای تەسلیم کردنەوەی سەفوەت بەگ لە شێخ عبدالسلام بکات شێخیش سەفوەت بەگی بەدەستەوە نەدا پاش ئەوەی سلیمان نەزیف هێرشی کردە سەر بارزان دوای شەڕو شۆڕێکی زۆر[٢٢]، شێخ عبدالسلام پاش دوو مانگ لە بەرگری ناچار بوو بارزان جێ بێڵێ و ڕوو بکاتە لای (مار شەمعون) لە (تیاری بەرێ) کە لەو کاتدا پەیوەندیەکی باش و دۆستایەتی لە نێوان بارزان و ئاشوریەکان پەیدا ببوو لە هەمان کاتدا لە لایەن تورکەکان گوندەکانی بارزان توشی سوتان و تالانکردن هاتن لەو ڕەشبگیریەشدا (مەلا مستەفا) کە تەمەنی سێ سالان بوو لەگەڵ دایکی لە لایەن هێزەکانی ئتحادیە تورکەکان بە دیل گیران و لە بەندیخانەی موسل حەپس کران شێخ عبدالسلام دوای ماوەیەك بە نهێنی گەڕایەوە بارزان هەندێ هێزی کۆ کردەوە و یەکەم هێرشی کردە سەر ئۆردوگای تورکەکان لە ناوچەی بارزان تەواوی ناوچەکەی پاکساز کرد و زیانێکی گەورەی بە سوپای تورکەکان گەیاند هەرچەندە بەهۆی

مۆرکردنی بەڵگەنامەیەکی ئاشتی لە نێوان دەوڵەت و شێخ عبدالسلام دا ئەمنیەت گەڕایەوە دۆخی ئاسایی گیراوەکان گەڕانەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان خەسارەتیان دایەوە بە خەڵکەکە بەڵام ئەم بارودۆخە زۆر درێژەی نەکێشا لە ساڵی ١٩١٣ جارێکی تر سوپایەکی گەورە بە مەبەستی گرتنی شێخ عبدالسلام و دەست بەسەر داگرتنی بارزان ڕەوانە کرا شێخ ئەو جارەش خۆی بە دەستەوە نەدا و ڕووی لە کوردستانی ئێران کردو چوە (ڕاژان) بۆ لای (سەید تەهای شەمزینی) لە وێشەوە سەردانی سمکۆی کرد پێکەوە بۆ دیداری جێ نشینی قەیسەری رووسیا چوونە شاری تفلیس کار بەدەستانی تورك بە سەفەرەکەی زۆر تورە بوون خەلاتێکیان دیاریکرد بۆ ئەو کەسانەی بە زیندووی یان بە مردووی شێخ عبدالسلام یان ڕادەست بکات[٢٢]، لە گەڕانەوەیدا هەندێ کەس ڕێیان پێ گرت و بۆ ئەوەی بچێتە لایان و گوندەکەیان پیرۆز بکات گوایە لە لایەن (سۆفی عەولا فەنەك) ەوە نێردراون کە لە ڕوالەتدا خۆیان بە یەکێ لە دۆستەکانی شێخ ئەزانی شێخ گەڵێ بیانوی بۆ نەچون هێنایەوە بەڵام پیاوەکانی وازیان نەهێناو وتیان کاك عەولا وتویەتی ئەگەر شێخ نەیەت ماڵەکەم پیرۆز نەکا ماڵکەم ئەسوتێنم گوایە ئەم کاك عەولایەش سەرۆك هۆزێکی شکاك بووە لە خاکی تورکیادا شێخ دلیان ناشکێنێ و دەچێتە لایان کە شێخ بەناوی بانگهێشت و میوانیەوە دەچێ پاش دانیشتن عەولا پێی دەلێ من تۆم بۆ ئەوە هێناوەتە ئێرە تاوەکو بتگرم و بتدەم بە حکومەتی تورك هەرچەندە شێخ لەم ڕووەوە قسەی لەگەڵ کرد و ویستی لەو فکرەیەی پەشیمانی بکاتەوە سوودی نەبوو ناچار دەستە وەستان خۆی دەدا بە دەستەوە پیاوەکانی شێخ ویستیان دەست بکەنەوە شێخ نەیهێشت لەگەڵ ئەوەش دوو پیاویان هەر خۆیان نەگرت و چەند

کەسێکیان کوشت و ئەوانیش هەر لەوێ کوژران، شێخ گیراو برا درایە دەست حکومەت و لە وێوە بردیانە وان و لە وانەوە بۆ دیار بەکر و لە دیاربەکرەوە بۆ موسل سلێمان نەزیف بە ئاواتی خۆی گەیشت پاش دادگایەکی زارەکی حوکمی خنکاندن بەسەر ئەو و سێ لە هاورێکانی یەکێکیان (محمد ئاغای هیشتی) یان پێ دەگوت سەرۆکی عەشیرەتی رێکان بوو پیاوێکی پیر بوو ئەویتریان (عەبدی ئاغای مزوری) ئەویش چوبوە نێو تەمەنەوە ئەوەی سێ یەمیان (علی کوری حمدامین ئاغای مزوری) بوو کورێکی گەنجی لێهاتوو بوو لە مانگی کانونی دووەمی ١٩١٤ ئەم چوارکەسە لە سێدارە دران[٢٤] هەروەها مسعود بارزانیش لە کتێبەکەیدا بە هەمان شێوە ئاماژە بەهەمان رووداو دەکات[٢٥]، ئەوەی جێگای تێبینی و هەلوەستە لەسەر کردنە هاو نەتەوەیی و هاوزمانی و هاونیشتیمانی بوون نەبونەتە رایەلێکی گشتی لە نێوان هۆزو ناوچەکانی کوردستان بۆ ئەوەی لە خزمەتی خاك و نیشتیمان دابن و یەککگرتووی نێو خۆیان بپارێزن بەدەر لەمەش دەستیان چۆتە خوێنی یەکتر و لە بەرامبەر وەرگرتنی دیاری گران بەهاو پلەو پایەی تایبەتی خیانەتی گەورە گەورەیان ئەنجام داوە، هەروەك لەم رووداوە بە دیار دەکەوێت کە شێخ عبدالسلام لە لایەن کوردێکەوە بەناوی عەولا فەنەك دەستگیر دەکرێ و پاشان دەنێردرێتە لای کوردێکی تر لە موسل بەناوی سلێمان نەزیف و لە بەرژەوەندی خۆیان و مانەوەو سەرکەوتنی دەسەلاتەکەیان لە سێدارە دەدرێن و کۆتایی بە ژیانیان دێت، هەر لەم بارەیەوە و لەسەر نا تەبایی و خیانەتی کوردان کاوێس ئاغا لە حەیرانێکیدا زۆر راستی گوتوە کە دەڵێ کورد غەیانۆ!!؟؟

## جولانەوەی یەکەمی شۆڕشی بارزان ( ١٩٣١ -١٩٣٢ )

لە ڕاستیدا ئەم ماوەیەی شۆڕشی بارزان گرنگی و تایبەتمەندی خۆی هەیە بە هۆی ڕوداوەکانی وکاریگەرییان لەسەر کوردستان بە گشتی و ناوچەی شۆڕشەکە بەتایبەتی لە بەر بوونی ئەو هەلبەز و دابەزەی یا ئەو هەورازو نشێوەی بە خۆیەوە بینیەوە بەتایبەتی لە قۆناغی سێ یەمی شۆڕشەکە ١٩٤٣ – ١٩٤٥، لەبەر ئەوە لەم توێژینەوەیەدا هەول دەدەین بە شێوەیەکی بابەتیانە لایەنە دیارەکانی بزوتنەوەکە بخەینە ڕوو، بە شوەیەکی گشتی دەچینە سەر هۆکارەکان و ئەو کارو ئەنجامانەی شۆرش بە دەستی هێناون و بە خۆیەوە دیوە، وە ئەو تەحەدیانەی ڕوبەڕویان بۆتەوە باسیان لێوە دەکەین.

دوای مردنی شێخ محمد و لە سێدارەدانی شێخ عبدالسلام، شێخ احمد جێی ئەوانی گرتەوە، ئەو دەمەش هاوکاتی لێك هەلوەشانەوەی دەولەتی عوسمانی و سەرو بەندی دروست بوونی دەولەتی عێراقی بوو بە دەستی ئینگلیز، لەو بارودۆخەدا شێخ احمد سنوری ئیداری ناوچەی بارزانی تێکداو لە ئاکرێی جیا کردەوە و خستیە سەر رواندز تا مێرگەسوری خستە ژێر دەستی خۆی بێ ئەوەی گوێ بداتە ئینگلیز و دەولەتی تازە دامەزراوی عێراق تا سالّی ١٩٣٠ لەو مەلبەندە بەسەربەخۆیی دەژیا[٢٦]، پاش چەند لە یەك گیربونێك لەگەلّ هۆزەکانی دەوروبەرو ناوچەکە بەگشتی و بەتایبەتی برادۆست کە لە پێشەوە باسمان لێوەکردووە، حکومەتی عێراقی گەیشتە ئەو رایە کە بەتەواوی بچێتە مەیدانەوە، لەگەلّ ئەوەشدا نەشی دەتوانی راستەوخۆ و بەبێ هۆ سوپا بنێرێتە سەر ناوچەکە، لەبەر ئەوە کەوتە برو بیانوو گرتن لەو کاتەشدا (بزنانە) وەر ئەگیرا، سالانە ناوچەی بارزان لە گۆترە هەندێ پارەی ئەدا بە حکومەت لەجیاتی هەموو

ئەو بزن و مەڕو مالاتەی لە ناوچەکەدا هەبوو، بەلام حکومەت گوتی دەبێ سەرژمێری تەواوی ئەو بزنانەیە بکەم و بە پێی سەرژمێری پارەکە بدرێ، لەبەر ئەوە دەبێ بنکەی پۆلیس و دائیرەی حکومەت لە بارزان دروست بکرێ شێخ ئەحمەدیش گوتی ئەمە کارێك بووە تا ئێستا نەبووە چ لە دەوری تورکیا چ لە دەوری ئینگلیز ئەم ناوچەیە لەبەر گەرمیانی و کوێستانیەکەی دانیشتوانەکەی هەر بەچاوی کۆچەرایەتی سەیر کراون بەهەمان شێوەی کۆچەرەکانی تری عێراق، پێویست بە دروست کردنی بنکەی حکومەت ناکات و چیمان داوە ئەیدەین بە هیچ جۆرێك لە هیچ کاتێکدا نافەرمانی و سەرپێچی لە ئێمە روونادات، سەرۆك وەزیرانی ئەوکاتەی عێراقیش توفیق سویدی بوو حکومەت ئەم وەلامەی شێخ ئەحمەدی بە یاخی بوون دانا بۆیەش بە یاخیگەری دانا هەروەك لە پێشەوە باسکرا لە بیانوو دەگەرا، لەو کاتیشدا عێراق سەرقالی پەیمانی ١٩٣٠ بوو لە لایەکی تریشەوە بارودۆخی ١٩٣٠ سلێمانی و بزوتنەوەی شێخ مەحمود وای لە حکومەتی عێراقی کرد واز لە ناردنی هێز بهێنێ بۆ سەر بارزان تا کۆتایی ١٩٣١[٢٧]، لە راستیدا ئەم برو بیانوەی حکومەت بۆ لێدانی بارزان تەنها بەهانەیەکی پووچی لێدانەکە بوو، بەڵکو هۆکاری تری لە پشتەوەبوو کە لەلایەن ئینگلیزەکان پشتگیری دەکرا ئەویش دانانی (فەلەکان) بوو لە ناوچەکانی دەوروبەری بارزان، هەر چۆنێ بێ دوای خۆ رێکخستنەوەی هێزەکانی عێراق بۆی دەرکەوت کاتی ئەوە هاتووە هێرش بکاتە سەر بارزان و هەلی بۆ هەلکەوت کە دەستی خۆی بوەشێنێ بەم هۆیەوە لە تشرینی دووەمی ١٩٣١ ئەم بەیاننامەیەی دەرکرد:

(( لەبەر ئەوەی شێخ ئەحمەدی بەرزانی پەلاماری هەندێ دێهاتی ئەو ناوەی

ـوە و لە تالانکردن و لە کوشتن هیچ درێغیەکی نەکردووە حکومەت بریاری دا
ـۆنەی لێ بکاتەوە، بەو بۆنەوە فەرمانی دا بە فەوجی ((بلە)) بچێتە سەریان و
ـەمبێیان بکات. لە پاش ئەوە کە لە رۆژی (٩) ی تشرین بەرەنگاری یەك بوون،
ـە هێزی حکومەت (١٣) سەرباز و ئەفسەرێك کوژرا و (٩) برینداریش هەر لە
ـەرباز و {پۆلیس} و پەیدا بووە لە هێزی شێخ ئەحمەد (٣٠) کەس بریندار بوو
ـ٢٠) کەسیش کوژرا. حکومەت هەر خەریکە بۆ لەناوبردنی ئەوانە وە بۆ
گێڕانەوەی ئاسایش لەو ناوەدا.))[٢٨].

ئەمە دەقی ئەو بەیاننامە رەسمیە بوو کە حکومەت بلاوی کردەوە لە واقعدا
حکومەت هیچ ریو شوێنێکی وەرنەگرتبوو تەنیا دوای چەند مانگێك لە پاش ئەو
ـووداوە ئەو فەوجەی کە لە بلێ دامەزرا بوو بەسەر لێشێواویەوە بەرەو ئاکرێ
ـشەکشەی کرد و کەرەستەکانیشی لە بلێ جێهێشت، هۆکاری ئەوە دەگەرێتەوە
ـە حکومەت بە مەسەلەی شێخ محمود سەرقال بوو کە لە (پیران) ەوە بە
ـەرستەی سلێمانی دەورپشتی هاتبوو[٢٩]، دوای دامرکاندنەوەی هەرای شێخ
محمود لە سلێمانی حکومەت جارێکی تر بە خۆی کەوتەوە بۆ ئەوەی بە دلنیایی
ـ بێ ترس ئاور لە پەلاماری بارزان بداتەوە لە نیسانی ١٩٣٢ هێزی پۆلیس و
سەرباز بە پشتیوانی هێزی هەوایی بەریتانی هەموو دەوروبەری بارزانیان
ـەیەوە[٣٠]، بەریتانیاش بۆ ئەم کارەی چەند بیانویەکی خۆی خستە روو کە
ـەمەی خوارەوە پوختەیەکی بەلاغی سەرکردایەتی فرۆکەوانی ئینگلیزیە کە لە
ـی ١٩٣٢ دەرچووەو رۆژنامە ناوخۆیەکان بلاویان کردۆتەوە:

لەبەر ئەوەی سوپای عێراق بۆ ماوەیەکی درێژ پێویستی بە رێکخستنی
سەربازی هەیە حکومەتی عێراقی داوای لە مەندوبی سامی بەریتانی کردووە بۆ

لەناو بردنی شۆرشگێران کە هێزی ئاسمانی پاشایەتی یارمەتی بدات، جا هێزی ئاسمانی بەریتانی بریاریداوە لە رۆژی ٢٦ نیسانی ١٩٣٢ لێیان بدات کە یەك رۆژ دوای جولانەوەی سەربازی بوو ئەم فرۆکانە بەیاننامەیان بەسەر گوندە بارزانیەکاندا بلأوکردۆتەوە داوایان لیّ دەکات بەشداری لەم جولانەوەیەدا نەکەن) پاش بۆمبارانکردنی ژن و مندال و بیّ تاوانەکانی ناو گوندەکانی دەوروبەری بارزان فرۆکەیەك لە لایەن بزتنەوەکە بە چالاکیەکی زیرەکانە لە رۆژی ١٩٣٢/٤/٢٩ تێکشکێنرا کاپتن و چاودێرەکەشیان بە دیل گرت پاش ئەوەی شێخ ئەحمەد جێگای حەسانەوەیان بۆ دابین دەکات هەوالّی نارد و داوای لە ئینگلیزەکان کرد کە دکتۆرێك و نەشتەرگەرێك رەوانە بکەن بۆ ئەوەی فریای بریندارەکە بکەون لە بەرامبەر ئەوەدا فرۆکەکان شەرەکەیان راگرت (هولت)ی سکرتێری بەشی رۆژهەلات لە بالوێزخانەی بەریتانیا لەگەلّ دکتۆرێك چوون بۆ بارزان و بون بە میوانی شێخ احمد دواتریش بوون بە ناوبژیوان دوای چەندیر دانیشتن و سوربونی حکومەتی عێراق لەسەر داواکارییەکانی خۆی لە چەك دانان و دورخستنەوەی شێخ و سەرۆکەکانی بارزان بۆ بغداو کردنەوەی بنکەی پۆلیس. هەر چۆنیّ بیّ گفتو گۆکان هیچ ئەنجامێکیان لیّ نەکەوتتەوە بە هەر هۆیەکیش بێت ئینگلیزەکان بۆ جارێکی تر لە ٢٥ مایسی ١٩٣٢ گوندەکانیان بۆمباران کردەوە بە دڕندانەترین شێوە گوندەکانیان سوتاند و خەلکی بیّ تاوانیان کوشت و سەدان کەس بریندار بوون و هەزاران کەسیش دەربەدەر بوون، لە ٩٣٢/٥/٢٧ هێرشی فرۆکەکان بە پلە یەك چربوەوە کە دانیشتوانی ناچار بوون پەنا ببەنە بەر ئەشکەوتەکان و خۆیان بشارنەوە هێرشی ئەم فرۆکانە بە سەختی و توند و تیژیەوە تا ٩ حوزەیرانی ١٩٣٢ بەردەوام بوو لەبەرامبەر ئەم سەر سەختیە

قوربانیە بیٚ تاوانیە، شێخ محمد صدیق ناچار بوو بۆ راگرتنی ئەم ئۆپەراسیۆنە سەربازییە داوای دەخالەت و راگرتنی شەر لە ئینگلیز بکات بەلام ئینگلیز بەمە رازی نەبوو وە حکومەتی عێراقیش دەخالەتی قبول نەکرد ئەم روداوە لەسەردەمی حکومەتەکەی نوری سعید بوو کە محمد امین زەکی وەزیری بەرگری و جمال بابان وەزیری ئەو کابینەیە بوون[٣١]، سەرکەوتنی حکومەتی عێراق لەو هێرشەیدا بۆ بەشداری بەربلاوی هێزی ئاسمانی بەریتانیا و بۆردومانی بێووچانی شوێنی بارزانیەکان دەگەرێتەوە، ئەم بارودۆخە شێخ احمد ناچار دەکات بە خۆی و ژمارەیەك چەکدارەوە خۆی تسلیم بە حکومەتی تورك بکات[٣٢]، هەروەها مسعود بارزانی بەم شێوەیە باس لە چوونی شێخ احمد و هاوکارانی دەکات بۆ تورکیا، لە ماوەی مانگی حوزەیران ئامادەکاری دەکرا بە ئاراستەی تورکیاو دورکەوتنەوە لە زەویەکانی عێراقی[٣٣]، لە ١٩٣٢/٦/١٠ کۆبونەوەی خێزانەکان لە دۆلی زین و گوندەکانی دەوروبەری ئامادە بوون بۆ چوونە ناو خاکی تورکیا دوای چەند گفتو و گۆ و بینینی شێخ احمد لەگەلٚ بەپرسەکانی بارزانی لەسەر چەند خالێك رێکەوتن کە ئەمانەی لە خۆ گرتبوو:

١. چوونی ژماریەك لە خێزانەکان بۆ تورکیا.

٢. گەرانەوەی ئەو خێزانانەی مەترسیان لەسەر نیە بۆ ژیانی ئاسایی خۆیان و پێدانەوەی چەکە کۆنەکان بە دەسەلاتدارانی عێراقی.

٣. ئەو خێزانانەی مەترسی ژیانیان هەیە تەنها بەرەو تورکیا بچن.

٤. مانەوەی ژمارەیەك لە جەنگاوەران لە دەوروبەری (٢٠٠-٣٠٠) کەس بە سەرکردایەتی خلیل خۆشەوی و احمد نادر و عبدالله کرکەموی و حسن محمدامین لە سەر سنور لە نێوان گوندەکانی گەردی، وە جێهێشتنی ئەو چەکە زیادانەو

شاردنەوەیان بۆ سوود وەرگرتن وکاتی پێویست.

شێخ احمد لە ١٩٣٢/٦/٢٠ چەند نوێنەرێکی بۆ تورکیا نارد کە پێکهاتبوون لە محمد صدیق بارزانی و حاجی تەها ئامێدی بۆ گوندی گرانە لە ناو تورکیا بۆ مەسەلەی رێکخستنی چوونی خێزانەکانیان حکومەتی تورکیا وەکو پەنابەر وەریگرتن بەو مەرجەی چەکەکانیان لە گرانە دابنێن، بەم جۆرە خێزانە بارزانیەکان لە سنور پەرینەوە چونە ناو گوندی گرانە(٣٤)، دوای چوونی بارزانیەکان بۆ ناو خاکی تورکیا بەماوەیەکی کەم مەلا مستەفا و خەلیل خۆشەوی گەرانەوە بۆ شەری پارتیزانی زیانێکی زۆریان لە هێزەکانی حکومەت دا ئینگلیز و حکومەتی عێراقی سکالایان لە حکومەتی تورکیا کرد، تورکیاش هەستا بە دورخستنەوەی بارزانیەکان بۆ ئەدەنە دوای ئەوەی دەسەلاتدارانی تورك لە رێگەی (وان)ەوە گواستیانەوە بۆ ئەرزرۆم و لە وێوە شێخ احمد و حاجی تەها ئامێدیان گواستەوە بۆ ئەنقەرە خێزانەکانیشیان گواستەوە بۆ ئەرزرۆم لە رێگادا خێزانەکانیان لە یەکتردەوە جیا کردەوە لە نێوانیان خێزانی شێخ احمد و محمد صدیق و بابۆ و مەلا مستەفاو براکانی و کورەکانی عبدالسلام ی برا گەورەیان لەگەلّ وەلی بەگ و خێزانی و دە لە خێزانەکانی تر لە ناویاندا خێزانی حاجی عبداللە ئامێدیان گواستەوە(٣٥).

## جولانەوەی دووەمی بارزان لە لایەن خەلیل خۆشەوی(٣٦)

پاش رۆیشتنی شێخ احمد و دارو دەستەو بنەمالەی بارزان ئەو جارە حکومەت بە هەموو دلنیاییێکەوە ئەوەی ویستی لە ناوچەکانی مزوری بالا و بەرۆژو بارزان جیّ بەجێی کرد بە ئارەزووی خۆی لەشکرو قایمکاری خۆی تیا دانا بەلام ئەوەی تاسەر بۆی نەچووە سەر لەبەر ئەو پەیوەست بوونەی خەلکی

ناوچەکە بوو بە شێخان و ئەو زولم و زۆریەی حکومەت بەکاری دەهێنا، ئەمانە بوونە هۆی ڕاپەرینی پارتی زانی لە لایەن خلیل خۆشەوی کە ئەم بارەی پێ هەڵنەگیراو بە یادی شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفا دەستی دایە تفەنگ و لە شوێنی ئەوانەوە کەوتە بەربەرەکانی کردن لەگەڵ حکومەتی عێراقی، بەرە بەرە خەلکی ناوچەکەش لە دەوری کۆ دەبونەوە و لە هەموو لاییەکەوە هێزی حکومەتیان شلەژاند، لەو ماوەیەی شێخ احمد و مەلا مستەفا ڕۆیشتبوون حکومەتی عێراقی تا سەردەمی خلیل خۆشەوی نۆ جار وەزارەت گۆرابوو ئەوکاتیش سەردەمی حکومەتەکەی یاسین هاشمی بوو ئەویش کەوتە خۆ ئامادەکردن و پەیوەندی بە تورکیاوە کرد بۆ گرتنی سنورەکان خۆشی بێجگە لەو هێزەی لەناوچەکەدا هەیبوو هێزێکی هەوایی و سەرزەوی بردە بارزان هەر بەمەش وازی نەهێنا لە ٥ ئابی ١٩٣٥ (اعلان احكام عورفی) باری تەنگەتاوی لەهەموو ناوچەی بارزان ڕاگەیاند و کەوتە بواری جێ بەجێ کردنەوە هەرکەسێك گومانیان لێ بکردبوایە ئەگیرا و حوکمی لەسەر ئەدرا بێ ئەوەی هیچیان لەسەر بدۆزنەوە بەم هۆیەوە لەسێدارە ئەدران، ئەحکامی عورفی نزیکەی سێ مانگ بەردەوام بوو، هێزەکانی پارتی زانی لە هەموو لایەکەوە، وە لە ناکاویدا پەلاماری هێزی حکومەتی ئەدا لەو کاتەدا حکومەتی عێراقی گەیشتە ئەو رایەی زانی بە خۆی چارەی ئەم کارەی پێ ناکرێ لەگەڵ تورکیا کەوتنە گفتوگۆ و هاوپەیمانی یەکتر لە ڕۆژی ١٩٣٦/٣/٧ بە دو قۆلی و هەردولا هێرشیان کردە سەر خەلیل خۆشەوی و هاورێکانی لە ناو ئەو دوو ئاگرەدا مانەوە لەگەڵ ئەمەشدا بەرگرییێکی توندیان کرد خۆیان بەدەستەوە نەدا ئەم شەرەی مردن و ژیانەیان درێژەی کێشا تا ڕۆژی ١٩٣٦/٣/١٣ تا خلیل خۆی و سلیم خۆشەوی و چەند کەسێکی تر

کوژران و تەرمەکانیان کەوتە دەست حکومەت، لێرە بە دواوە بۆ ماوەی چەند ساڵێك کۆتایی بە جولانەوەکانی کورد هات[٣٧].

ئەم شەڕانەی خەلیل خۆشەوی لەگەڵ هێزێکی زۆرو نا بەرامبەردا جێگای هەلوەستە و پرسیار کردنە چونکی لە ماوەکانی ڕابردوو شێخ ئەحمەد و بنەماڵەکەی لەبەر هێرشە زۆر و توندەکانی حکومەتی عێراق بۆ سەر ناوچەی بارزان نەیانتوانی خۆڕاگرن بەم هۆیەوە بەرەو تورکیا ملی ڕێیان گرت لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەی چەکدارەکانی شێخ ئەحمەد زۆر زیاتر بووە لە چەکدارەکانی خەلیل خۆشەوی، هەڵبژاردنی ئەو جۆرە شەڕکردنەی خەلیل خۆشەوی دەکرێ بۆ سیاسەتی حکومەتی عێراق بگەڕێتەوە، ئەمەش لەو لێبوردنانەی لەو ماوەیەی کە دەری کردوون بە هیچ شێوەیەك خەلیل خۆشەوی نەگرتۆتەوە، هەروەك لە لێبوردنەکانیەوە بەدی دەکرێ، حکومەتی عێراق لە ١٩٣٢/١٢/١٨ بەلێنی دا هەموو ئەو کەسانەی بەشدارییان لە ڕاپەرینی شێخ ئەحمەد کردووە چاوپۆشیان لێبکرێت و سزا نەدرێن جگە لە خەلیل خۆشەوی دەبێ بەبێ مەرج ڕادەستی حکومەت بکرێتەوە، وە لە ١٩٣٣/١/١٧ حکوتی عێراق لێبوردنێکی بۆ بارزانیەکانی تورکیا دەرکرد جگە لە خەلیل خۆشەوی، هەروەها لە ٢٠ شوباتی ١٩٣٣ بە پێی نوسراوێکی وەزارەتی دەرەوە کە ئاراستەی وەزارەتی ناوخۆی کردووە تیایدا جەختی لەوە کردۆتەوە کە هەموو پەنابردووە بارزانیەکان بەر لێبوردنی گشتی دەکەون جگە لە خەلیل خۆشەوی، هەروەها لە ١ نیسانی ١٩٣٣ ئەنجومەنی وەزیران بە بڕیاری ژمارە (دوو) بە کارکردنیان لەسەر نوسراوی وەزارەتی ناوخۆ ژمارە (٤٧٣٣) لە بەرواری ١٩٣٣/٣/١٩ لێبوردنی گشتی بۆ بارزانیەکان دەرکرا تەنها خەلیل خۆشەوی نەبێت، ئەم مکور بونەی حکومەت

لەسەر خۆ بەدەستەوەدانی خەلیل خۆشەوی بۆ ئەو زیانە زۆرانەی کە بە هێزو دەسەلاتدارانی گەیاندبوو دەگەڕێتەوە کە لە بۆسەیەکی خەلیل خۆشەوی دا قائیمقام و بەڕێوەبەری پۆلیسی ئاکرێ کوژران، وە فشاری بەریتانیاش بۆ سەر عێراق لە داوا کردنی خەلیل دەوری سەرەکی بینی بەهۆی تێوەگلانی لە کوشتنی پۆلیسێکی مەسیحی(٣٨).

هەروەها بە هۆی هەندێ لە بەرژەوەندیەکانی ئینگلیز لە دانانی ئاشوریەکان لە سەر سنور و هەست کردن و نیگەرانی تورکیای لێ کەوتەوە ئەمە وای لە تورکیا کرد بنەماڵەی بارزانیەکان بە ئاراستەی سنور جولە پێ بکات، بەریتانیەکان کاتێ زانیان نیازی کارەکەیان بۆ ناچێتە سەر لەگەڵ تورکیاو عێراق رێکەوتنێکیان کرد بۆ تەسلیم کردنەوەی بارزانیەکان بە حکومەتی عێراق ئەوەبو پەیمانەکە مۆرکرا و بارزانیەکان رادەستی عێراق کرانەوە حکومەتیش لە جیاتی ئەوەی بیانباتەوە شوێنی خۆیان لە موصل نیشتەجێی کردن پاشان بردنی بۆ ناصریە و دواتر بۆ حلە و دیوانیە کەرکوك و پردێ چوار سالێك لەم ناوەدا مانەوە دواتر بۆ سلێمانی گواسترانەوە سلێمانی بوو بە شوێنی ژیانیان، لەوێ حەوت سالیان بەسەر برد.

## جولانەوەی سێ یەمی شۆرشی بارزان ١٩٤٣ – ١٩٤٥

دەکرێ سەرەتای ئەم قۆناغە بۆ ئەوکاتە بگێرینەوە کە شێخ احمد و مەلا مستەفا و بنەماڵەکەیان گواسترانەوە بۆ سلێمانی کە لە پێشەوە باسی لێوە کرا، پاش ماوەیەك مانەوەی بارزانی لە سلێمانی، لە ناوەڕاستی جەنگی دوەمی جیهانی و حکومەتەکەی نوری سعید و شێخ مستەفا قەرەداغی پارێزگاری

سلێمانی لە ١٧/حوزەیرانی ١٩٤٢ مەلا مستەفا لەگەڵ مامەند شێروانی و شێخ مستەفا بە پرچەکی و بە نهێنی لە سلێمانی دەرچوون لە ڕێگەی (پێنجوێن، بانە، سەردەشت، پەسوێ، لاجان، ناودەشت، سیلکە، سرێشمە) بە ماوەی هەفتەیەك گەیشتنەوە بارزان، بەنەمانی مەلا مستەفا لە سلێمانی دەسەلاتدارانی سلێمانی و حکومەتەکەی نوری سعیدی هەژاند، ئەم ڕوداوە بوو بەهۆی گواستنەوەی شێخ احمد و بنەماڵەکەی لە سلێمانیەوە بۆ حیللە لە ترسی ئەوەی نەوەك ئەوانیش هەمان ڕێگای ئەو بگرنەبەر و بچنە لای مەلا مستەفا، پاش ئەوەی مەلا مستەفا گەیشتەوە ناوچەی خۆی و ماوەیەك پشودانی دواتر کەوتە گفتو و گۆو نامە نوسینی لەگەڵ حکومەت کردەوە، مەبەستی هەلاتنی خۆی لەو نامانەدا خستە ڕوو وای نیشاندا کە نیازی لەم هەلاتنە پیاو خراپی نیە بەلکو تەنها پیاو خراپی دەسەلاتدارانی حکومەت وایان لێ کردووە ئەم ڕێگایە بگرێتەبەر، ئێستا مەبەستی ئەوەیە کە لە ناوچەی خۆی لەناو خزم و کەس و کاریدا بە هێمنی و ئاسودەیی بژی بێجگە لەمە هیچ مەبەستێکی تری نیە، بەلام حکومەت ئەم قسانەی ئەوی بەهەند وەرنەگرت و فەرمانی بە هێزەکانی کرد کە مەلا مستەفا ڕاو بنێن و بیگرن بەلأم مەلا مستەفا خۆی بە دەستەوە نەدا و خۆشی لە شەڕ دەپاراست[٣٩].

**چەند سەرنجێك لەبارەی بارودۆخی ئەوکاتەی کوردستان لە ڕووی ئابوری و باری کۆمەلأیەتیەوە**

ئەوکاتە ڕەوشی ئەو بەشەی کوردستان زۆر مەترسیدار بوو گوندەکان چۆل و هۆل بوون کەسیان تێدا نەبوو هەندێ لەو گوندانە وێرانە بوون لە سەرتاسەری ناوچەکە شوێنەوارێکی کشتوکاڵی نەبوو کشتوکاڵی تێدا بکرێ برسیەتیێکی لە ڕادەبەدەر سەری هەلدا بوو، هەروەها گەندەلی کارمەندانی دەولەت لە دەست

دەرچووبوو پارێزگارانی هەولێر و موسل هەرگیز نەهاتبوونە ناوچەکە، لەڕووی ڕێگاوبانەوە شتێکی وا بەدی نەدەکرا کە باشتر وایە مالیاتە ڕێ بەو ڕێگایانە بگوترێ لەبەر ئەوەی زۆر خراپ بوون، کەمی قوتابخانە و خەستەخانە گرفتێکی تر بوو ئەوەی هەشبوو زۆربەیان وێران بوون و خزمەتێکی وایان نەبوو ئەم بارودۆخە تەنها تایبەت نەبوو بەو ناوچانەی کە پەیوەست بوون بە سیاسەتەوە، بەڵکو ڕەوشی پەروەردەو تەندروستی لەو ناوچانەی چ پەیوەندیەکیان بە سیاسەتیشەوە نەبوو یەکجار خراپ بوو بە پێی گوتەی کوردێك کە نەفی میسر کرابوو لە ساڵی ١٩٤٦ دەڵێ لە هەر هەموو ناوچەکانی کوردستان عێراق دا تەنیا شەست قوتابخانە هەبووە لەو شەستە تەنیا دوو قوتابخانەیان ناوەندی بوون سی قوتابخانە لەوانە دەرسی قۆناغی سەرەتاییان تێدا دەگوترایەوە ئەوانی تر باخچەی ساوایان بوون، ئەمە کورتەیەکی بارودۆخی لایەنی ئابوری و باری کۆمەلایەتی و ژیانی کۆمەڵگەی کوردەواری ئەو سەردەمەی کوردستان بوو.

هەر چۆنێ بێ لە مانگی ئەیلولی ١٩٤٣ سعید بیرۆخی کە یەکێك بوو لە کوردە یاخی بووەکان لە دژی تورکیا دێتە لای مەلا مستەفا بە هاتنی ئەو پیاوە جولانەوەکە بە هێز دەبێ، ئەمەش ئاماژەیەکە بە هەبوونی پەیوەندی لەگەڵ کوردەکانی کوردستانی تورکیا بەلام هۆی هاتن و پەیوەندی ئەم کەسایەتیە لە سەرچاوەکاندا باس نەکراوە، نازانرێ لەسەر چ بنەمایەك ئەم پەیوەندیە دروست بووە، پاش ماوەیەکی کەم لە ڕوداوێکی نادیارو ئالۆز بێ ئەوەی کەس بزانێ کێ یەکەم تەقەی کردووە، بارزانیەکان یاخود سەربازە عێراقیەکان، لەوە بەدواوە ڕوداوەکان بەخێرایی ڕوودەدەن و بارزانی سەربازە عێراقیەکانی نێوان سنوری تورکیاو عێراق ناچار دەکات مەخفەرەکانیان چۆل بکەن، پاشان لەسەرەتای

مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٤٣ لە نزیکی مێرگە سور لە هێزێکی سەربازی ١٥٠ کەسی دەدات و ناچاریان دەکات پاشەکشە بکەن و زیانێکی گەورەیان لێ بدەن لە کۆتایی هەمان مانگدا حکومەتی عێراقی هێزێکی لە پیادە و سەرباز و زرێ پۆش و هێزی فرۆکەوانی دەنێرێتە شەڕی بارزانیەکان، مەلا مستەفا ئەوکاتە (٢٠٠) کەسی لەگەڵ دایە، بەم جۆرە لە ١٩٤٣/١١/٩ یەکەمین شەڕو پێکدادان لەو بەری مێرگەسۆر بە ئامادەبوونی جەنرال (**برۆمیلۆ**) سەرۆکی شاندی سەربازی بەریتانیا لە عێراق دا ڕوودەدات شەڕەکە تا ١٩٤٣/١١/١١ لە (**هینان**) هێزەکانی عێراقی دەشکێن و شەست کوژراو بریندار دەدەن، بەهۆی ئەم شکستەوە جەنەرال برۆمیلۆ محازەرەیەك لە بارەی بێ مەشقی هێزەکانی عێراقی دەدات و باس لە لایەنەکانی بێ هێزی سوپای عێراقی دەکات، مەلا مستەفا لەسەر جولانەوەکانی خۆی بەردەوام دەبێ، بەلام ئەو کاتەی سعید بیرۆخی بەدەستی تورکەکان دەکوژرێ، بێ ئومێدیەك توشی بارزانی دەبێ و پێشنیاری ئەوە دەکات کە خۆی بە دەستەوە بدات بە مەرجێ سەفیری بەریتانیا زامنی چۆنیەتی تسلیم بوونی ئەوبێ، کە لە ڕاستیدا هەول دەدات ئینگلیزەکان لە ڕوداو و مەسەلەکانەوە بگلێنێ، لە هەمان کاتیشدا ئینگلیزەکان تەنها ڕەچاوی بەرژەوەندیەکانی خۆیان دەکەن لەم سەرو بەندەشدا چەند نامەو نامە کاریەك لە نێوان مەلا مستەفاو (**کۆرنوالیس**) ی سەفیری بەریتانیا دروست دەبێ و بارزانی لەو نامانەدا تەنازولێکی لە ڕادەبەدەری بۆ دەکات تاکو ببێ بە ناوبژی نێوان بارزان و حکومەتی عێراقی، وەلامی بەریتانیا فشار خستنە سەر عێراق بوو کە لە ئەنجامدا بە فشاری بەریتانیا دانوستانی نێوان بارزانی و حکومەتی عێراقی لێ کەوتەوە بە نوێنەرایەتی **ماجد مستەفا**، بەم هۆیەوە نوری سعید بە فشاری

بەریتانیەکان لە ١٩٤٣/١٢/٢٥ لە هەمواركردنێكی وەزاریدا ماجد مستەفا كە لە پیاو ماقولانی سلێمانی بوو وەكو ڕاوێژكار لە كابینەی تازەدا دەمەزراند[٤٠]، هەروەها دەخالەتی بارزانی بۆ حكومەتی عێراقی دەرفەتێك بوو بۆی چونكە ترسی لە فراوانبونی جولانەوەكە هەبوو لەبەر ئەوە فەرمانی بە ماجد مستەفا كرد كە بچێتە باكور و چاوی بە مەلا مستەفا بارزانی بكەویٚ و هەوڵبدا كێشەو ئاستەنگەكان نەهێلیٚ، لە كەین و بەینی باسەكەدا ماجد مستەفا پێش ئەوەی سەردانی بارزان بكات دەستی بە خۆ نزیك كردنەوە كرد لە **"حزبی هیوای كوردی"** كە لە لایەن هەندیٚ لە قوتابیانی قوتابخانەكانەوە دامەزرا بوو ئەمەش بۆ ئەوە بوو كە تۆمەتی خیانەت كردن لە خۆی دور بخاتەوە لە ڕستیشدا توانی ئەم كارە بكات، هەروەها توانی پەیوەندی بە لاوانی كورد لە بەغدا بكات و بۆیان ڕوون بكاتەوە كە ئەو تەنیا بۆ خزمەتی كورد وەزارەتی قبول كردووە بەم هۆیەوە توانی زۆر لە لاوانی كورد بناسیٚ و دوای گفتووگۆ كردن لە گەڵیاندا ڕاپۆرتێكی دا بە وەزارەت لە ڕاپۆرتەكەدا داوای كردبوو هەندیٚ لە ئەفسەرانی كورد لەناو سوپادان بەناونیشانی ئەفسەرانی پەیوەندی لەسەر شێوازی ئەفسەرانی پەیوەندی ئینگلیز لە ناوچەی باكور دابمەزرێن، ئەوەبوو بڕیاردرا بە دانانی (عزەت عبدالعزیز، عزیز سید عبدالله، امین رواندزی) دواتر بەرەو بارزان بەرێكەوتن و لە مێرگەسور چاویان بە مەلا مستەفا كەوت پاش گفتوگۆ كردن لەگەڵیاندا مەلا مستەفا بەرامبەر چەك دانان هەندیٚ مەرجی دانا كە ئەمانەی خوارەوە بوون:

١. دەركردن یا گواستنەوەی ئەو فەرمانبەرانەی كە بە وەرگرتنی بەرتیل و خراپ بەكارهێنانی دەسەڵات ناوبانگیان هەیە.

٢. پێکهێنانی ولایەتێکی جیاوازی کورد لە شێوەی ڕژێم ئیلی رۆژهەلات لە بولگاریا کە لە لیواکانی (کەرکوك، سلێمانی، هەولێر، درنە، باجەلان، خانەقین و قەزا کوردیەکانی سەر بە موسل و دهۆك و زاخۆ و ئامێدی و ئاکرێ و شەنگار و شێخان پێك دێ بگرێتەوە.

٣. ناسینی زمانی کوردی بە زمانی رەسمی.

٤. دیاریکردنی وەزیرێکی کورد لە کابینەی وەزارەتدا کە بەرپرسی ولایەتی کوردستان بێت.

٥. دامەزراندنی بریکارێکی کورد بۆ وەزیرەکان لە هەموو وەزارەتەکانی دەولەتدا بەلاّم دەربارەی سوپاو دارایی ئەو حالەتە وەکو خۆی دەمێنێتەوە چونکە مەبەست لە دانانی ئەو مەرجانە پێکهێنانی بەڕێوەبەرایەتییێکی پاك و جیاوازە لە ناوچەی کوردستان.

دەکرێ سەرەتای هەستی تەواو پێگەیشتوی نەتەوەیی لێرەوە دەست پێ بکات لەبەر ئەوەی پەیوەندی نێوان چین و توێژە نەتەوەیەکان تێکەل بە یەك دەبن، ئەم داواکاریانەش لە ژێر ئەم هەستە نەتەوەیە بەرز کرانەوەو کاریان لەسەر کراو بونە دروشمی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد، دوای چونەوەی ئەو نوێنەرانەی بە مەبەستی دانوستان چووبون، لەسەر کارو بنەمای ئەوان ماجد مستەفا لە ١٩٤٤/١/٧ سەردانی مێرگەسوری کرد و چاوی بە مەلا مستەفا کەوت بەم شێوەیە رێکەوتنێك بە ئەنجام گەیشت:

١. گێرانەوەی شێخ احمد لەگەلّ هەموو ئەو پیاو ئافرەت و مندالانەی لەگەلّی دایە.

٢. چوونی مەلا مستەفا بۆ بەغدا بی مەبەستی پیشاندانی گوێرایەلی و مل کەچی.

٣. سپاردنی کاروباری بەڕێوەبردن لە ناوچەی بارزان بەو فەرمانبەرانەی کە بەپاکی و خاوێنی ویژدان ناسراون.

٤. دەست کردن بە کردنەوەی قوتابخانەو خۆش کردنی ڕێگاو بنیاتنانی سەراکانی پۆلیس، هەروەها ڕیوشوێنی پێویستی تر بۆ جێ بەجێ کردنی سەقامگیری و ئاسایشی ناوچەکە(٤١).

دواتر ماجد مستەفا گەڕایەوە بەغدا لە ژێر ڕۆشنایی ڕاپۆرتی ئەفسەرە کوردەکان و ڕاپۆرتەکەی خۆی ڕاپۆرتێکی پێشکەش بەو لیژنەیە کرد کە لە لایەن حکومەتەوە بۆ کاروباری بارزان پێکهێنرا بوو، ڕاپۆرتەکەی ماجد مستەفا و لیژنە تایبەتەکە حکومەتی هێنایە سەر ئەو ڕایە کە لە ١٩٤٤/١/٢٥ چەند بڕیارێکی تایبەت بە کێشەکە دەربکات، دەربارەی بەروارەکە مەعروف چیاووك بە ١٩٤٤/٢/٧ داناوە، لەبەر ئەوەی دەڵێ لەو بەروارەی پێشتر سەرۆك وەزیران نوری سەعید بە سەردانێك لە فەلەستین بووە لە بەرواری دووەم هاتۆتەوە و بڕیارەکانی دەرکردووە، بەڵام دەکرێ لە بەرواری یەکەمیشدا ئامادەسازی لە لایەن کاربەدەستانی حکومەت کرابێ و کلێشەی بڕیارەکان ئامادە کرابن و کاتی هاتنەوەی سەرۆك وەزیران واژۆی لەسەر کردبێ، لەبەر ئەوە دەکرێ ئەو بەروارەش بەتەواو دابنرێت، بەهەر شێوەیەك بێت بڕیارنامەکەی حکومەت ئەم خاڵانەی لە خۆ گرتبوو:

١. ئیدارەیەکی تازە لە قەزاکانی زێبار، ڕواندز، ئامێدی و دەوروبەری مێرگەسور و [illegible]ێروان مەزن و بارزان دروست بکرێ و کاربەدەستانی باشی بۆ دابنرێ ئەگەر پێویستیش بوو بەناوی ئەفسەرانی پەیوەندی ئەفسەریان بۆ بنێرد،

٢. دروست کردنی بنکەی پۆلیس لە هەموو ئەو ناوچانەدا لە خەلیفان و دیانەو ڕیزان و کانی ڕەش.

٣. کردنەوەی ڕێگاو بان لە نێوان بنکەکانی پۆلیس و بەیەك گەیاندنیان.

٤. دورخستنەوەی مەلا مستەفا لە ناوچەی بارزان.

٥. گەراندنەوەی شێخ ئەحمەد و بارزانیەکان بۆ شوێنی خۆیان، هاتنی مەلا مستەفا بۆ بەغدا بۆ خۆ بەدەستەوەدان و مل کەچی نواندن، بەلاّم بڕیاردان لەسەر ئەم دووشتە لە دەستی وەزارەتی ناوخۆ و وەزیری بێ وەزارەت دا دەبێ هەرکاتێ ویستیان بڕیاری لەسەر ئەدەن.

٦. ئەو شت و کەل و پەلانەی مەلا مستەفا و هاوڕێکانی لە حکومەتی داگیر کردووە لەگەلّ چەکەکانی خۆیان بدەنەوە بە حکومەت.

٧. دەرکردنی لێبوردنێکی گشتی بۆ بارزانیەکان بێجگە لە چەك هەلّگرەکان و ئەو کار بەدەستانەی کە لە حکومەتدا بوون و چونەتە لای مەلا مستەفا کاتی لێبوردنەکەش حکومەت بەخۆی دیاری دەکات.

٨. وەزارەتە پەیوەندارەکان کارەکانی خۆیان جێ بەجێ دەکەن.

لە هەمان کاتدا ماجد مستەفا داوای لە حکومەت و حزبی هیوا کرد کە ئەفسەرانی پەیوەندی کەمن و دەبێ زیاد بکرێن هەمووشیان ئەبێ لە حزبی هیوا بن، ئینجا بە ڕەزامەندی هەرسێ لا واتە حکومەت و ماجد و حزبی هیوا چەند کەسێك هەلّبژێردران و نێردرانە ئەو شوێنانەی بۆیان دیاری کرابوو، کەسەکانیش لەمانە پێکهاتبوون: (فوئاد عارف، بۆ ناوچەی پشدەر، مەجید عەلی، بۆ ناوچەی ئامێدی، سەید عەزیز سەید عەبدوللا بۆ ناوچەی مێرگە سۆرو برادۆست، ئەمین ڕواندزی بۆ ڕواندزو بارزان، میرحاج ئەحمەد بۆ ئاکرێ، مستەفا خۆشناو بۆ

بارزان)، لە دوای گرتنە بەری ئەو ڕێو شوێنانە شێخ ئەحمەد و بنەماڵەکەی لە حللەوە بۆ بارزان گواسترانەوە مەلا مستەفاش لە گەڵ چەند کەسێك چووە بەغدا و لە هوتێلی شەتولعەرەب دابەزین بە مەبەستی پیشاندانی خۆبەدەستەوەدان و مل کەچی نواندن، چەند ڕۆژێك لە بەغدا مانەوە، ڕۆژنامەکان ئەوەیان بلاّکردەوە کە پیاوانی بارزانی بە چەکەوە لە شەقامەکاندا دەسورێنەوە و خەلکیان نیگەران کردووە ئەم هەوالەش بە کاربەدەستان گەیشت بیرو ڕایان لەسەر بارزانی ئاراستەیەکی تری وەرگرت خەریك بوو بارەکە بە ئاقارێکی تردا بگۆرێ و ژیانی مەلا مستەفا و پیاوەکانی بکەوێتە مەترسی، بەم هۆیەوە مەلا مستەفا گەڕایەوە بارزان، ئەم بارو دۆخ و گفتو و گۆیانەی نێوان حکومەت و بارزان زۆر درێژەی نەکێشا، لە روداوێکی کت و پڕیدا حکومەتەکەی نوری سەعید لە (٧/ نیسانی ١٩٤٤ ) کەوت و ڕوخا لەگەڵ ئەوەشدا بە وەکالەت لە حوکم دا مایەوە تاکو لە (٣ حوزەیرانی ١٩٤٤) حەمدی پاچەچی بۆ یەکەم جار وەزارەتی وەرگرت و ماجد مستەفاش لە وەزارەت دەرچوو هیچ پۆستێکی پێ نەدرا[٤٢].

لە سەرەتای وەرگرتنی وەزارەت و حکومەت لە لایەن حەمدی پاچە چیەوە هەلوێستێکی توندی بەرامبەر بارزانیەکان نیشاندا، پاش دوو مانگ دەسەلاّتداری لە (٨ ئابی ١٩٤٤) چەند بریارێکی دەرکرد و لەسەر زمانی بەڕێوەبەری گشتی پرو پاگەندە لە ڕادیۆوە خوێندرایەوە کە لەخۆ گرتبوو:

١. پاش سەرنج دان لە ناوەرۆکی ئەو ڕاپۆرتانە شلەژاوی و ئاسایش لە زێبارو دەوروپشتی ڕادەگەینێ.

٢. بە لەبەر چاو گرتنی ئەو کردەوە تاوانکاریانە و ئەو پێشێلکاریانە کە مەلا مستەفا بارزانی و دەست و پێوەندەکانی ئەنجامیان داوە تێکدانی ئاسایشی گشتیە.

٣. کاروبارەکان وا پێویست دەکەن کە دووبارە ئاسایش و رژێم بگەڕێتەوە و ڕێگا بە دوبارە بوونەوەی تاوان نەدرێ، بڕیاردرا کە ناوچەی بارزان بە هێرشی سەربازییانە داگیر بکرێ و تاوانبارانیش دەستگیر بکرێن و بدرێنە دادگا.

٤. دەسەڵات بەخشین بە وەزیر بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم بڕیارانە.

لەسەر ئەو بنەمایە موتەسەریفی هەولێر سەعید قەزاز بەیانێکی بڵاو کردەوە کە تیایدا خەڵك و عەشیرەتەکانی هاندەدا تا لە بارزانیەکان دور بکەونەوە هەروەها گوتویەتی هەرکەسێك بە پێچەوانەی ئەمە بجولێتەوە بە توندی سزا دەدرێ، لە (١٩٤٤/٨/١٩) دەسەڵاتدارییەتی عورفی لە هەولێرو موسل ڕاگەیاند پاش ئەوە سەرکردەی هێزەکان وردەکارییەکانی ئەم بڕیارەی لەم قەزاییانەی خوارەوە خوێندەوە (ڕواندز، ئامێدی، دهۆك، ئاکرێ) ڕاگەیاند ئەمە لە بەرواری (١٩٤٤/٨/٢٨) بوو، هەروەها ئەنجومەنی عورفی ناوبراو لە (١٩٤٥/١٢/١) حوکمی لە سێدارەدانی بە شێوەیەکی غیابی بەسەر ٣٥ کەس لە شێخان و ئەفسەران و هەندێك لە فەرمانبەران دابڕی و ٧٠ پیاوی تریش بە حوکمی هەتا هەتایی و کاری سەخت دەرکرد.

**ئەو هۆکارانەی بوونە مایەی جولانەوەی دووەمی بارزان ئەوا دەکرێن بە دوو بەشەوە:**

**أ. هۆکارە ڕاستەقینەکان:**

١. ئارەزووی ئینگلیز بۆ لێدانی بارزانیەکان بۆ ئەوەی ناوچەکەیان پێ چۆل بکات و ئاشوریەکانی تێدا نیشتەجێ بکات.

٢. دەست تێ وەردانی بێ پەردەی ئینگلیز لە کێشەی بارزان لە سەر دەستی "کرنل مید، میجور مور،میجور ولسن، کاپتن ئوستوکس، جاکسن و ......هی تر"

هەرەشەی بەردەوامی ئەوان و مانۆڕەکانیان بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان.

**ب. هۆکارە دروست کراوەکان:**

١. حکومەتی عێراقی داوای لە بارزانیەکان کرد دەست بەجێ (٥٠٠) تفەنگ تەسلیم بکەن.

٢. تەسلیم کردنەوەی ئەو ئەفسەرانەی کە پەنایان بۆ بارزان بردووە، لە بابەتی داهاتوودا باسی لێوە دەکەین.

٣. بیانوو گرتن بەوەی کە بارزانیەکان دژی حکومەت هاوپەیمانیەتیان لەگەڵ عەشیرەتەکاندا بەستووە و دەرکردنی فەرمانی گرتن بۆ هەر بارزانیەك کەوا سەردانی فەرمانگەکانی حکومەت بکات(٤٣).

هەر چۆنێ بێ بەهەر بیانویەك بێت لە بەرواری (٢٥ ئابی ١٩٤٥) شەڕ دەستی پێ کرد، شەرەکانیش بە چەند ناوێك و لە چەند قۆلێکەوە هەلگیرسا، یەکەم شەریش لە بادلیان بوو پاشان شەڕەکانی نەهلە و هاودیان و مەزنە و شەڕی هەڕنێ لە رۆژئاوا و شەڕی چیای پێرس کە کۆتا شەڕ بوو بە ناچاری لە بەرواری ١٩٤٥/١٠/١١ مەلا مستەفاو بنەمالەو هاوڕێکانی چونە ناو خاکی ئێران[٤٤]، لە دەر ئەنجامی شکستی شۆرشەکە دادگایەکی سەربازی لە هەولێر پێك هێنرا و چەند بڕیارێکی بەسەر بەشدار بوانی شۆرشەکەدا سەپاند کە حوکمی ئامادە نەبوو (غیابی) لە سێدارەدانی بۆ ٣٥ کەس دەرکرد لە ناویشیاندا مستەفا بارزانی و شێخ ئەحمەد بارزانی و حەوت ئەفسەرەکەی سوپای عێراق و چەندانی تریش هەروەها بریاری بەندکردنی ٨٠ کەسی بە ماوەی جیا جیا دەرکرد لەگەڵ قەدەغە کردنی هەموو رێکخراوە پێشکەوتنخوازەکانی کوردستان[٤٥]، بە شێوەیەکی گشتی بارزانیەکان و ئەو ئەفسەرە کوردانەی

پەیوەندیان پێوە کردبوون لە شەڕەکاندا سەرکەوتوو بوون و زیانێکی زۆریان لە هێزەکانی حکومەت دا بەڵام وەکو نەریتی هۆزایەتی خیانەتکردنی هەندێ لە کورد و سەرۆك هۆزەکان بە پاڵپشتی هێزەکانی حکومەت توانرا ئەو سەر کەوتن و دەسکەوتە سەرەتاییانە لەبار ببەن و بە سەریان دا زاڵ بن، وە لە ناوچەکانی خۆیان دەربکەن، دوای ڕۆشتنی بارزانیەکان هۆزە نەیارەکان لە ڕوانگەی هۆزایەتیەوە و خیانەتکارەکانیش لە ڕوانگەی هەستی نەتەوەییەوە یاخود تێکەل بوو بە یەکتر هێرشیان بردە سەر ئەو ناوچانە و تالانیان کردن، هۆزەکانیش لەمانە پێکهاتبوون "بەرواری، بەراش، شەرەفانی، دۆسکی، برادۆستی، سورچی، زیباری، و چەند هۆزێکی تر"، پاشان حکومەت بەیاننامەیەکی دەرکرد لە بارەی ڕەوتی جولانەوەکانی ئەو ماوەیە کە لە (١٩٤٥/٨/٨ تاکو ١٩٤٥/١٠/١٣) لە خۆ گرتبوو خوێندرایەوە، بەم شێوەیە کۆتایی بە جولانەوەکانی بارزان لە کوردستانی عێراق هات بێ ئەوەی هیچ دەستکەوتێکی لێ بکەوێتەوە.

## جولانەوەی نەتەوەیی کورد و بزوتنەوەی بارزان

بارزان لە ناوچەیەکی هۆزایەتیەوە بۆ بزوتنەوەیەکی سۆفیگەریی دواتریش بۆ بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی، بە شێوەیەکی گشتی لە سەرەتای ناو دەرکردنی بارزان وەك جولانەوە هیچ ئاماژەیەك لە سەرچاوە مێژویەکاندا نیە کە جموجۆلی نەتەوەییان هەبوبێ، بە پێی سەرچاوەکان ناکۆکی لە نێوان بارزان و نەهری دا هەبوە، تاکو سەردەمی شێخ عبدالسلام ی دووەم کە کاروباری بنەماڵەی بارزان دەگرێتە ئەستۆ لێرە بە دواوە بارزان هەم وەك ناوەندێکی ئاینی سۆفیگەری هەم وەك ناوەندێکی سەرەتای بزافی نەتەوەیی لە چوار چێوەی

یەکێتیەکی هۆزایەتی و ناوچەیی دەرکەوت، هەروەها پاش جەنگی یەکەمی جیهانی سێ ناوەندی گەورەی بزوتنەوەی نەتەوەیی هەبوو ناوەندی سلێمانی کە شێخ مەحمود سەرکردایەتی دەکرد، ناوەندی ورمێ کە سمکۆ سەرکردایەتی دەکرد ناوەندی کوردەکانی ئەستەمبول کە دەستەی هەواڵگری کورد سەرکردایەتی دەکرد، دوای ئەو ماوەیە خەباتی چەکداری لە بیستەکان بەردەوام بوو لە سیەکانیش ئەم جولانەوانە وردە وردە بەرەو کاڵ بونەوە لەناوچون دەچوو هەرچەندە لە سیەکانیش جولانەوەیەك لە لایەن شێخ مەحمود ەوە سەری هەلدا بەڵام هەزوو لەبار بردرا، دواتر بە هەر هۆیەك بێت جولانەوەی چەکداری ١٩٣١ بارزان هەڵگیرسا، ڕاپەرینەکان و جولانەوەی ١٩٣٢ ی بارزان چەند هەورازو نشێوی بەخۆیەوەدی کە لە پێشەوە باسکرا، تاکو ساڵی ١٩٤٣ مەلا مستەفا بەیارمەتی حزبی هیوا خۆی دەگەینێتەوە بارزان، گەڕانەوەی مەلا مستەفا بۆ بارزان هەناسەیەك دەبێ بۆ خۆی و هەستی خنکاوی ئەو هەموو ئەو کەس و ئەفسەرانەی کەوتبونە ژێر کاریگەری هەستی نەتەوەیی بەرامبەر ئەو سیاسەتەی حکومەتی عێراق بەرامبەر بە کورد پیادەی دەکرد حزبی هیواش زۆر بەگەرمی هەموو کۆمەکیەکی ماددی و مەعنەوی پێشکەش بە بزوتنەوەی بارزان کرد، لەم ڕووەوە کوردستان ڕەهەندێکی نەتەوەیی بەخۆیەوە دی لە جوغزی ناوچەیی هاتە دەرەوە و بوو بە جولێنەری هەستی نەتەوەیی، دوای زنجیرەیەك شەڕی پارتیزانی سەرکەوتوانە و جولانەوەکانی چینی خوێندەوارو ڕۆشنبیریەکانی کوردستان حکومەتی عێراق ناچار دەکات مل بۆ گفتوگۆ و داواکارییەکانی کورد بدات[٤٦]، کە خۆی لەو گفتو گۆیانەی نێوان مەلا مستەفاو ماجد مستەفا دەبینێتەوە کە لە ژێر کاریگەری حزبی هیوا کارەکانی دەجولاند.

حزبی هیوا دەورێكی كاریگەری بینی لە گرد بونەوەو پالپشتی جەماوەری فراوان بۆ ڕاپەرینی بارزان، بەدەست هێنانی سەركەوتنەكانیش بە كاریگەری هێزی هیواو هەموو نیشتیمان پەروەرەكانی كوردەوە بوو كە خۆی لە گەرم و گوڕی و ئازایەتیان دا دەبینیەوە، ئەندامەكانی هیوا هەلدەستان بە چالاكی بلاوكردنەوەی و دروشمەكان لە بەغدا و بەشێك لە شارەكانی تری عێراق كە بە دەستی ڕاپەریوەكان بەدەست دەهات هەروەها ئاشكرا كردنی ئەو ڕێگایانەی حكومەتی عێراق لە نیازە خراپەكانی لە دژی كورد و ناوچەی بارزان دەیگرتە بەر، پوختەی ئەو بلاوكراوانە ئاگاداریەك بوون بۆ هەردو حكومەتی بەریتانی و عێراقی كە هەستیان بە گۆرانكارییەكی نوێ و گرنگ كرد لە بزوتنەوەی نیشتیمانی كورد، وە دركیان بەو ڕوداوانە كرد كە ئەو ڕوداوانەی لە كوردستان دەكرێ هەلگەرانەوەیەكی هۆزایەتی و دیاریكراو نیە كە لە نێوان هەندێ لە چیایەكاندا دەكرێ و ناكرێ بە ئاسانی لە ناو بچێ، بەلكو ئەوەی ئەو جارەیان واتە (جولانەوەی دووەم) بزوتنەوەیەكی نەتەوەیی چەكدارە لە لایەن گەلی كورد پشتیوانی دەكرێ بۆ بەرجەستە كردنی مافەكانی گەلی كورد[٤٧].

بە هێز بوون و توند و تۆل بوونی پەیوەندی یاخود زیاتر یەكتر ناسینی ئەندامانی هیوا و مەلا مستەفا لە كاتی گواستنەوەی بنەمالەی بارزانی بۆ سلێمانی، گەشەی زیاتری بەخۆیەوە دی، ئەم بارو دۆخەی سلێمانی بۆ بارزانی هەلێكی زێرین بوو بۆ زیاتر خەملینی بیرو بۆچونە سیاسیەكانی چونكە كاتێك ئەو هاتە سلێمانی كۆمەلەو ڕێكخراوی سیاسی دەمێك بوو دروست ببون سەرقالی كاری سیاسی چالاكی نیشتیمان پەروەرەیان دەنواند و خاوەن بیری نەتەوەیی بوون، ئیدی بارزانی لە سلێمانی دەستی بە تێكەل بوون كرد لەگەل خەلكانی

نەتەوە پەروەردا، زنار سلوپی لەم بارەیەوە دەڵێ ئەو بارودۆخە رۆشنبیری و نەتەوایەتی و چالاکیە سیاسیەی کە لە سلێمانیدا بە گورو تین بووە، هەروو مەلا مستەفا لەگەڵیدا ئاوێتە بوو پاشان بوە پاڵنەرێك بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی رێکخراو و فراوانتر درێژە بە خەباتی سیاسی و نەتەوەیی خۆی بدات تا ئەو رادەیەی کە لە سەرکردەی هۆز و شێخی ناوچەیەکەوە ببێ بە سەرکردەی گەلێکی چەوساوە و ماف خوراو، لە راستیدا بارزانی لە سلێمانی لەگەڵ ئەندامەکانی هیوادا کەمتر تێکەل بووە، وە ئەوانیش هێندە لەگەڵ رەوتی بیرکردنەوەی ئەودا گونجاو نەبوون هەرچەندە لەگەڵ خودی **رەفیق حلمی** سەرۆکی پارتی هیوا بەینیان خۆش بوو، جەلالی ئەمین لەم بارەیەوە دەلێت کاتێك مەلا مستەفا لە سلێمانی بوو لەگەڵ من و رەفیق حلمی دا پێکەوە لە مزگەوتی شێخ بابە علی دانیشتنمان دەکرد و باسی هەڵگیرساندنی شۆرشمان دەکرد(٤٨). لەگەڵ ئەو هەموو ناخۆشی و دەربەدەریەی مەلا مستەفا و بنەماڵەکەی بینی بویان، وە نیشتەجێ بونیان لە سلێمانی وایکرد هەموو جۆرە رێگایەك بگرێتە بەر بۆ دەرباز بوون لەو بارە سەختەی تێیدا دەژیان رەنگە ئەو خەباتە چەکداریەی هەلی بژارد رێگایەکی گونجاو بوبێ هەم بۆ رزگاری ژیانیان و هەم بۆ داواکاری و خۆبەرێوەبەر (ئۆتۆنۆمی) یەی کە دواتر لەگەڵ ئەو چینە خوێندەوارو ناسیۆنالیستەی داوایان دەکرد و کردیانە ئامانجی سەرەکی، هەرچۆنێ بێت روداوەکانی ئەم قۆناغەی کوردستان وایکردبوو سەرجەم کۆمەڵە و رێکخراو کەسایەتییە نەتەوەیەکان کەم تا زۆر لەیەك نزیك بکەونەوە، هەروەها مەلا مستەفا لە شەرەکانیدا بۆ دابین کردنی ئازوخە و چەك و تەقەمەنی و پارەو زانیاری و خەبەر و هەواڵەکان پشتی بە خەباتکارانی نەتەوەیی هیوا بەستبوو

بەڵام پەیوەندی دۆستایەتی نێوان ئەم دوو لایەنە زۆر ئاڵۆز بووە مەلا مستەفا بە پەیڕەوی ڕێبازی شێخ عبدالسلام ی برا گەورەی پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ نوێنەرانی بەریتانیا دا هەبوو بۆ گەیشتن بە داخوازیەکانی بەڵام حزبی هیوا بە خراپە باسی ئیمپریالیزمی بەریتانیای دەکرد ئەگەر بە نیازی هاوکاری وەرگتنیش بوایە ئەوا پەنایان بۆ سۆڤیەت دەبرد[49]. لەسەرو بەندی ئەو بارو دۆخەشدا چەند نامەیەکی ئالوگۆڕکاری لە نێوان مەلا مستەفا و ئەندامانی حزبی هیوا دروست بووە تیایدا ڕا گۆڕینەوە و باس و خواسی ڕوداوەکانی ئەو کاتە کراوە و پەیوەندیەکانی نێوانیان گەشەی کردوە و بەرەو پێش چووە[50]. هەروەها دیڤد مەکداول یش لەبارەی پەیوەندی نێوان مەلا مستەفا و ناسیۆلیستەکان کە خۆی لە ئەندامانی هیوا دەبینیەوە دەڵێ: (( ئەوە مەلا مستەفا نەبوو ناسیۆنالیزمی کوردی هەلبژارد بەلکو ناسیۆنالیستەکانی کورد بوون ئەویان هەڵبژارد. هەلبژاردنی لە لایەن ناسیۆنالیستەکان بەهۆی شارەزایی یە تاکتیکی یەکانی و ئەو دژواریانەوە بوو کە بۆ حکومەتەکانی دەخولقاندن. ئەم هەلبژاردنە پاشان، سەردەمێ لە ئێران گەیشتە ناوبانگێکی ئەفسانەیی کە بارو پێگەی لە ناو هەموو کورد گۆڕی، بە باش زانرا. ئەو ببوە ڕێبەری (بلیمەت) و کاریزمایی) ی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد)) [51]، هەرچەندە لێکۆلینەوەکەمان تایبەت نیە بە باس کردنی ئەو ڕێکخراوە کوردیانەی لەو سەردەمە بونیان هەبووە بەلام وەك بەرچاو ڕونیەك، وە بۆ باشتر ناسینی کاری سیاسی و نەتەوەییان بۆ رزگاری کورد و خەباتەکەیان، ئەگەر بە ئاماژەیەکی کورتیش بێت بە باشی دەزانین باسیان لێوە بکەین، بەم جۆرە بە شێوەیەکی گشتی ئەوکاتە لە کوردستان چوار ڕێکخراوەی کوردی هەبوون کە هەمویان بۆ سەربەخۆی

کوردستان هەولیان دەدا، بەڵام بەرهەمی خەبات و تێکۆشانیان جاروبار لە پێناو بەربەرەکانی شەخسی خۆیان بە فیڕۆ دەچوو، ڕێکخراوەکانیش ئەمانە بوون:

## أ. کۆمەڵەی هیوا

سەرکردایەتیەکەی لە بەغدا بوو، لە شارەکانی کەرکوك، سلێمانی، هەولێر، چەند شارێکی تر لقی هەبوو، کۆمەلە ڕێکخراوێکی چەپ و لایەنگیری بیری کۆمۆنیستی بوو، ڕۆژنامەی ئازادی ئۆرگانی ئەو ڕێکخراوەیە بە ڕاشکاوی پشتی کۆمۆنیزمی نێو نەتەوەیی دەگرت دژی دەرەبەگایەتی و ئیمپریالیزم خەباتی دەکرد. لە خەبات و هەلسورانی خۆیدا زۆر پەیوەست نەبوو بە پرۆگرامەکەیەوە لە شێوە تێگەیشتنەکانی خەباتی ئەوکاتە بێزار بوو، مەلا مستەفای بە سەرۆکێکی هەلسوراوی بزوتنەوەی کورد دەناسی، بەلاٌم لە هەستی ئاینی و تاکرەوانەی ئەو بە گومان بوو تەنها دەیویست بۆ گەیشتن بە ئاواتی خود موختاری ئەو سود وەربگرێت.

## ب. گروپی ئازادی

بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفا لە بارزان پێك هاتبوو، هەموو ئەندامانی سەرکردایەتیەکەی جگە لە کەسێك نەبێ ئەوانی تر سەرۆك عەشیرەت، کاسبکار، دوکاندار، جوتیار و ئەندامانی پێشوی سوپای عێراق بوون، کە لەمانە پێکهاتبوون:

١. عزەت عبدالعزیز خەلکی ئامێدی ئەفسەری پێشووی سوپای عێراق.

٢. مستەفا خۆشناو ئەفسەری پێشووی سوپای عێراق

٣. عبدالحمید باقر خەلکی خانەقین ئەندامی عەشیرەت.

٤. محمد محمود قودسی خەلکی سلێمانی.

٥. شوکت نعمان خەلکی ئامێدی.

٦. خیفزولا اسماعیل خەلکی ئاکرێ.

ئەو گروپە دوای دەست نیشان کردن و پالاوتنی مەلا مستەفا لە لایەن کۆمەڵەی هیواوە سەرکردایەتی بزوتنەوەی رزگاریخوازی لە ئەستۆ گرت[٥٢].

ج. کۆمەڵەی خۆیبون

دوای شکستی شۆرشی شێخ سەعیدی پیران لە سالی ١٩٢٥ تورکە کەمالیەکان بە شێوازێکی زۆر توند و تیژ کەوتنە راوەدونان و ئەندامانی کۆمەلە و ئەندامانی رێکخراوە سیاسیە کوردیەکان بەتایبەتی سەرکردەکانی کۆمەلەی ئازاد کە سەرکردایەتی شۆرشی سالی ١٩٢٥ کردبوو، هەروەها ئەندامانی کۆمەڵەی تەعالی کوردستان، هەندێك لەو سەرکردانەیان دەستگیر کرد و لە رێگەی دادگای سەربەخۆییەوە فەرمانی لە سێدارەدانیان بەسەردا سەپاندن، ئەوانی تریش رویانکردە سوریا و عێراق لە پێناو رزگار بونیان لەو شالاوە رەشبگیرەی کەمالیەکان دەستیان پێ کردبوو، هەلاتوەکانیش کۆمەڵە کەسێکی بە تواناو نەتەوەیی بوون هەولی کۆکردنەوە و پەیوەندی نیوان ئەوکەسایەتیانە بوون کە بۆ دەرەوە رایان کردبوو، لە ئەنجامی هەولەکان توانرا لە (١٩٢٧/١٠/٥) کۆنگرەی دامەزراندنی خۆی لە سوریا ببەستێ، بە بەشداری سێزدە کەسایەتی و لێژنەیەکیان بۆ سەرکردایەتی پێکهێنا، لە دیارترین بەشداربوانی کۆنگرەکە ( جەلادەت ئەمین عالی بەدرخان، مەمدوح سەلیم کە لە دامەزرێنەرانی کۆمەلەی تەعالی کوردستان بوو، لەگەل چەند سەرۆك خێلیکی وەك خێلی هەڤیرکی و برازان و رمان و هبسبان و چەند کەسێکی تر)[٥٣].

## ح. کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان (ژێکاف)

کۆمەڵـــەی ژیانـــەوەی کوردســـتان کورتکراوەکـــەی (ژ.ك،k,j)ە لـــە (١٦/ئابی/١٩٤٢) لەسەر داروپەردوی کۆمەڵەی ئازادیخوازی کوردستان دامەزرا. لە یەکەکەم کۆبونەوەیدا لە چەمی سابلاغ لە باغی حاجی داود بە ئامادە بوونی زیاتر لە دە کەسایەتی بەشداریان کردووە، ئەم کۆمەڵەیە لە چین و توێژە جیاوەزەکانی شاری مهاباد پێکهاتبوون کە تێکرا وردە بورجوازبوون و لەسەر بنەمایەکی نەتەوەیی، بە نهێنی دەستیان بەخەبات کرد، کۆبونەوەی دوەمیان لە مانگی نیسانی ١٩٤٣ بەست نزیکەی سەد ئەندام بەشدارییان تێدا کرد، کە وەك کۆنگرەی دامەزراندن ئاماژەی بۆ دەکرێت، لە میانەیدا بریار لەسەر هەڵبژاردنی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە دراو حسێن فروهەر کرا بە لێپرسراوی کۆمیتەی کۆمەڵە و بە بەرپرسی لێژنەکان دانرا(٥٤).

کاری هاوبەش و پەیوەندی نێوان ئەم رێکخراو و کۆمەڵە کوردیانەی بە شێوەیەکی گشتی نزیکایەتێك لە ئامانج و ستراتیژ هەستی پێ دەکرێ کە خۆی لە بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی کورد دەبینێتەوە، پەیوەندی و خواستەکانی نێوان (خۆیبون و هیوا و ژ.ك) گەیشتە ئاستێك نوێنەری نەتەوەییەکانی هەموو پارچەکانی کوردستان لە مانگی ئابی ١٩٤٤ دا لە چیای (دالانپەر) کە دەکەوێتە نێوان سنوری ئێران – عێراق – تورکیا کۆبونەوە، لەم کۆبونەوەیەدا پەیمانێك بەناوی پەیمانی (سێ سنور) واژۆ دەکەن کە (١٢) خاڵ پێکهاتبوو، گرنگترینیان ئەوەبوو جگە لەمانەوەی لقەکانی ژ.ك لە هەریەك لەم پارچانەدا، سەرکردایەتیەکی یەکگرتوو بۆ هەموو کوردستان پێك بهێنرێت و ئاراستەی خەباتی نەتوایەتی کورد بکات روەو سەرکەوتن هەنگاو بنێ، بەشدار بوانی ئەم

پەیمانە بە پێی سەرچاوە جیاوەزەکان بریتی بوون لە ( شێخ عەبدوللای زینوەو ووردێ و سەعید کانی مارانی و سەید عەزیز شەمزینی و هەمزە عەبدوللا لە باشوری کوردستان و قاسی قادری و رەحمانی ئیلخانی زادە لە ڕۆژهەلات و قازی مەلا وەهاب لە باکور و قەدری جەمیل پاشا زادە لە ڕۆژئاوا[٥٥].

دەرئەنجامەکان:

١. ناودار بونی گوندێکی بچوك و فراوانبونی بۆ ناوچەیەکی گەورە، لەسەر ئاستی کوردستان و عێراق، دواتریش لە جیهاندا.

٢. سەرهەلدانی بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی لە ناوچەیەکی هەلقولاوی هۆزایەتی و تەریقەتی ئاینی.

٣. بەردەوامی جولانەوەکانی بارزان ئەگەر بە شێوەی پچڕ پچڕیش بوبێ ، بە تێکەلّ بوون لەگەلّ کوردە ناسیۆنالیستەکان کە لە ژێر کاریگەری بیری چەپی سۆڤیەتدا لە سلێمانی و بەغدا دەرکەوتن.

٤. دروست کردنی کاریگەری و فشارێکی زۆر بۆ سەر حکومەتە یەك لە دوا یەکەکانی عێراق بەڕادەیەك بۆ چەند جارێك داوای دانوستانیان لە کورد کردووە.

٥. فراوانبونی بزوتنەوەی چەکداری و گەشەکردنی رەوتی ڕۆشنبیری و کۆمەلایەتی لە چوار چێوەی حزبی و ڕێکخراوەیدا، کە خۆی لە حزب و کۆمەلّە و ڕێکخراوەکانی ئەو کاتە دەبینیەوە هەروەها چەندین گۆڤارو ڕۆژنامە بە زمانی کوردی دەرکەوتن.

٦. دۆزی کورد و کوردستان لە پرسێکی ناوخۆی بوە بە پرسێکی جیهانی و بونە جێی قسەو باس و بەرنامەی کاری ولاتە زلهێزەکانی ئەوکاتە کە بەریتانیاو

سۆڤیەت بوون.

٧. پەیوەستبوونی تاکی کورد بەو شۆرش و بزاڤانەی لەو سەردەمە هەلدەگیرسان، بێ ئەوەی ڕەچاوی بەرژەوەندی تایبەتی و مەترسی سەر ژیانی خۆیان بکەن.

٨. نەبوونی پالپشتی هەرێمی و نێودەولەتی بۆ جولانەوەکانی ئەوکاتە، وە دەوریشی هەبوو لەسەر شکست و بەردەوام نەبونی ئەو شۆرش و بزاڤانەی کە دەکران.

٩. ناهاوسەنگی لە نێوان هێزەکانی عێراق و کورد لەگەڵ ئەوەشدا کورد توانی زیانێکی گەورە لە سوپا و هێرشەکانی عێراق بدات، ئەگەر بە پالپشتی هێزی ئاسمانی و یارمەتیە سەربازیەکانی بەریتانیا نەبوایە نەدەتوانرا وا بە ئاسانی ئەو جولانەوانە لە ناو ببەن.

١٠. بەکار هێنانی هەموو شێوازێکی توند و تیژ لە دژی هەموو جولانەوە کوردیەکان بە ئامانجی لەناو بردن و قڕ کردن.

**سەرچاوە و پەراوێزەکان:**


١. بۆ زیاتر زانیاری بروانە عەلائەدین سەجادی، شۆرشەکانی کورد وە کورد وکۆماری عێراق، ئەتلەس چاپ،تاران،٢٠٠٥، ل١٤٥.

٢. مسعود بارزانی، البارزانی والحركة التحررية الكردية،مؤسسة كاوا الثقافية،ج١، الطبعة الثانية، لبنان، بیروت، ١٩٩٧ ، ص٢٤.

٣. عەلائەدین سەجادی، س.پ، ل١٤٥.

٤. مسعود بارزانی، م.س، ص٢٤.

٥. ناوی بارزان یا بەرزان لەڕوی گوتنی شێوەزارەوە لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر دەگۆرێ، لەبەر ئەوەی ناوی بارزان لە لایەن خودی بنەماڵەی بارزانەوە هەر بە بارزان دەبردرێت ئێمەش لە سەر شێوەزاری وان هەروا ناوی دەبەین.

٦. عەلائەدین سەجادی، س.پ، ل١٤٦-١٤٧.

٧. مەعروف چیاووك، کارەساتی (بارزان)ی زولملێکراو، و:ئەبوبەکر سالح ئیسماعیل،دەزگای توێژینەوەو بلاوکردنەوەی موکریانی، چ خانی،دهوك،٢٠٠٨، ل٥٥.

٨. مسعود بارزانی، م.س، ص٢٣.

٩. عەلائەدین سەجادی، س.پ، ل١٤٥.

١٠. مسعود بارزانی، م.س، ل٢٤.

١١. د. صالح عمر عیسی، قەیران و خولقێنی زلهێزەکان لە کوردستانی عێراق، و: سلیمان تاشان، مەکتەبی پێگەیاندن و دیراساتی حزبی، چ ١، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٤٤.

١٢. ئەبولحەسەن تەفرەشیان، بارزانیەکان، و: بەختیاری شەمەیی، چ٢، ٢٠٠٤، ئینتەرنێت، www.pasok.org، ل١٢.

١٣. مسعود بارزانی، م.س، ص٢٤.

١٤. ویلیام ایغلتون، القبائل الكردية، ت: د. احمد محمود خلیل، مطبعة وزارة تربية، ط١، اربيل، ٢٠٠٦، ص١٠٥.

١٥. عەلائەدین سەجادی، س.پ، ل١٤٦.

١٦. هـ.س، ل١٥١-١٥٢.

١٧. ئینسکلۆپیدیای هەولێر، د. عبدالله عەلیاوەیی و ئەوانی تر،چاپخانەی گرین گالۆری، چاپی یەکەم، لوبنان،٢٠٠٩، ل٤٢٨.

١٨. بۆ زیاتر زانیاری بروانە عەلائەدین سەجادی،س.پ، ل١٥٢، هەروەها ولیام ایغلتون، م.س، ص١٠٦.

١٩. د. عوسمان علی، چەند لێکۆلینەوەیەك لە بزاڤی هاوچەرخی کورد، و: کامەران بابان زادە، چاپخانەی ریی نویٚ، چ١،٢٠١٠، ل٢٨١.

٢٠. حسین مەدەنی ، کوردستان و ستراتیژی دەولەتان، ب١ چاپخانەی رۆژهەلات،چ١، هەولێر، ل٣٨٣.

٢١. مەعروف چیاووك، س.پ، ل٥٩،

٢٢. هـ.س، ل١٤٩-١٥٠.

٢٣. مسعود بارزانی، م.س،ص٢٧.

٢٤. عەلائەدین سەجادی، س.پ، ل١٤٩-١٥٠.

٢٥. هـ.س،ل٢٧.

٢٦. حسین مەدەنی، س.پ، ل٣٨٧.

٢٧. عەلائەدین سەجادی، س.پ،ل١٥٣.

٢٨. هـ.س، ل١٦١-١٦٢.

٢٩. مەعروف چیاووك، س.پ، ل١٥٤.

٣٠. عەلائەدین سەجادی، س.پ،ل ١٦٣.

٣١. مەعروف چیاووك، س.پ، ل١٥٨-١٦٠.

٣٢. کریس کۆچێرا، کورد لە سەدەی نۆزدەو بیستەمدا، و: حەمە کەریم عارف،بلاو کەرەوەی کتێب فرۆشی سۆران، چاپخانەی شڤان،چاپی سێیەم، سلیمانی، ٢٠٠٤، ل١٥٠.

٣٣. لەگەلٚ ئەوەی ناوچەی بارزان لە ناو سنوری کوردستان دایە بەلام مسعود بارزانی بە زەوی عێراقی ناوی بردووە، م.س، ص

٣٤. ن.م، ص٤٩-1.٥٠

٣٥. د. عوسمان علی، س.پ، ل٢٥١.

٣٦. خەلیل خۆشەوی لە هۆزی مزوری بالایە خەلکی گوندی سیلکیٚ یە باوڕپێکراوی شێخی بارزان بووە وەکو خزمایەتی هیچ خزمایەتێکی لەگەلٚ بارزان دا نەبووە لە دوای کوژرانی خەلیل براکەی ئەسعەد خۆشەوی شوێنی دەگرێتەوە لەسەردەمی ئەودا خزمایەتێك دروست دەبیٚ لەگەلٚ بنەمالەی

بارزان، کچەکەی خۆی (موعتەبەر) دەداتە نەوەی شێخ عبدالسلام ی دووەم بە ناوی (عبدالواحید ابراهیم).

٣٧. عەلائەدین سەجادی، س.پ،ل١٦٨-١٦٩.

٣٨. رۆژ عبداللە عادل ئەرگۆشی، ناوچەی بارزان لە نێوان سالانی ١٩٣١ – ١٩٤٦، نامەی ماستەر، کۆلیژی ئەدەبیات، زانکۆی صلاح الدین، بلأو نەکراوە، ٢٠٠٤،ل٥٨.

٣٩. کریس کۆچێرا، ل١٧٣-١٧٧.

٤٠. مەعروف چیاووک، س.پ، ل١٦٨-١٧٠.

٤١. عەلائەدین سەجادی، س.پ،ل١٧٧-١٧٩.

٤٢. معروف چیاووک، س.پ،ل١٩٦-١٩٧.

٤٣. هـ.س، ل٢٠٢.

٤٤. لازاریف، مێژووی کوردستان، و: وشیار عەبدوللا سەنگاوی، چاپخانەی رۆژهەلات، چ٢، هەولێر، ٢٠١٠، ل٢٩٣.

٤٥. راپەرینەکانی بارزان لە بەلگەنامە نهێنیەکانی هەردوو حکومەتی فەرەنساو بەریتانیادا ١٩٣١-١٩٤٥،وەرگێرانی لە فەرەنسیەوە: د. نەجاتی عبداللە، دەزگای ئاراس،ب١، چاپی یەکەم،هەولێر،٢٠١٠،ل٩-١٢.

٤٦. مسعود بارزانی، م.س، ص٩٦.

٤٧. د. ئاکۆ عبدالکریم شوانی، شاری سلیمانی (١٩٣٢-١٩٤٥) چاپخانەی تیشک، چ١، سلیمانی، ٢٠٠٨، ل٧٧-٧٩.

٤٨. کریس کۆچێرا، س.پ، ل١٨٨-١٨٩.

٤٩. بۆ زانینی ناوەرۆکی نامەکان بروانە مسعود بارزانی، م.س، ص١١١.

٥٠. دیڤد مەکداول، مێژووی هاوچەرخی کورد، و: ئەبوبەکر خۆشناو، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٥، ل٤٨١.

٥١. حسن ئەرفەرع، کوردەکان، و: حامید گەوهەری، دەزگای وەرگێران،چاپخانەی منارە، چ١،هەولێر، ٢٠٠٧، ل١٩٠-١٩١.

٥٢. هیوا عزیز سعید، خۆیبون هیوا ژ.ک، چاپخانەی یاد، بێ ژمارەی چاپ، سلێمانی، ل١١-١٥.

٥٣. هـ.س، ل٦٨-٧١.

٥٤. هـ.س، ل٩٥-٩٦.

**سەرچاوە بەکار هاتووەکان:**

**أ. کوردیەکان**

١. ئاکۆ عبدالکریم شوانی، شاری سلیمانی (١٩٣٢-١٩٤٥) چاپخانەی تیشك، چ١، سلیمانی، ٢٠٠٨.
٢. ئەبولحەسەن تەفرەشیان، بارزانیەکان، و: بەختیاری شەمەیی، چ٢، ٢٠٠٤، ئینتەرنێت، www.pasok.org.
٣. ئینسکلۆپیدیای هەولێر، د. عبداللە عەلیاوەیی و ئەوانی تر، چاپخانەی گرین گالۆری، چاپی یەکەم، لوبنان،٢٠٠٩
٤. د. عوسمان علی، چەند لێکۆلینەوەیەك لە بزاڤی هاوچەرخی کورد، و: کامەران بابان زادە، چ ڕێی نوێ، چ٢٠١٠،١
٥. حسێن مەدەنی ، کوردستان و ستراتیژی دەولەتان، ب١ چاپخانەی ڕۆژهەلات،چ١، هەولێر.
٦. حسن ئەرفەرع، کوردەکان، و: حامید گەوهەری، دەزگای وەرگێران، چاپخانەی منارە، چ١، هەولێر، ٢٠٠٧.
٧. کریس کۆچێرا، کورد لە سەدەی نۆزدەو بیستەمدا، و: حەمە کەریم عارف، چاپخانەی شڤان، چاپی سێیەم، سلیمانی، ٢٠٠٤
٨. عەلائەدین سەجادی، شۆرشەکانی کورد وە کورد وە کۆماری عێراق، ئەتلەس چاپ، تاران،٢٠٠٥.
٩. د. صالح عمر عیسی، قەیران و خولقێنی زلهێزەکان لە کوردستانی عێراق، و: سلیمان تاشان، بێ شوێنی چاپ، چ ١، هەولێر، ٢٠٠٨.
١٠. دیڤد مەکداول، مێژووی هاوچەرخی کورد، و: ئەبوبەکر خۆشناو، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٥.
١١. لازاریف، مێژووی کوردستان، و: وشیار عەبدوللا سەنگاوی، چاپخانەی ڕۆژهەلات، چ٢، هەولێر، ٢٠١٠.
١٢. مەعروف چیاووك، کارەساتی (بارزان)ی زولملێکراو، و:ئەبوبەکر سالح ئیسماعیل،دەزگای توێژینەوەو بلاوکردنەوەی موکریانی، چ خانی، دهوك،٢٠٠٨.
١٣. ڕاپەرینەکانی بارزان لە بەلگەنامە نهێنیەکانی هەردوو حکومەتی فەرەنساو بەریتانیادا ١٩٣١-١٩٤٥، وەرگێرانی لە فەرەنسیەوە: د. نەجاتی عبداللە، دەزگای ئاراس، ب١، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠١٠.

14. هیوا عزیز سعید، خۆبیون هیوا ژ.ك، چاپخانەی یاد، بێ ژمارەی چاپ، سلێمانی، ٢٠٠٦.

## ب. عەرەبییەکان

15. مسعود بارزانی، البارزانی والحركة التحررية الكردية،مؤسسة كاوا الثقافية،ج١، الطبعة الثانية، لبنان، بيروت، ١٩٩٧

16. ويليام ايغلتون، القبائل الكردية، ت: د. احمد محمود خليل، مطبعة وزارة تربية، ط١، اربيل، ٢٠٠٦.

## ج. نامەی زانکۆیی

17. رۆژ عبدالله عادل ئەرگۆشی، ناوچەی بارزان لە نێوان سالانی ١٩٣١ – ١٩٤٦، نامەی ماستەر، کۆلیژی ئەدەبیات، زانکۆی صلاح الدین – هەولێر، بلاو نەکراوە، ٢٠٠٤.

# سەرنجێکی گشتی لە پەیوەندییەکانی بەریتانیاو ئێران بەر لە کودەتای فێبرایەری ١٩٢١

ئامادەکردنی: ئاشنا علی

## باسی یەکەم

## پەیوەندییەکانی ئێران و بەریتانیا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە هەتا کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی

کەنداوی فارس و کەناری دەریای ئێران بۆ ئینگلیزەکان گرنگی بازرگانی خۆی هەبووە، فراوانی کارەکانی کۆمپانیای هندی ڕۆژهەڵات و هاتوچۆی ئینگلیز لە بواری بازرگانی بۆ ئێران بە پەیوەندییەکی دیبلۆماسی دەستی پێکرد[١].

لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا ڕوسیاو بەریتانیا بوونە دوو وڵاتی بەهێزی ڕۆژئاوایی لە ناوچەکەدا، خولێکی سەدو پەنجا ساڵەی خەبات و بەربەرەکانی ئەم دووانە، بە مەبەستی پێشڕەوی سیاسی و بازرگانی و هەروەها هەوڵی ئێران بە مەبەستی پاراستنی هەبوونی خۆی وەك وڵاتێکی سەربەخۆ، بە لێکڕاستکردنەوەی دوو ڕکابەرەکە دەستی پێکرد[٢].

مێژووی پەیوەندییەکانی ئێران و بەریتانیا لە سەردەمی (سرجان ملکم)*ەوە دەست پێدەکات کە بۆ یەکەمینجار پێی نایە ناو خاکی ئێرانەوە لە ساڵی ١٨٠٠ز، پەیوەندی ئەم دوو وڵاتە لەم سەدەیەدا بەسەر چوار لایەندا دابەش بووە، واتە: بەشێکی دیبلۆماسی، یاسایی، ئیداری، بازرگانی و دامەزراندنی

تەلەگراف، دروستکردنی تەلەگراف، زیاتر مەبەستێکی سیاسی لێکەوتەوەو بۆ ئەو مەبەستە بووە[3].

حکومەتی ئینگلیز لە سەردەمی سەفەوییەکانەوە بە ناردنی کۆمپانیای (براکانی شێرلی) بۆ ئێران، بۆ دۆزینەوەی شوێن پێ یەکی بەسوود لە ئێراندا. بەرەبەرە ئەم وڵاتە لە ململانێی لەگەڵ تەواوی دەوڵەتە داگیرکەرەکاندا، شوێنێکی گونجاوی بۆ خۆی بەدەستهێنا کە دواتر لە سەردەمی قاجارییەکاندا بەسەرنجدان لە بارودۆخی لاوازی شاکانیان بۆشاییەکی فراوان بۆ چوونە ناوەوەی دەوڵەتی ئینگلیز هەروەك ڕوسیا چووە پێشەوە[4].

کۆمپانیای هندی ڕۆژهەڵاتی ئینگلیز، بە مەبەستی پاراستنی پێگەی خۆی لە بەرامبەر ڕقی توندوتیژی هۆڵەندی و فەرەنسییەکاندا وردە وردە ناچار بوو ڕۆڵێکی سیاسی لە ئەستۆ بگرێ، ئەم کۆمپانیایە توانی تا کۆتایی سەردەمی سەفەوی جێگەو پێگەی خۆی لە ئێران دا بپارێزێت[5].

ئینگلیزەکان هێڵی تەلەگرافی (هند–ئەوروپا)یان دامەزراند، بەم شێوەیە:

١– هێڵی عوسمانی: کە هەوڵدرا هێڵێکی تەلەگراف بە خاکی عوسمانیدا لە ئەوروپاوە بگەیەنرێتە هندستان.

٢– هێڵی ئێران: دوای ئەوەی عوسمانییەکان زانیان هێڵی عوسمانی سەرکەوتوونابێ، وای لە بەریتانیاکرد کە لەگەڵ ئێراندا بکەوێتە گفتوگۆ تا لە ڕێگەی تارانەوە هێڵێك ببەن، ئەمەش لە لایەن بەشێك لە خەڵکی ئێرانەوە دژایەتی دەکراو پێیان وابوو، کە مەبەستێکی تری لە ناوەڕۆکدا هەیە، بەڵام دواتر لە ساڵی (١٨٦٣) گەڵاڵەنامەی هێڵی تەلەگراف لەگەڵ حکومەتی ئێراندا واژۆکرا. بڕیاریش درا کە هێڵەکە لە ڕێگای تارانەوە بگاتە بەریتانیا، بەڵام بە دەستی ئێرانیەکانەوە بێ، بەریتانیاش دەبێ بەرامبەرێك بدات لە بەرامبەر ناردنی هەر

پەیامێکدا کە دەی نێرێت. لە کۆتایی ساڵی ١٨٦٤ هێڵە نوێیەکە تەواوکرا، دواتر پەیمانێکی دیکەش بەسترا، پەیمانێکی تریش لە نۆڤمبەری ١٨٦٥ واژۆکرا. کە سودی زۆری بۆ ئێران هەبوو، چونکە هێڵی پێشتر ساڵانە سێ هەزار تمەنی بۆ ئێران دەست دەخست[٦].

## سیاسەتی ئینگلیز لە ئێراندا دوو ئامانجی هەبوو:

یەکەمیان: ئەوەیە بەهۆی بایەخی ئەم داگیرکارییەوە، نیمچە کیشوەری هیند دەبێتە هۆی ڕێگری لە فراوانخوازیەکانی هەموو زلهێزەکان و داگیرکەرەکان لە سنوری ڕۆژئاوای ئێران.

دووەمیان: بەدەستهێنانی ئیمتیازاتی ئابوری بەتایبەتی نەوت و بەرژەوەندییە یەك لەدوای یەکەکانی لە ئێراندا بەلای خۆیدا ڕادەکێشێ[٧].

لە کۆتایی ڕۆژگاری سەفەویدا، هۆڵەندییەکان لە کەنداوی فارسدا بە قازانجی بەریتانیا بەرە بەرە جێیان پێ لێژ بوو، ئەوانیش (بەریتانیەکان) لە سەدەی نۆزدەهەمدا، توانیان چەتەی دەریایی لەناوبەرن و دەسەڵاتی بەریتانیایان چەسپاند[٨].

پێشتر ئاماژەمان کرد بەو تەلەگرافەی کە ئینگلیزەکان لە ئێراندا دایانمەزراندبوو، پێویستە ئەوە بوترێ کە ئەم تەلەگرافە پەیوەندی ئێرانی لەگەڵ ئەوروپادا دروست کرد، سەرەنجام ئێران بە پەیوەندییە جیهانیەکانەوە بەسترایەوە، پەیوەندییەکانی ئینگلیزو ئێران زۆر توندو تۆڵ بوو. تەنانەت بەریتانیەکان ئامادەی مەراسیمی شیعەکان دەبوون، کاریگەریەکی دیکەی ئەم تەلەگرافە ئەوەبوو کە پەیوەندییەکی دۆستانەی دروستکرد لە نێوان ئێرانیەکان و ئینگلیزەکان، تاکەکانی ئینگلیز لەگەڵ هەموو چین و توێژەکانی ئێران دا

تێکـەڵاویان دروسـتـــرد‌و لەگـەڵ گوندنـشینان دا بـاش بـوون و تەندروسـتیان دەکردن[٩].

هۆگری و سەرنجی لە ڕادەبەدەری بەریتانیا بۆ هندستان و ترسی لـە ڕوسـیا، ئیلهام بەخشی ئەو بیروباوەڕە سیاسیانەی بەریتانیا بوو کە بەردەوام لە خولیای پێکهێنـانی زنجیرەیـەك وڵات لـە سـنورەکانی بـاکوری هندسـتان تـا زەریـای ناوەڕاست دابوو، وە بتوانێ گەوهەری ئیمپراتۆریـەت لـە قـەڵای پتـەوی خـۆی دا بپارێزێ، مەترسییەك کە هەمیشە لە لایەن هێرش بـەرێکی نـەریتی، واتـە ڕوسـیا هەڕەشـەی لـە هندسـتان دەکـرد، لـە ڕوانگـەی بـەریتانیاوە، لاوازتـرین بازنـەی پەیوەندی وڵاتانی هندستان و هاوکـات گرنگترینیـان و سـەرەکی ترینیـان ئێـران بوو[١٠].

بەریتانیا لە ڕێگەی کۆمەکی دارایی بە دەسەڵاتدارانی ئێران، توانیان لە نێوان ساڵانی (١٨٠٩–١٨١٢) دوو پەیمان لەگەڵ ئێران ببەستن، لە پەیمانی دووەمدا کە لایەنی نیزامی هەبوو هاتووە:

((ئێـران لـە هەرچەشـنە پێکهاتنێـك لەگـەڵ وڵاتـە ئەوروپیـەکان، بـە دژی ئینگلستان خۆی دەپارێزێ، هەروەها شاش لە ئەستۆی دەگرێ، فـەرمانڕەوایانی خوارەزم و سیستان، بوخاراو سەمەرقەند بسپێرێ، ڕێ لە پێشڕەوی هەر هێزێـك بگـرێ، کـە مەبەسـتیان هێرشـکردن بێـت. سـنوری نێـوان ئێـران و ڕوسـیاش بـە هاوکاری ئێران و ڕوسیا و بەریتانیا ئەبێ)).

سـرگوراوزلی نوێنـەری بـەریتانیا لـە وتووێژێکـدا لەسـەر ڕێککەوتنەکـە نیـەتی بەریتانیا بەرامبەر بە ئێران دەردەخات:

((مـن بـە دڵنیاییـەوە لـەو بـاوەڕەدام، ئەگـەر مەبەسـتمان تـەنیا پاراسـتنی ئاسایشی سنورەکانی هیندمانە، باشـتروایە کـە ئێـران لـەو دۆخـەدا ڕابگـرین کـە

ئێستا تیایدایە، واتـە لـە کەنـەفتی و وەحشی گەریـدا بهێڵینـەوە، وە دوای هـیچ گەلاڵەیەکی تر کە پێچەوانەی ئەو تێزە بێ نەکەوین...))[11].

لەو پەیمانەدا هاتبوو کە هیچ وڵاتێکی ئەوروپی ڕێگـەی ڕۆشـتنی لـە ئێرانـەوە بۆ هندستان نییە، وڵاتی ئێران بەڵێنیدا کە پەیوەندییەکانی زیانی نەبێ بـۆ سـەر ئینگلستان، وڵاتی ئینگلستانیش پەیمانیدا چارەنوسی ئێران لـە کەنـداوی فـارس بپارێزێت[12].

لـۆرد جـۆرج کـرزن، جێگـری پاشـای هنـد، لـە بۆچـونێکدا کـە لـە درێـژەی نامەیەکیدایە کە لە ساڵی ١٨٩٩ ناردویەتی بۆ وەزارەتـی داگیرگـەکانی بـەریتانیا دەڵێت:

((خاڵی سەرەکی دەوڵەتی باڵا، بـەڕێز مەلیکـەی ئینگلیـز ئـەبێ ئـەوەبێ کـە ڕوخسـەت نـەدات، هـیچ دەسـەڵاتێکی ئـەوروپا، بەتایبـەتی، ڕوسـیا چـاوببڕێتە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باشوری ئێران، وە لەم ڕێگایەوە دەستی بگاتـە کەنـداوی فارس، یاخود، تەنانـەت بـەبێ بـوونی پەیوەنـدی وشـکانی لـە کەنـداوی فارسـدا ئاسـانکاری دەریـایی بهێنرێتــەدی))، ئـەوەبوو پـاش سـاڵێك (ولیـام دارسـی)ی نوێنەری بەریتانیا بە هاوکاری سەفارەتخانەی ئینگلیزو میرزا عـالی ئەسـغەرخان، بـە پێـدانی بـەرتیل و فریـودانی سـەربازی، تـوانی ئیمتیـازاتی نـەوت لـە تـەواوی ئێراندا، بەتایبەتی پێنج ویلایەتی باکور بەدەسـت بهێنـێ، ئـەم بۆچـوونەی لـۆرد کرزن، بوە مایەی سەرنجدانی دەوڵەتی بەریتانیاو زەمینەی بۆ پەیوەست بـوونی ئێران بۆ ناوچـەکانی نفـوزی ئینگلیـز زیـادکرد[13]. ئەمـەش لـە کۆتـایی سـەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیـستەم بـوو، کـە نـەوت لـە ناوچـە سـنوریەکانی عوسمانی و ئێراندا دۆزرایەوە، وە ئەو ڕێکەوتنەی نێوان ولیام دارسی و دەوڵەتی قاجاری کە واژۆکرا، بۆ یەکەمجار بوو، نەوت لە ئێـران دەدۆزرایـەوە، بـۆ مـاوەی

شەست ساڵ جیاوکی دەرهێنان و وەبەرهێنانی نەوتی لە باشوری ئێران پێ سپێردرا[١٤]، ئەوەبوو ئەم کۆمپانیایەی ئینگلیز بەڵێنیدا بە حکومەتی ئێران بەپێدانی (٦٪)ی قازانجی نەوتی دەرهێنراو وەك وتمان بۆ ماوەی شەست ساڵ[١٥].

ئەو دەسەڵات و توانایەی کە ئینگلیزەکان لە باشوری ئێراندا هەیان بوو لە سەردەمی (فەتح عەلی شا)وە دەستی پێکردبوو، بەهۆی چەند هەنگاوێکی دۆستانەوە، بەرەوپێش چووبوو، پایەی ئینگلستان لە باشوری ئێراندا بە جۆرێك پتەوبووە کە توانیویەتی کاریگەری لەسەر سیاسەتی ناوەندو باشوری ئێراندا هەبێ[١٦].

هەرەشەی ئەڵمانی و پەرەسەندنی نفوزی ئەڵمانی لە ئەوروپاو ئاسیادا[١٧]، کێشەی سیاسەتی نێودەولەتی ئەوەی دەخواست بەریتانیاو ڕوسیا ململانێ کانیان بخەنە لاوەو ئامانجێکی دیاریکراو بگرنە بەر. ئەوەبوو ئەم کارە بە پشتگیری فەرەنسا، سەرەنجام لە ساڵی ١٩٠٧ بە ئیمزای ڕێکەوتنامەی (نیکۆڵ-سۆن-ئیزۆلنسکی)* شێوەی کاری دیاریکراو[١٨]. ئەم پەیمانە بە پەیمانی (ڕوس-ئینگلین) ناودەبرێت، کە ئێرانی دابەشکرد بەسەر سێ بەشدا، باشوری ئێران درا بە ئینگلیزو باکوریش درا بە ڕوسەکان، ناوەندی ئێرانیش وەك ناوچەیەکی بێ لایەن مایەوە، کاتێ ئەم بڕیارە بڵاوبویەوە، بووە هۆی نارەزایی ناوخۆ (عەلی شای قاجار) هەڵوێستێکی بەرگری کارانەی نەنواند، ئەمەش بووە هۆی داگیرکردنی ئێران لە لایەن وڵاتە داگیرکەرەکان و بە تاڵانبردنی[١٩]، چونکە ناوەرۆکی پەیمانەکە ڕێگای پێ دابوون خاکی ئێران بکەن بە شوێنی مانۆڕانی هێزەکانیان، وە لەم دابەشکردنەی ئێران لە نێوان (ئینگلیزو ڕوس) بەریتانیەکان

قازانجێکی زۆریان دەستکەوت، چونکە ناوچەکانی باشور لە ڕووی سامانی مارییەوە بەتایبەتی پەترۆڵ زۆر دەوڵەمەند بوو[٢٠].

ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٠٩دا کۆمپانیای نەوتی (ئێران–ئینگلیز) پێکهات، بەم شێوەیە لە دوای دۆزینەوەو دەرهێنانی نەوت، ئێران لە گۆڕەپانی دەسەڵاتدارانی جیهانیدا، گرنگییەکی زیاتری پەیداکرد، بەتایبەتی کە بەریتانیا کەشتییەکانی هێزی دەریایی خۆی لە خەڵوزی بەدەوە بۆ نەوت گۆڕی بوو، نیازی دەستگرتن بەسەر کانگا نەوتیەکانی ئێران و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، سیاسەتی ڕەسمی بەریتانیای لەو مەڵبەندەدا دیاریکردبوو[٢١].

دەتوانین بڵێین ئێران لە سەدەی نۆزدەهەمدا بوبوو بە وڵاتێکی وابەستەو نیوە داگیرگەی ڕوس و ئینگلستان، باشترین بەڵگەش نوسراوەکانی ناسرەدین شایە:

((دەمەوێ سەفەوی باکوری وڵات بکەم، سەفیری ئینگلستان بە دەنگ دێ، دەمەوێ بچمە باشور، سەفیری ڕوسانم لێ ڕاست دەبێتەوە، خوا ئەو وڵاتە پاك بکاتەوە، شایەکەی بۆی نییە سەفەری باکورو باشوری وڵاتەکەی بکا..))[٢٢].

کەواتە لە سەردەمی قاجارییەکانەوە، ئینگلیزەکان توانیان بە چەند ڕێگایەکی جیاواز، لەوانە: دەستوەردان لە دەرباری قاجاریەکان بەتایبەتی لە کاتی سەرهەڵدانی شۆڕشی مەشروتە* هەروەها لە ڕێگای دروستکردنی ڕێکخستنە جۆراوجۆر و شاراوەکانی لە ئێراندا (سۆنەری)، ڕۆڵێکی کاریگەری لە بنیادنانی بڕیاردان لە ئێراندا بینی. لە لایەکەوە بە جوڵانەوەو دروستکردنی شۆڕشی ناوخۆیی و هەروەها هێنانی هێزێکی چەکدار لە باشور هەڵی بەدەستهێنا، بە شێوەیەك، کە لە سەردەمی قاجاریەکان دەوڵەتی بەریتانیا لەگەڵ ڕوسیادا یەکێك بووە لەو دوو زلهێزەی کە خاوەنی نفوزێکی زۆر بوون لە ئێراندا[٢٣].

باسکردنی پەیوەندییەکانی ئینگلیز لەگەڵ ئێرانیەکان، پەیوەندی بازرگانی یاخود دیبلۆماسی لە دەست پێکردنیەوە تا سەدەی بیستەم، بابەتی ئاشکراکردنی هەلومەرجی بەستنی هەندێك لە پەیمانەکان، لەوانە(١٩٠٧، ١٩١٩). بەو شێوەیە نێراوەکان پەیوەندی تەواویان بەم بابەتەوە هەیەو هەندێك لەوانە هاندەری تەواوی ئەم پەیماننامانە بوون[٢٤].

کاتێ ڕێکەوتنامەی(پتندان) لە ١٩/ئوت/١٩١١ لە نێوان قەیسەری ئەڵمانیاو ڕوسیا بەسترا، دەوڵەتی ئەڵمانیا، مافی ڕوسیای لەسەر باکوری ئێراندا بە ڕەسمی ناساند، بەو مەرجەی دەوڵەتی ڕوس ئیمتیازاتی ڕێگەی ئاسنی خانەقین، بەسرە، کوەیت بە ئەڵمانیا بدات. تا ئەڵمانەکان بتوانن ڕێگەی ئاسنی (بەرلین–ئەستانبول–بەغدا) بە کەنداوی فارسەوە پەیوەست بکەن و چەند بنکەیەك لەو ناوچانە دروست بکەن. دەوڵەتی بەریتانیا بەمە توشی شکستێکی گەورە بوویەوە، لەگەڵ فەرەنسادا بڕیاریاندا بە هەر ڕێگەیەك بێت دژی ئەم ڕێکەوتنە بوەستنەوەو ناڕەزایی لەسەر دەرببڕن، بە شێوەیەك کە ئەم ڕێکەوتنامەیە بووە هۆی ئەوەی کە پەیوەندییەکانی ڕێککەوتنامەی سێ لایەنە لاوازبێ، ڕوسەکان بە پاڵپشتی ئەڵمانیا سیاسەتێکی سنورلادەرانەو توندتر لە ئاسیادا بەتایبەتی لە ئێران دا بگرێتەبەر، لەوانە: گەڕانەوەی (محەمەد عەلی شا)ی لەسەر کار لابراو و دووبارە هێنانەوەی حکومەتێکی خۆسەپێن لە ئێراندا[٢٥].

لە کۆتایی ساڵی ١٩١١ هێزەکانی بەریتانیاو ڕوسیا هاتنە ناو شارەکانی باکور و باشوری ئێرانەوە[٢٦]. ئەم هاتنە ناوەوەیەیان بووە هۆی سەرهەڵدانی ئاڵۆزییەکی گەورە لە ئێراندا، یەحیا دەوڵەت ئابادی لە یادەوەرییەکانیدا نووسیویەتی:

((ڕۆژی حەوتەمی موحەڕەمی ١٣٣٤/١٩١١ز بوو بە یەکێك لە ڕۆژە مێژووییە گەورەکانی ئێران، ئەو ڕۆژە بووە ڕۆژی ململانێی سیاسی دەوڵەتی، گەنجی ئێران لە هەمبەر ڕوس و بەریتانیا و هاوپەیمانەکانی، کەلوپەلی دەرباری پاشایەتی بە مەبەستی گواستنەوە کۆکرابونەوە و لە لایەن شاوە تەلەگرافێك لەندەن و پترۆگرادکراو تیایدا هاتبوو: لەبەر ئەوەی ڕوس ڕێزی لە ئێران نەگرتووەو بەرەو پایتەخت کەوتۆتە ڕێ، بە پێویستم زانی پایتەخت بگۆڕم، لەم ڕۆژە بە دواوە ئێران لە بەرامبەر هیچ وڵاتێك بەرپرسیار نییە، ئەوەبوو ژمارەیەکی زۆر لە پیاوانی دەوڵەت و ئەندام پەرلەمانەکان تارانیان بەجێهێشت و شۆڕشێکی توند لە تاران دەستی پێکرد. شا ئەندامانی پەرلەمانی ئاگادارکردەوە کە بەرەو ئەسفەهان دەڕوات، باشتروایە ئەوانیش بەرەو ئەوێ بکەونەڕێ، دەنگۆ بڵاوبویەوە کە حکومەت دژی ڕوس و بەریتانیا ڕادەگەنێ، ژمارەیەك لە زانایان و نزیکەی دوو سەد کەس لە کەسایەتیە ناسراوەکان کە دژی سیاسەتی ڕوس و ئینگلیز بوون تارانیان بەجێهێشت و بەرەو قوم کەوتنەڕێ..))[٢٧].

بەریتانیا بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆی لە باشوری ئێراندا (ناصر الملك قراگوزلو)ی دانا بە نائیب سەڵتەنە لە ساڵێ ١٩١١، بەهۆی ئەو سیاسەتەوە بوو ناوبراو تا ساڵی ١٩١٤ کە جەنگی جیهانی دەستی پێکرد، نوێنەری سیاسەتی لەندەن بوو لە ئێران، وە خۆی لە هەر هەوڵدانێك بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا لانەئەدا[٢٨].

بەریتانیاو ڕوسیا تا ساڵی ١٩١٤ لەسەر دەست تێکەڵاوکردن لەگەڵ دەرباری قاجاری ململانێیان دەکرد، بەریتانیا کە لە نفوزی ڕوسیاو هەڕەشەی دەسەڵاتی خۆی لە هندستان و هەوڵ و کۆششی فەڕەنسا بە مەبەستی دابینکردنی هاوکاری

ئێران لە دژی ڕوسیا نیگەران بوو، چەندان شاندی سەربازی بۆ بەهێزکردنی بەرگری ئێران لە بەرامبەر ڕوسیا بۆ دەرباری ئێران نارد(٣٠).

ئەحمەد شای گەنج دەربارەی تێڕوانینی پەرلەمان لەسەر پێشکەوتنەکانی وڵات، بەربەرەکانێی ڕوسەکان و ئینگلیزەکان بە زەحمەت دەی توانی وێنەی خۆی بخاتەڕوو، ئەو کە ئارەزوویەکی زۆری لە پارە کۆکردنەوە هەبوو، لەو دیو بنەمای یاسای بنەڕەتییەوە سەنگەری گرتبوو، هیچ هەنگاوێکی بۆ جڵەوگرتنەوەی دارمانی وڵات دانەدەنا(٣١).

ئینگلیزەکان لە قسەکردن لە جوڵانەوە ئازادیخوازەکان لە باکوری ئێران بێزاربوو بوون، هەوڵیاندەدا کە ئەو بزوتنەوانە سەرکوت بکەن و نەهێڵن پریشکی ئەم بزوتنەوانە بگاتە ناوچەکانی دیکەی ئێران و بگاتە هندستان، بۆیە خۆیان بۆ داگیرکردنی ئێران ئامادەکردبوو(٣٢).

دوو هۆکاری ستراتیجی ئێرانی گۆڕان بۆ شوێنی نەخشەی جەنگی لای بەریتانیەکان:

یەکەم/ بەرگریکردن لە ئیمپراتۆریای هندو دروستکردنی شتێنەیەکی چاك بە نیازی پشتگیری لە ڕەخنەی عوسمانیەکان لە هندستان و دوورخستنەوەی ڕوسەکان لەو ناوچەیە.

دووەم/ بەرگری لە بەرهەمهێنانی نەوت لە سالّی ١٩١٢ کە کەشتییە گەورەکانی بەریتانیا لە خەڵوزەوە گۆڕابوون بۆ نەوت، کە ئەمەش بۆ ئینگلیزەکان گرنگییەکی گەورەی هەبوو(٣٣).

ئێران بەر لە جەنگ هێزێکی چەکداری نارێك و پێك و لاوازی هەبوو، خەزێنەکەی خالّی بوو، دەرباری قاجاری لەوپەڕی گەندەڵیدا بوو، هێزەکانی ڕوسیا لای سەرویان داگیرکردبوو، پاش چەند هەفتەیەك لە جەنگ هێزەکانی

بـەریتانیاش لای خواروویـان داگیرکـرد جگـە لـەوەی پێـشتریش هێزێکـی لـە ئەفغانـستان هـەبوو، شـوێنی جیۆپۆلـەتیکی* ئێـران وا هەکـەوتووە، لـە لای سـەرەوە هاوسـنوری ڕوسـی و لای ڕۆژئـاواش هاوسـنوری عوسمـانی، لـە لای ڕۆژهەڵاتیش هاوسنوری دەسەڵاتی بەریتانی بوو، واتە ئێران بە لایەنەکانی جەنگ دەورەدرابوو(٣٤).

دوای ماوەیەکی کەم لە بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهانی حکومەتی ئێـران بە فەرمی بڕیاری بێ لایەنی خۆی لـە جـەنگ ڕاگەیاند(٣٥). بـەڵام هـیچ دەوڵـەتێك ڕێـزی ئـەم بـێ لایەنیـەی ئێرانـی نـەگرت، حکومـەتی ئێـران خۆشـی ئـەو هێـزە توانایەی نەبوو پارێزگاری لەخۆی بکاو بێ لایەنی خۆی ڕابگرێـت(٣٥). ئەمـە جگـە لەوەی دیبلۆماتەکانی ئەڵمانیاو ئینگلیزو ڕوس لە کاتی هەڵگیرسانی جەنگەکـەدا، چ خۆیان ڕاستەوخۆ، چ لە لایـەن دۆسـت و لایـەنگرە ئێرانیەکانیانـەوە هـەوڵێکی زۆریان دا کە ئێران لە شەڕەوە بگلێـنن(٣٦). هـەروەها بـارودۆخی نـاوخۆی ئێـران شپرزە بوو، خاوەنی هێزێکی نەتەوەیی و حکومەتێکی سەقامگیرو کارامـە نـەبوو کە توانای بەڕێوەبردنی وڵاتی هـەبێ، پیـاوانی نـاودارانی تـارانیش بـەبێ ئـەوەی هەستی وڵاتپارێزی بیان بزوێنێ، زیاتر بیریان لەوە دەکردەوە بۆ سـودی خۆیـان لەچی ڕێگایەکەوە پەیوەندی بە دەوڵەتە گەورەکانەوە بکەن، لە دۆخێکـی ئـاوادا شـتێکی ئاسـایی بـوو دەوڵەتـە سوێندخۆرەکان هـەرگیز ڕێزیـان بـۆ بـێ لایـەنی مانەوەی ئێران دانەدەنا(٣٧). وە بڕیـاری بـێ لایـەنی ئێـران وەك مەرەکـەبی سـەر کاغـەز مایـەوە، زەمینـی ئـەم وڵاتـە بـوە مەیـدانی ململانـێی سـەختی وڵاتـە شەڕکەرەکان، بە جۆرێك کردارە سەربازییەکانی سەر خاکی ئێران تەنها ڕووداوی لابـەلاو هـەروەها بـۆ مەبەسـتی سـەربازی نـەبوون، بـەڵکو ئـەم کردارانـە لـە چوارچـێوەی هـەوڵ و کۆشـشی فـراوانترەوە دەهـاتن و پەیوەسـت بـوون بـە

گرنگیدانی لایەنە شەڕکەرەکان بە بایەخی ستراتیجی ئەو وڵاتە بۆ مەبەستەکانی جەنگ و پێگەی لە نەخشەو پلانەکانی دوارۆژ[٣٨]. شەڕکەران بە ئارەزووی خۆیان، دەستیان دەگرت بەسەر ئەملاو ئەولای ئێراندا، کە دواتر ئەوە سەلمێنرا کە یەکەم گوللەی جەنگی جیهانی لە ڕۆژهەلاتی دوور لە ئێران بووە نەك لە دەریای ڕەش، هێزەکانی ڕوسیاو بەریتانیا و تەنانەت ئەڵمانیاش دەستیان کرد بە ناردنی سیخوڕەکانیان بۆ هەموو شوێنێك کە هاتووچۆیان دەکرد[٣٩]. وە لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، هێزە بەریتانیەکان چوار ناوچەی ئێرانیان بەدەستەوە بوو، کە لە ڕۆژهەلات لە کەنداوی فارسەوە تا مەشهەد لە ڕۆژئاواشەوە لە بەغداد تا کرمانشان و کەناری دەریای قەزوین. باشوری ڕۆژهەلات و باشوری ڕۆژئاواش بەدەست هێزەکانی پۆلیسی باشورەوە بوو[٤٠].

لە ساڵی ١٩١٥ هێزەکانی عوسمانی هێرشیان کردە سەر ناوچەکانی ڕۆژئاوا، دەست و پێوەندەکانی ئەڵمانەکانیش چەك و پارەتیان دەگەیاندە کۆچەرییەکانی باشور، بە وتەی وەزیری بەریتانیا: ((حکومەتی مەرکەزی لە دەرەوەی پایتەخت بوونی نەماوە..))[٤١].

لە ئەنجامی ئەو بارودۆخە خراپەی لە ئێرانی تێکەوتبوو، خەڵکی لە برسێتی و گرانی دا دەژیان، تەنانەت حکومەت نەی ئەتوانی موچەی مانگانە بدات، ڕێژەی هاوردە کەمبویەوە بۆ سێ یەك، هەر بۆیە حکومەتی قاجاری پەنای بردە بەر دەوڵەتی بەریتانیا، لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا، قەرزەکانی گەیشتە حەوت ملیۆن جونەیهی ئیستەرلینی لەگەڵ ملیۆنێك سوری قەرزەکە، حکومەتی ئێران بەلێنیدا بە تەرخانکردنی چارەکێك لە خەزێنەکەی بە چەند قیستێك بۆ قەرزەکانی لەندەن، حکومەتی بەریتانی بەرتیلی بەکارهێنا بۆ ڕوخانی

وازەرەتەکە و دانانی وەزارەتێکی نوێ لە ئێران دا کە زیاتر خزمەت بە بەرژەوەندییەکانی بکات[٤٢].

دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی هێزە لاوازبوو بوو لە بچوکترین کاروباری دەوڵەتدا لە لایەن وڵاتە بیانیەکانەوە بەڕێوەدەچوو موشیر دەولە دوو مانگ سەرۆك وەزیران بوو، بەڵام شوێنەکەی خۆی دا بە عەین دەولە، ئەویش زیاتر لە سێ مانگ بەردەوام نەبوو، دەستی لە کار کێشایەوەو مستەوفی مەمالیك دەسەڵاتی گرتەدەست، لە نێو ئەو حکومەتە لەرزۆکانەیەدا ڕوس و بەریتانیا لە لایەك، عوسمانی و ئەڵمانیا لە لایەکی دیکەوە بەشێکی ئێرانیان داگیرکردبوو[٤٣].

لە نۆڤمبەری/١٩١٥، مستەوفی مەمالیك ویستی ئەحمەد شا لە تاران بباتە دەرەوە، کە هەڕەشەی هێزی ڕوسی لەسەر بوو، بەڵام بەهۆی دەستوەردان و فشاری هێزی ڕوس و ئینگلیز، ئەم کارە سەری نەگرت. لەم ڕێگەیەوە چەند دەوڵەتێك هاتنە سەرکار، کە لایەنگری سیاسەتی ئینگلیز بوون، هەر لەم کاتەدابوو کە ڕێکەوتنامەیەکی نهێنی لە(سانیترسپۆرك) لە نێوان ڕوس و ئینگلیزدا بەسترا، کە ناوچەی بێ لایەنی ئێران خرایە سەر ناوچەی نفوزی ئینگلیز، لە بەرامبەردا ئینگلیزەکان بەڵێنیان دا هەر بەشێك لە خاکی عوسمانی کە دەسەڵاتدارانی ڕووس کۆنترۆڵیان کردووە بیخەنە سەر خاکی خۆیان. بەواژووی ئەم پەیماننامەیە بە ڕێژەی (٣/٢)ی خاکی ئێران کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیزەکان، وە توانیان بە هاوکاری کۆمەڵێك لە سەرۆك وەزیرەکان لەوانە فرمان فرماو وسوقولدەولە و پۆلیسی باشورەوە هەوڵیاندا بۆ پاککردنەوەی ویلایەتەکانی خۆرهەڵات و باشوری ئێران لە پاشماوەکانی ئەڵمانیاو ئەوانەی دژایەتیان دەکردن[٤٤].

مستەوفی مەمالیك بە سەرنجدان لە پەیمانەکانی (١٩٠٧، ١٩١٥)و لـە حاڵـەتی سەرکەوتنی ڕوس و بەریتانیادا، بەشبونی ئێرانی بە کارێکی مسۆگەر دەزانی، لـە لایەکی ترەوە نقوم بوونی یـەك لـە دوای یـەکی کەشـتیە بەریتانیـەکان لـە لایـەن فرۆکە ئەڵمانیەکانەوە وای دەردەخست کە ئەڵمانیا بـراوەی جـەنگ بـێ، خـەڵکی ئێـرانیش بـە گـشتی لـە ڕوس و ئینگلیـز نـاڕازی بـوون و ئـارەزووی چـونەپاڵ ئەڵمانیایان دەکرد، ئەمە وای کرد مستەوفی مەمالیك بڕیار بدات پـەیمانی (ئێـران و ئەڵمانیا) کە چەند مانگێ لەوەو پێش بە نهێنی بەسترابوو، ئیمزای بکا، کە بوە هۆی نیگەرانی بەریتانیا. لە ڕاپۆرتێکی کۆلۆنیل (پات)یش کە بـۆ هەڵـسەنگاندنی بارودۆخی ئێران هاتبوە تاران لـە ڕۆژنامـەی تـایمز لـە (١٠/سـێپتمبەری/١٩١٥)دا بڵاوکرابووەوە، کۆلۆنیل پات ڕاپۆرتێکی ئاراستەی پەلەمانی بەریتانیاکردبوو کـە تیایدا هاتبوو:

((بـە گـوێرەی وێنـای ئێمـە وڵاتـی ئێـران بـێ لایەنـە، بـەڵام لـە ڕاسـتیدا لـە سەرانـسەری وڵات لـە لایـەن گروپـە چـەکداریەکانی ئـەڵمانیاوە داگیرکـراوە، کـە ئێرانیەکان بە مەبەستی تیرۆری بەریتانیەکان ئامادە دەکەن..))[٤٥].

ڕوودانی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ لە ڕوسیا، دەبێتە هۆی کشانەوەی ڕوسیا لە بەرەکانی جەنگ، ڕژێمی بەلشەفیك، بڕیاریدا هێزەکانی خۆی لە ئێران دەربکاو ڕێز لە بێ لایەنی و سەروەری ئێران بگرێ[٤٦]، بەڵام شۆڕش دەرفەتی لـەباری بـۆ جێبـەجێکردنی سیاسـەتە ئیمپریالیـستەکانی بـەریتانیا ڕەخـساند بـەریتانیا لـەو باوەڕەدا بوو کە ئێـران دەبـێ بـە تـەواوەتی لـەژێر دەسـەڵات و هـەژمونی خـۆی دابێت، ئەگەر بتوانێت ئێران بخاتـە ژێـر دەسـەڵاتی خۆیـەوە ئـەوا ئیمپراتۆریـای بەریتانیای مـەزن دوو هێنـدە پـارێزراوتر دەبـێ و بەرژەوەندییـەکانی بـەو پـەڕی باشی دەستەبەرو پارێزراو دەبێ[٤٧].

بە ڕوودانی شۆڕشی ئۆکتۆبەر، ئێران بە یەکێك لە ئاواتە مێژووییەکانی خۆی گەشت، لە لایەك چاوی تەماعی ڕوسەکانی لەسەر هەڵگیرا، لە لایەکی تریشەوە، بەستنی پەیمانێکی دوو قۆڵی لەگەڵ سۆڤیەتدا، پەیمانی دوو قۆڵی (ڕوس-ئینگلیزی) لەسەر هەڵوەشایەوە، بە هەردوولا بەرەی دژی ئینگلیزیان پێکهێنا[٤٨].

لەم کاتەدا دەوڵەتی بەریتانیا براوەی سەرەکی جەنگی جیهانی و بەهێزترین ئیمپراتۆریای دنیا بوو، بە لەناوچوونی ڕوسیای تزاری کە گەورەترین ڕکابەری بەریتانیا بوو، ئیتر هێزێکی دیکە نەبوو بتوانێ لە بەرامبەر خواستەکانی ئەم دەوڵەتەدا بەرگری بکا[٤٩].

چۆلکردنی ئێران لە لایەن سوپای ڕوسیاوە، دوای ئەویش شکستی ئەڵمانیا لە ١٩١٨، ڕێگایدا بە بەریتانیا کە سەرانسەری ئێران بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، تەنانەت لەشکرکێشی بکاتە سەر قەفقاسیاو تورکمانستان، چۆلکردنی سەربازەکانی ڕوس لە پایزی ١٩١٧ دەستی پێکردبوو، لە کۆتایی ١٩١٨ بەواژۆی ڕێکەوتنامەی (برست-لینۆڤسك)* کۆتایی پێهات، ئینگلیزەکان بە ڕوودانی ڕووداوەکان و دروست بوونی پاشاگەردانی لە باکوری ئێران لە لایەکەوە خۆشحاڵ بوون، لە لایەکی تریشەوە توشی شڵەژان بوون، بۆیە چەند هەنگاوێکیان نا لەوانە:

١- ئەو دوو سەد هەزار تمەنەی کە هاوکاری بوو بۆ لەشکری قۆزاق*، بە هاوبەشی هەردوو دەوڵەتی ڕوسیاو ئینگلیز، ئینگلیز یەکلایەنە گرتیە خۆی.

٢- پێگەی سەرەکی بەهێزی باکوری ئێرانی گواستەوە بۆ قەزوین.

٣- وسو قولدەولەی کردە سەرۆك وەزیران[٥٠]، لەبەر ئەوەی بەریتانیا بەهۆی کشانەوەی ڕوسیاوە نەی ئەتوانی ڕێکەوتنی (١٩٠٧ و ١٩١٥) دەربارەی

دابەشکردنی ئێران جێبەجێ بکا، ئەی ویست ڕێکەوتنێکی تر بەسەر ئێراندا بسەپێنێ و بەکردەوە بیخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە[٥١].

پێشڕەوی و سوقولدەولە لە نێوان مانگی حوزەیرانی ١٩١٦ هەتا ئایاری ١٩١٧ یەکەم کابینەی خۆی پێکهێنا بوو، هۆگرییە سیاسیەکانی خۆی بۆ پاراستنی پەیوەندییە دۆستانەکان و هاوکاری لەگەڵ بەریتانیادا نیشان دابوو، لە ١٩١٨ لە دوای ڕوخانی کابینەکەی (عەلائوسولتەنە) سەر لەنوێ ئەرکی کابینەی لە لایەن بەریتانیاوە پێ سپێردرایەوە، دەوڵەتی بەریتانیا، بۆ پشتگیری لە وسوقولدەولە، بەڵێنی پێدابوو یارمەتیەکی پانزە هەزار تمەنی مانگانە بدات بە دەوڵەتی ئێران، بەو مەرجەی کابینەکە پێکبهێنی[٥٢].

لەم کاتەدا لۆرد کرزن کە گەشتبوە پلەی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا، هەلێکی زێرینی بەدەستهێنا بۆ ئەوەی خەونەکانی دەوڵەتی بەریتانیا لە بارەی ئێران، قەفقاسیا، تورکمانستان، بخەنە قالبی جێبەجێکردنەوەو دروستکردنی کۆمارە سێ لایەنەکەی ئازەربایجان و ئەرمەنستان و گورجستان، بە هاوکاری مادی و نیزامی ئینگلیزەکان بوو کە بەشێك بوو لەو پلانەی دانرابوو، وە بەشێکی تریان ناردنی هێزێکی ناوەندی ئێران بوو بۆ تورکمانستان و ئاسیای ناوەند بۆ ئەوەی ئەو ناوچانەی کە هێزی ڕوسیای تزاری چۆلیان کردبوو بەبێ هیچ کێشمە کێشمێك داگیری بکات[٥٣].

لە هاوینی ١٩١٨ ئینگلیزەکان توانیان پێگەی ڕوسیا لە دەریای قەزوین کۆنترۆڵ بکەن، بە وتەی خۆیان بۆ ئەوەی بتوانن بە وێرانکردنی ناوچە ستراتیجییەکانی ڕوسیا پشتێنێکی تەندروست لە بەرامبەر مەترسی بڵاوبونەوەی کۆمۆنیست دروست بکەن[٥٤]، لە نیوەی ساڵی ١٩١٨ هەموو خاکی ئێران لەژێر چاودێری ئینگلیزەکان دابوو[٥٥].

## باسی دووەم

## پەیوەندییەکانی ئێران و بەریتانیا لە کۆتایی هاتنی جەنگەوە تا کودەتای فێبرایەری ١٩٢١

سەرەڕای ڕاگەیاندنی بێ لایەنی خۆی لە جەنگدا، بەڵام زەویەکانی دەوڵەتی ئێران بووبوونە ناوچەی جەنگ، بە درێژایی ساڵانی جەنگ، هەر بۆیە کاتێ لە جەنگ هاتە دەرەوە، بێ هێزو بێ دەسەڵات و بێ چەك بوو، لە ئەنجامی جەنگدا گۆڕانکاری کرا لە تەرازووی هێز لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دا بەتایبەتی بەشە ڕۆژهەڵاتیەکەی، ئەوەبوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ڕووخاو ئەڵمانیا شکستی هێناو کۆتایی بە ڕوسیای قەیسەر هات، ئەمە وایکرد دەرگاکانی ناوچەکە زیاتر بە ڕووی بەریتانیادا بکرێتەوە، بەهۆی سیاسەتە فێڵبازەکەیەوە، توانی چەند سودێکی دەست بکەوێت بەتایبەتی لە کەنداوی فارس وە نەوتی ئێران ڕۆڵێکی گەورەی ئەبینی لە گرەنتی سەرکەوتن بۆ ئینگلیز، بەریتانیا زیاتر پێویستی بە سەرچاوەکانی وزە هەبووەو بەشێکی گرنگ بووە لە ناوچەکانی کەنداوی فارس لە باشور[٥٦]، بۆیە دەبینین لە پاش دەرچوونی لە جەنگدا وڵاتێکی پارچە پارچە کراو بوو، تارانی لێ دەرچێ سەرتاپای خاکی ئەم وڵاتە داگیرکرابوو[٥٧].

لە دوای جەنگ هەلومەرجێکی نوێی نێودەوڵەتی دروست بوو، بەهۆی بایەخی ستراتیجی ئێران لە گۆشەنیگای بەرژەوەندییەکانی بەریتانیاوە، بەم پێیە ئەم وڵاتە لە ڕووی شوێنگەی جوگرافیەوە، ئەڵقەی بەیەکگەیشتنی نێوان یەکێتی سۆڤیەت و کەنداوی فارسی و هندستانی پێکدەهێنا، ئەمەش وای لە بەرپرسانی بەریتانیا کرد هەوڵی ئەوەبدەن ئێران بکەنە بەربەستێك لە ڕووی ڕوسیای سۆڤیەتی کە جێگای نیگەرانی بوو بۆ بەریتانیا، چونکە بەریتانیا دەمێك بوو، بەرژەوەندی ئابووری لە ئێراندا هەبوو، بەتایبەتی بەرژەوەندییە

نەوتییەکانی، لە ئەنجامی هەموو ئەمانەدا، پاراستنی یەکێتی خاکی ئێران و کارکردن بۆ ڕزگارکردنی لەو هەلومەرجەدا تەپیوەو سەپاندنی ڕژێم و ئاسایش تیایدا، چەند خاڵێکی گرنگیان لە سیاسەتی بەریتانیا لە هەمبەر ناوچەکە پێکدەهێنا[٥٨].

ئێران دوای تەواوبوونی شەڕ زۆر پشتی بە یەکێتی سۆڤیەت ئەستور بوو چونکە دەیزانی بەریتانیا لە ترسی زیاتر نزیك بوونەوەی ئێران لە سۆڤیەت ناوێرێ وەك ڕابردوو گوشاری زیاتری بخاتە سەر[٥٩].

لە کانوونی دووەمی ١٩١٩دا کۆنفرانسی ئاشتی پاریس لە کۆشکی ڤێرسای پێکهێنراو دەوڵەتی ئێران بڕیاریدا نوێنەرایەتی خۆی بنێرێت و خواستەکانی خۆیان لە دەوڵەتە ڕزگارکەرەکانی ئاشتی بگەیەنن، هەر بۆیە نوێنەرایەتیەك لە ئێرانەوە بۆ فەرەنسا ڕۆیشت بە مەبەستی بەشداری لە کۆنفرانسی ئاشتیدا بە سەرۆکایەتی (مشاور ئەلمەمالیك ئەنساری) وەزیری دەرەوەو دیبلۆماتی خاوەن ئەزموون. وە بە ئەندامێتی(محەمەد عەلی فەروغی) سەرۆکی دیوانی باڵای وڵات و (حسێن موعین ئەلوەزارە)ی وەزیری پێشوو، بەڵام دەوڵەتی بەریتانیا داوای لێبوردنی لە قبوڵکردنی نوێنەرانی ئێران کردو وەبیری هێنانەوە کە کۆنفرانسەکە تایبەتە بە وڵاتە ناکۆکەکان، ئێران بە ڕەسمی لە جەنگی جیهانیدا بێ لایەن بووە، هەرچەندە ئێران بە درێژایی جەنگەکە شوێنی هێزە ناکۆکەکان بووەو دوچاری زیانێکی زۆری دارایی و گیانی هاتووە کە بەسەریدا سەپێنراوە[٦٠]. بەریتانیا نەی هێشت ئێران لە کۆنفرانسی ئاشتیدا بەشداربێ، لە ڕاستیدا بەریتانیا دەی ویست ئێران دووربخاتەوە لە هەموو جۆرە هاوبەشییەك لە کاروباری باسکردنی پاشەڕۆژی سیاسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست[٦١].

نوێنەرایەتی ئێران کە بێ هیوا بوون لە بەشداری کردنیان لە کۆنفرانسدا، بۆیە داواکارییەکانی خۆیان لە دوو توێی چەند بەشێکدا بڵاوکردەوە، بۆ چەند دەستەیەك لە نوێنەرانی ناو کۆنفرانسەکەیان نارد، ڕەتکردنەوەی توندی ئینگلیز بۆ لەسەر کارلادانی (مشاور ئەلمەمالیك) لە لایەن وەزارەتی کاروباری دەرەوەو بەهۆی پشتگیری وسوق دەولەوە بووە هۆی ئەوەی کە کارەکە توشی شکست بێت[٦٢].

وسوق ئەلدەولە لە ئەنجومەن پشتیوانی لێ نەکراو بە ڕوشکاوی گەڕانەوە بۆ تاران[٦٣]. هەرچەندە نوێنەرایەتی نێراوی ئێران بۆ کۆنگرەی ئاشتی* لە پاریس یادداشتێکیان پێشکەش کرد، کە تیایدا داوای کۆبونەوەو خستنەپاڵی هەریەك لە هەرێمەکانی ئەریڤان و ئەغجەوان و ناوچەکانی دیکەی موسوڵمان نیشینیان دەکرد بۆ ئێران، بەڵام بەریتانیا هۆشداری دایە فەرمانڕەوایانی ئێران بە لەبیرکردنی ئەو کارە[٦٤].

ئێران لەگەڵ بوونی سەرپێچی بەریتانیادا پێداگری لەسەر بیروباوەڕی خۆی کردو پێشوازی کرد لە دروستبوونی کۆمەڵەی گەلان وەك ئەندامێکی ئەو کۆمەڵەیە هەوڵیدەدا، لە پرۆسەی کۆتایی پێهێنان بە جەنگ و سەقامگیرکردنی ئاشتی ڕۆڵی کارا بگێڕێ، ئەوەبوو لەگەڵ پێکهێنانی کۆمەڵەی گەلان بە ڕەسمی داوا لە ئێران کرا، بەشداری لە کۆبوونەوەکانی کۆمەڵەدا بکا، (عەلی قولی خان نەبیلۆلدەولە)ی بەرپرسی ئێران لە واشنتۆن وەك نوێنەری ئێران لە دوو کۆبونەوەی یەکەمدا بەشداری کرد، ئێران تەنها وڵاتی موسڵمان بوو کە لە کۆمەڵەی گەلان دا ئامادەیی هەبوو، لە کۆبونەوەکاندا، مەسەلە گرنگەکانی ئەو کاتەی ئێرانی خستەڕوو (شکاتی لە یەکیەتی سۆڤیەت و مەسەلەی بەحرەین و..هتد)[٦٥].

ئێران لەو هەلومەرجەدا تەوەقوعاتی چوو بووە سەر دەیویست بە ڕازیکردنی ئینگلیز سنوری خۆی بەرفراوان بکاتەوە، لە ڕۆژهەلات دا بیگەیەنێتە سەر چەمی

جەیحون و لانکی شارستانیەتی ئێرانی سەدەی (٩، ١٠)ش لە سەمەرقەندو بوخارا زیندوو بکاتەوە ! لە رۆژئاواش دا دیاریەکرو موسڵ و فورات وەبەرخۆی بدات و بیگەیەنێتەوە بۆ سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ساسانی، ئەم بانگەشانەی ئێران هێنابویە گۆڕێ وڵاتە سوێندخۆرەکانی سەرسوڕماو کرد(٦٦).

دوای ئەوەی وسوق ئەلدەولە دەسەڵاتی گرتبووە دەست دانوستانەکان بۆ ئیمزاکردنی ڕێکەوتننامەیەك لە نێوان ئێران و بەریتانیا دەستی پێکرد، لە میانەی ئەو گفتوگۆیانەدا دوو کەس لە وەزیرانی کابینە واتە (نوسرەت ئەلدەولە) کە وەزیری داد بوو دواتر بووە وەزیری دەرەوە، ئەکبەر میرزا (سارم ئەلدەولە)ی وەزیری داراییش تیایدا بەشدار بوو، ڕەشوەیەکیش لە لایەن بەریتانیاوە درا بەو دوو وەزیرەی کابینەکەی وسوق ئەلدەولە. چونکە پێشبینی دەکرا ئیمزاکردنی ڕێکەوتنامەیەکی لەو جۆرە مەترسی بۆ گفتوگۆکارەکانی دروست بکات، لەبەر ئەوە ئەو وەزیرانەی کە ڕێکەوتنامەی ١٩١٩یان ئیمزاکرد، هەق دەستێکی کاش (نقد)یان وەرگرت. وسوق دەولە و سارم دەولەو نوسرەت دەولە لە ئەنجامی کارەکەی خۆیان دەترسان کە بەر لە پەسەندکردنی ڕێککەوتنامەکە لە پەرلەمان دا لە ئێراندا شۆڕشێك ڕووبدات و دەسەڵات بکەوێتە مەترسییەوە گەر بکەوێتە دەستی دیموکراتەکان و ملیۆنەها توندڕەو کە لەو حاڵەتەدا چارەنووسی هەر سێکیان دیاربوو چی لێ دێ، هەر بۆیە بۆ پاراستنی داهاتووی خۆیان داوای دوو ئیمتیازیان لە بەریتانیا کرد:

١- بەڵێننامەیەکی نوسراو لە لایەن حکومەتی بەریتانیاوە سەبارەت بەوەی ئەگەر لە ئەنجامی ئیمزاکردنی ڕێکەوتنامەکە لە ئێراندا شۆڕشێك ڕووبدات و ڕووخانی حکومەتەکەی وسوق دەولەی لێ بکەوێتەوە. حکومەتی بەریتانیا،

هەرسێکیان وەك پەنابەری سیاسی پەسەند بکا لە یەکێ لەو وڵاتانەی لەژێر دەسەڵاتی دایە.

٢ موچەیەکی یەکسان لەگەڵ ئەو پارەیەی لە ئێران دا بۆیان لە ماوەی دوورخرانەوەیان پەنابەرێتیان لە لایەن بەریتانیا دەدرێ بە هەر سێ وەزیرەکە[٦٧].

ئەم پەیمانە کەرەسەی کاری لۆردکرزن بوو لەگەڵ حکومەتەکەی وسوق دەولەدا، وە حکومەتی ئینگلیز سیاسەتی خۆی لە وتارێکی ڕادیۆییدا بەم شێوەیە شی کردبوویەوە:

((سیاسەتی ئینگلیز لەسەر ئێران دامەزراندنی پەیوەندی دۆستانەیە، سیاسەتی ئینگلیز لەسەر ئێران لە ڕووی نیەت پاکییەوەیە، واتە بەرژەوەندیمان لەوەدایە کە ئێران سەربەخۆیی پارێزراوبێت، ئاسایشی تیادا بەرقەرار بێت، چونکە ئێران جگە لەوەی کە دەروازەی هندستانە، دەروازەی هەموو (ئاسیا)شە، سەربەخۆ نەمانەوەو ئاڵۆزی لەو شوێنەدا نەك هەر زەرەری ئێمەیە، بەڵکو زۆریش ترسناکە، ئەمە سیاسەتی دەوڵەتی ئینگلیزە بەرامبەر بە ئێران، کەواتە دەوڵەتی ئینگلیز ئەوەندەی بۆی بکرێ دەست لە کاروباری ناوخۆی ئێران وەرنادات))[٦٨].

برسی کۆکس وەزیری دەسەڵاتداری بەریتانیا لە تاران ئیمزاکەری ڕێکەوتنامەکە لە نامەیەکی ڕەسمیدا بۆ وسوق دەولەو دوو وەزیری ناوبرا، پشتگیری دەوڵەتی بەریتانیای پێ ڕاگەیاندن ئەو نامانە بە تەواوەتی بە شێوەیەکی نهێنی نێردرابوون بۆ ئەو سێ وەزیرە، دەقی ناوەکە بەم شێوەیە بوو:

بەڕێز:

گەلێك خۆشحاڵم بەوەی بە ئاگاداری جەنابی خاوەن شکۆتان بگەیەنم کە دەوڵەتی خاوەن شکۆ (پاشای بەریتانیا) ڕێگەی بەمن داوە پێتان ڕابگەیەنم کە

بەرەچاوکردنی ئەو ڕێکەوتنامەیەی (٩/ی حوزەیرانی/١٩١٩) لە نێوان دەوڵەتی پاشایەتی مەزن و دەوڵەتی ئێراندا ئیمزاکرا، دەوڵەتی بەریتانیا ئامادەیە ئەوپەڕی پشتگیری و خۆش خزمەتی خۆی بخاتە خزمەت جەنابی خاوەن شکۆ و لە داهاتووشدا بە مەرجێك پێویست بێ، پەنابەرێتی سیاسی لە ئیمپراتۆریای بەریتانیادا بدات بە جەنابی خاوەن شکۆ.

لەگەڵ ڕێزمدا

برسی کۆکس

بەڵام سەبارەت بەو داوایەیان کە لە ماوەی پەنابەرێتییەکەیاندا موچەیەکی یەکسان کە لەگەڵ داهاتی موڵك و ماڵەکانیان لە تاران، ئەسفەهان، هەمەدان پێیان بدرێ بە ڕاشکاوی ڕەتکرایەوە[٦٩].

ئەوەبوو لە ٩/حوزەیرانی/١٩١٩ بە هاوپشتی فەرەنسا و بەریتانیا ڕێکەوتنامەکە لە نێوان وسوق دەولەو بەرپرسانی بەریتانیادا واژۆ کرا[٧٠]. بەریتانیا لەم ڕێکەوتنامەیەدا هەوڵی داوە چەشنە سیستەمێکی ڕاوێژکاری لە ئێران دروست بکاو ئێران بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە[٧١].

خاڵەکانی ئەم ڕێککەوتنامەیە، بەم شێوەیەی لای خوارەوەبوو:

١- دەوڵەتی بەریتانیا زۆر ڕاشکاوانەتر بەڵێنەکانی پێشووی خۆی سەبارەت بە ڕێزگرتن لە سەربەخۆیی و یەکپارچەیی خاکی ئێران دووپات دەکاتەوە.

٢- بەریتانیا ئامادەیە چەند ڕاوێژکارێکی پسپۆڕ کە بۆ پێویستی دامەزراندنی ئەوان لە ئیدارە جۆراوجۆرەکاندا، لە نێوان هەردوو وڵاتدا ڕێکەوتنیان لەسەر کرابێ و لە ئەستۆی ئێران دەستەبەریان دەکا، وە ئەو ڕاوێژکارانە بەپێی گرێ

بەست بەکرێ دەگیرێن و دەسەلاتی پێویستیان پێ دەدرێ، چۆنیەتی ئەو دەسەلاتە دەگەڕێتەوە بۆ نێوان ئێران و ڕاوێژکارەکان.

٣- دەوڵەتی بەریتانیا کاربەدەستان و ژێرخان و پێویستییەکانی ڕژێمی تازە بۆ پێکهێنانی هێزێکی یەکپارچە کە دەوڵەتی ئێران بە نیازە بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوخۆ و سەرسنورەکان دروستی بکات، لەسەر خەرجی ئێران دەستەبەری دەکا. ژمارەو بڕی پێویستی کارەبەدەستان و چەك و چۆلەکان لە لایەن لێژنەیەکەوە کە لە پسپۆڕانی بەریتانیاو ئێرانی پێکدێ بۆ دیاریکردنی پێویستییەکانی وڵات بۆ پێکهێنانی ئەو هێزە دیاری دەکرێ.

٤- بۆ دەستەبەرکردنی ئەو پێویستی و کەلوپەلانەی بۆ چاکسازیەکان لە ماددەی (٢، ٣)ی ئەم ڕێکەوتنەدا ئامـاژەی پـێ کـراوە، دەوڵەتی بەریتانیا ئامادەیە قەرزێکی گونجاو بۆ دەوڵەتی ئێران ئامادەبکا یاخود هەلی ئەنجامدانەکەی برەخسێنێ، گرەنتی ئەو قەرزەش لەسەر ڕێکەوتنی هەردوو وڵات لەسەر گومرگ یان هەر شتێکی تر کە لە دەسەلاتی دەوڵەتی ئێران دابێ، دیاری دەکرێ.

٥- بەریتانیا بە دانپیانانی تەواو بە پێویستیيە خێراکانی دەوڵەتی ئێران بۆ پێشکەوتنی کەرەستەکانی گواستنەوە کە دەبێتە هۆی گەشەسەندنی بازرگانی و ڕێگرتن لە قات و قڕی لە وڵاتدا، ئامادەیە لەگەڵ دەوڵەتی ئێران ڕێکبکەوێ و هانیان بدات بۆ هەنگاوی هاوبەشی ئێران و بەریتانیا بۆ دامەزراندنی هێڵی ئاسنی یاخود جۆرەکانی تری کەرەستەکانی گواستنەوە.

٦- هەردوو دەوڵەت ڕێکدەکەون لەسەر دیاریکردنی پسپۆڕان بۆ پێکهێنانی لێژنەیەك کە چاو بەسەر داهاتە گومرگیەکان دا بخشێنێتەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ

بەرژەوەندییە یاساییەکانی ولاّتدا، هەروەها پێویستیەکانی گەشەسەندنی ولاّت زیاتر بگونجێ، ئەمەش بە هاوکاری هەردوولا ئەنجامدەدرێ[72].

ئەم ڕێکەوتنامەیە بۆ ئەوەی ببێتە ڕێکەوتنامەیەکی یاسایی، پێویست بوو لە لایەن پەرلەمانی تارانەوە، پەسەند بکرێ، بەریتانیەکان دەیانزانی ڕای گشتی ئێران نارەزایی لەسەر دەردەبڕن، بڕیاریاندا بەر لەوەی بگاتە پەرلەمان، ڕێکەوتنامەکە ئیمزا بکەن و زۆر بە خێرایی کاریان لەسەر جێگیرکردنی ڕژێمی چاودێری کرد، کە لەگەڵ وسوق دەولەو دوو هاوکارە سەرەکیەکەی لەسەری ڕێکەوتبوون[73].

ڕێکەوتنامەی ناوبراو زۆر هاوشێوەی ئەوەبوو کە ئێران بکەوێتە ژێر دەسەلاّتی بەریتانیا، بەهۆی ئەم تیۆریانەوە ئینگلیز دەستیگرت بەسەر تەواوی ڕێکخستنە سەربازی و داراییەکانی ئێران و وە کەوتە ژێر دەسەلاّتی ڕاوێژکارو ئەفسەرانی ئینگلیز، لە بەرامبەردا ئینگلیز بەڵێنیدا بە پێدانی دوو ملیۆن لیرە بە قەرز بە ئێران، هەروەها بژاردنی ئەو وێرانکاریەی کە لە ئێراندا لە ساڵانی جەنگدا دروست بوو بوو وە لە بنیاتنانی ڕێگەی ئاسن و ڕادەربڕین لە بارەی دروستکردنی گومرگ دا هەنگاوی باشی نا[74].

سەربەخۆیی کلتوری و پەروەردەیی ئێرانیش لە دوای ڕەسمی بوونی ڕێکەوتنامەی ١٩١٩ لە ناوچوو، ئێرانیەکان ناچاردەبوون سیاسەتی زانستی و کلتوری خۆیان بەو شێوەیە کە بەریتانیا دەیویست نەك لەو جۆرەی لە قازانجی خۆیان بوو دارێژن و ڕێکی بخەن، دامەزراندنی مامۆستاو پسپۆڕە زانستیەکان ئەگەر لە لایەن بەریتانیاوە دانیان پیادا نەنرابایە تەنانەت لەو حاڵەتەشدا کە ئەو وڵاتە لە ڕووی زانستی و ژیاری و کلتوریشەوە لە بەریتانیا سەرتر بوایە، ڕێگەی پێ نەدەدرا، بە کورتی مەبەستی بەریتانیا لە پەیمانی ١٩١٩ دروستکردنی

ئێرانێك بوو كە خاوەن دەسەڵاتێكی ناوەندی بەهێزو لە لایەكی ترەوە گوێ ڕایەڵی بەریتانیا بێ، سوپایەكی گەورەی هەبێ بۆ ئەوەی ئاسایش و سەقامگیری لە وڵاتدا، بەدی بهێنێ و لە هەمان كاتدا، ئەو وڵاتە نەك تەنها پەیوەندییەكی نزیك و دۆستانەی لەگەڵ بەریتانیادا هەبێ، بەڵكو دەست نیشانكراوی خۆی بێت، بۆ ئەوەی بەریتانیا بتوانێ بەبێ كەڵك لە بەرژەوەندیەكانی خۆی دەستەبەر بكاو بیكاتە پێگەیەك بۆ بەرگری لە هندستان(٧٥).

ڕاستەوخۆ پاش ئەوەی ڕێكەوتنامەكە واژۆكرا بەر لەوەی بخرێتە بەردەم كۆنگرە، دەوڵەتی بەریتانیا ڕاستەوخۆ دەستی بە جێبەجێكردنی كرد. لۆردكرزن لەم بارەیەوە وتارێكی بۆ هاوكارەكانی لە كابینەی ئینگلیزدا ووت كە ئەمە دەقەكەیەتی:

((ئێمە لە ڕێكەوتنێكدا لەگەڵ ئێراندا ڕێكەوتوین لەسەر بنەمای ئەوەی كە لە ئایندەدا، بەرژەوەندییەكانی بەریتانیا لەم بەشەی جیهاندا لە بەرامبەر ئەو كەوتن و وێرانكاریەی دواییدا، بپارێزێت و هەروەها دەوڵەتی ئێران بە شێوەی چارەسەر وەنەگری لاوازو بێ هێز لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێ و پشتگیری دەكرێ، تا ئەم وڵاتە بتوانێ پێگەی خۆی لە نێوان دەوڵەتانی دەسەڵاتداردا بپارێزێت...))(٧٦).

یەكێكی تر لەو پلانانەی لە پاش دەستگرتن بەسەر لایەنە دارایی و سەربازی و سیاسییەكانی ئێران، لەناوبردنی ناوەندگەرایی سیاسی لە ئێران و دابەشكردنی خاكی وڵات بوو بەسەر چەند ناوچەیەكی (بەشیوازو مۆدێلی وڵاتانی ڕاجەنشینی هند) بوو، بە جێبەجێكردنی ئەم پەیمانە، خۆزستان دەبووە وڵاتێكی نیوە سەربەخۆ لەژێر دەسەڵاتی (شێخ خەزعەل* و كوڕەكەی) وە ئەو ڕێككەوتنامەیەش كە خودی بەریتانیا لە ڕابردوودا لەگەڵ شێخ خەزعەل و

بەختیارییەکان دا موری کردبوو، بە ڕەسمی دەناسرا، بەم شێوەیە پارێزگاری خۆزستان کە یەکێ لە دەوڵەمەندترین سەرچاوەکانی داهاتی وڵات بوو، هەروەها پەتکە دەماری ئابوری ئێرانی لەو کاتەدا پێکدەهێنا، بۆ هەمیشە لە دەست دەچوو و دەبووە شێخ نشینێکی وەك ئیمارات و کوەیت، بەشێکی تر لە ویلایەتە گرنگەکانی وەك: لوڕستان، فارس، سیستان، بلوجستان، بڕیاربوو لە لایەن ئەمیرە خۆجێییەکانەوە بەڕێوەبچێ، بەڵام لە خاکی ئێران جیانەکرێتەوە[٧٧].

پاش ئەوەی هەواڵی ئەم ڕێککەوتنامەیە بڵاوبویەوە لە ڕۆژنامەکانی ئەمەریکاو فەڕەنسا، زریانێك لە ڕق و کینە لە ئێران دا سەریهەڵدا، دەوڵەتانی ئەمریکاو فەڕەنساش کە لە پلانە خۆویستەکانی لۆردکرزن ناڕازی بوون، ئەوان چواردە بەندە پێشنیارکراوەکەی وڵسن* لە بارەی کۆمەڵەی نەتەوەکانەوە بە بەرژەوەندی خۆیان کە لە دژی ئەم ڕێککەوتنامەیە بوەستنە (لانسینگ) وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە وەڵامێکدا بۆ لۆردکرزن کە هاوکاری ئەمەریکای ویستبوو بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا لە ئێران ((بەبێ هیچ دوودڵەیەك وەڵامی نیەو هەوڵدەدا ئەو گومانە ناڕازی بوونەی کە لە نێوان ئێرانیەکان بەرامبەر ئەمریکا دروست بووە، نەهێڵێ))[٧٨].

بالیۆزی ئەمەریکا لەو ڕووەوە بەیانێکی بڵاوکردەوە کە تیایدا هاتبوو: ((ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لای سەیر بووە، لە هەواڵی بەستنی پەیماننامەیەکی نوێ لە نێوان ئێران و ئینگلیزدا)) ئەمریکا هانی هەندێ لە چینە نەیارەکانی ئێرانیدا بۆ توندکردنەوەی هەڵوێستیان لە بەرامبەر حکومەتی وسوق دەولە، ڕۆژنامە بەریتانیەکان لەو ڕۆژگارەدا بەستنی ئەم پەیماننامەیەیان بە ئاسانی لە قەڵەمدا، وایان دادەنا کە کاریگەری لەسەر هیچ دەوڵەتێکی بێگانە نابێ، هەروەها لۆردکرزن هەڵوێستی توندی واشنتنی کەمکردەوە لە بەرامبەر پەیمانەکەداو ڕوونی کردەوە کە ئەمریکا ئاگاداربووە لە گفتوگۆی بەریتانیا لەگەڵ ئێران[٧٩].

لەو بانگەوازەی کە ئەمریکا لە ١٩/سیبتامبەری/١٩١٩دا بڵاویکردەوە تیایدا هاتبوو نارەزایی دەربڕیوە بەوەی کە ئینگلیزەکان لە دژی دەستەی نوێنەرانی ئێران لە کۆنفرانسی ڤێرسایدا، هۆکارەکەی بۆ ئەوە گێڕایەوە کە ئێرانی دەخستە چوارچێوەی ئەو دەوڵەتانەی کە ڕاپەڕینیان تیادایە و دەسەڵاتیان لاوازە، بڵاوکراوەکانی فەرەنساش هێرشێکی توندیان کردە سەر ڕێکەوتنامەکەی ئێران و ئینگلیز وسیاسەتی داگیرکارانەی لۆردکرزن، هەروەها پشتگیری ئێرانیان کرد[٨٠]، کەواتە دوای بڵاوبونەوەی ڕێکەوتنامەکە چ لە ئێران و چ لە ئەوروپا ژمارەیەك وتاری زۆر لە دژی ڕێککەوتنامەکە نوسراوە، تەنانەت لە ئێران چەندین کتێب لەو بارەیەوە نوسراوە، کە هەموویان ڕەخنە بوون لەسەر ئەو ڕێکەوتنە، وسوق دەولە بۆ ئەوەی چەند ملیۆنێك لیرە بە قەرز وەربگرێت و دەسەڵاتەکەی خۆی پێ تۆکمە بکا، ئامادەبوو بەبێ ئەوەی پەرلەمان قسەی لەسەر بکات، هەروەها بە پێچەوانەی یاسای بنەڕەتی ڕێکەوتننامەیەك لەگەڵ بەریتانیا واژو بکا کە واتای تەسلیم کردنی وڵاتەکەی بووە بە بێگانە[٨١].

ساڵی ١٩١٩ ئەوەندەی نەمابوو کە ئێران بفرۆشرێت بە ئینگلیز، ئینگلیز هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدابوو کە پارێزگاری لە ناوچەکانی هندو کۆمپانیای نەوتیەکانی بکا لە ئێراندا، پاشانیش دەست بەسەراگرتنی وڵاتانێکی پڕ لە سامان و دێرینی وەك ئێران بەدیبهێنێ[٨٢].

هەڵوێستی خەڵکی ئێران زۆر قوڵ و بە تەوژم بوو، دژی ڕێکەوتنامەکە بوون، و سوق دەولە لە پاش چەند مانگێ بەسەر ئیمزاکردنی ڕێکەوتنامەکەدا ڕاگەیەنراوێکی بڵاوکردەوە لەگەڵ باسێکی تێروتەسەل سەبارەت بە بارودۆخی وڵات نووسی: کە ئێستا مانگێ بەسەر ئیمزاکردنی ڕێککەوتنامەکەدا تێپەڕیوەو لەو مانگەدا هەموو جۆرە دەرفەتێك بۆ دەربڕینی بۆچونەکانی خۆیان خراوەتە

بەردەستی خەڵك، وسوق دەولە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە زۆرینەی خەڵکی ئێران، هاودەنگن لەگەڵ ئەو رێککەوتنامەیە، تەنها ژمارەیەکی کەم نەبێ کە دژی منن و بە ئەنقەست لە دژی رێککەوتنامەکە دەجوڵێنەوە، دوای ڕاگەیاندنی بڵاوکراوەکە وسوق دەولە هاتوچۆی لە تاران قەدەغەکردو ژمارەیەکی زۆری دەستگیرکردو دوری خستنەوە، بەڵام بەهۆی زیادبوونی بەردەوامی ناڕەزاییەکان فشارێکی قورسی لە ڕێگەی ئینگلیزەکانەوە خستە سەر هەموو لایەن و ڕێسا کۆمەڵایەتیەکانی ئێران، هەموو خاڵە ستراتیجییەکان کەوتنە دەست سوپای بەریتانیا، کە بنکەیەکی سەربازی گرنگیان لە قەزوین دروست کردو کۆمیتەیەکی سەرکەوتیان بە ناوی کۆمیتەی ئاسنین پێکهێنا. کە بە هێزی تەواوەوە لە دژی نەیارەکانی کردەوەکانی وڵات وەستایەوە، هەموو ڕۆژنامە نەیارەکانی لە ڕێگەی ئەنجومەنی وەزیرانەوە داخست و ئەوانەش کە بە دەگمەن لە تاران بڵاودەبوونەوە، ناچاربوون کە ئەو هەواڵانە بڵاوبکەنەوە کە لە لایەن ئاژانسی ڕۆیتەرسی بەریتانیاوە دەنێردران(٨٣).

بە خراپ شکانەوەی پەیمانی ١٩١٩ لە لای ڕای گشتی و خراپی بارودۆخ و پێشکەوتنی بەلشەفیەکان لە گەیلان و مازندەران، بەجۆرێك متمانەی سیاسی لە وسوق دەولە کەم کردبویەوە، کە ڕۆژی ٢٥/پوشپەر چووە لای ئەحمەد شا و دەست لە کارکێشانەوەی خۆی ڕادەستی کرد، ئەحمەد شاش داوای لێکرد چەند ڕۆژێ ئارام بگرێ، تاکو سەرۆك وەزیرانی نوێ ڕادەگەیەنێت، نورمەن وەزیری دەست ڕۆیشتووی ئینگلیز باسی ئەم دۆخە دەکات لە تەلەگرافی ژمارە(٤١٥) ئاماژە دەکات بەوەی کە پاشا پێی وتوە دەبێ ڕاوێژم لەگەڵ بکەی سەبارەت بە دانانی سەرۆك وەزیران، ئەمیش پێی وتووە: دەبێ سەرۆك وەزیرانی نوێ کەسێك بێت بە وەفادارییەوە پەیمانی نێوان ئێران و بەریتانیا جێبەجێ بکا،

چونکە ئەم پەیمانە بنەمای سیاسەتەکانی پاشایە، بە بڕوای من موشیر دەولە بۆ ئەو کارە گوجاوە، پێشنیارم کرد کە وەزیری دەرەوەی ئێستا لە پۆستەکەیدا بمێنێتەوە، پاشاش ڕازی بوو. خاوەن شکۆ موشیر دەولە بانگ دەکات و فەرمانی ڕاگەیاندن و پێکهێنانی کابینەی پێدەدا. ئەم تەلەگرافە لە لایەن نورمەنەوە نێردراوە بۆ کرزن لە ٢٣/ژوئینی/١٩٢٠[٨٤]. ئەوەبوو کرزن لە پەیوەندییەکی تەلەفۆنیدا لەگەڵ نورمەن، هۆشداری دایە کە دەبێ گۆڕانێکی پێچەوانە لە سیاسەتی ئێراندا بەرپابکرێ، چونکە لە ماوەی هەفتەیەکدا دەسەلاتی بەریتانیا لەگەڵ ئێران، لەگەڵ ئەوەی توشی هەندێك هەڕەشەو توندوتیژی بونەوە، نورمەن وەزارەی دەرەوەی بەریتانیای دروست کردبوو، ڕای گەیاند: ((سەرکەوتنی سیاسەتی بەریتانیا لە ئێران لە سەرۆك وەزیری موشیر دەولەدایە)) وە کرزن هۆشداری دایە نورمەن و ڕای گەیاند ((پێویستە تۆ و ژەنەڕاڵ ئایرونساید* بڕیارێکی نوێ سەبارەت بە سیاسەتی نوێ نیشان بدەن و هێڵێکی نوێی بەرپرسیایێتی گرنگ لەخۆ دەگرێ و سەرکەوتن بەدەست دەهێنرێت))[٨٥].

ڕۆژی ٤/پوشپەر/١٩٢٠ نورمەن تەلەگرافێکی دیکەی نارد بۆ لەندەن کە ئەمە دەقەکەیەتی:

زۆر بە پەلە:

دوێنێ شا دەست لەکارکێشانەوەی وسوق دەولەی پەسەندکردو سەر لە بەیانی ئەمڕۆ موشیر دەولەی بانگ کردووە.

تەلەگرافی نورمەن بۆ کرزن

٢٥/ژویەنی/١٩٢٠[٨٦].

ئـەوبوو وسـوق دەولـەی سـەرۆك وەزیـران پـاش چـەند ڕۆژێ لـە گەڕانـەوەی ئەحمەد شا لـە ٢٤/ژوئیـەنی/١٩٢٠ لابـرا، لـە جێگـەی ئـەو موشـیر دەولـە کـرا بـە سـەرۆك وەزیـران، کـە شـارەزای سیاسـەتی نێودەوڵـەتی بـوو[٨٧]. ئـەوەبوو وەزارەتێکـی نـوێ بـە سـەرۆکایەتی موشـیر و کەسـایەتی زیـاتر هاوسـۆز لەگـەڵ بـەریتانیادا دروسـتکرا، یەکـەم کـاری ئـەم وەزارەتـە نوێیـە هەوڵـدان بـوو بـۆ نەهێشتنی ئەو تورەییەی کە لە ناو گـەل دا هـەبوو، بـە دانوسـتان کـردن لەگـەڵ بەریتانیادا بۆ وەستاندنی کارکردن بە پەیماننامەی ١٩١٩ بـە شـێوەیەکی کـاتی، ئەمەش بۆ دڵنیابوون لە نیاز پاکی وەزارەتە نوێیەکە، هەروەها ڕەخساندنی هەلی گفتوگـۆکردنی سـەرەتایی لەگـەڵ یـەکێتی سـۆڤیەت، بـە مەبەسـتی کـشانەوەی هێزەکانی لە بەندەری (ئانزلی). هەروەها ئەم وەزارەتە نوێیە، هەوڵی کوژانەوەی جوڵانەوەی نەتەوەییدا، بەڵام بـێ سـودبوو، خۆپـشاندان روتارەکـان لـە دژی لـە ڕۆژنامـەکان دا لـە دژی بـەردەوام بـوون، ئەمـە لـە کاتێکـدا کـە شـای ئێـران جێنشینەکەی هەوڵی ڕاکردنیاندا بۆ ئەوروپا. بەڵام بالیۆزی بەریتانیا ڕازی نـەبوو بە هەڵهاتنیان[٨٨].

ئەوەبوو سەرۆك وەزیرانی نوێ بەبێ وەستان و ڕاستەوخۆ لـە بڵاوکراوەیەکـدا جێبـەجێکردنی پەیماننامەکـەی هـەتا جێبـەجێکردنی کارەکـانی لـە ڕێگـەی ئەنجوومەنی شورای نەتەوەییەوە وەستاند[٨٩].

وەزیری دەرەوەی بەریتانیا بە بۆنەی دژایەتی ڕێکەوتننامـەی ١٩١٩، هـەرگیز موشیر دەولەی نەبوری، تەنانەت دوای سـێ مـانگ واتـە ١٧/نۆڤمبـەری/١٩٢٠ لـە وتارێکدا بە ئەنجومەنی بەریتانیای وت:

((وسوق دەولە کـە ڕێکخـەرو نوسـەری پەیماننامەکـە بـوو، یـەکی کـەوتووەو کابینەی نوێ بە سەرۆکایەتی کەسێك بە ناوی موشیر دەولە پێکهاتووە، ئـەو کـە

هاتۆتە سەرکار سیاسەتەکەی لەگەڵ ئەوانی پێشوودا ناکۆکە. موشیر دەولە دەڵێ: پەسەندکردنی پەیماننامەکە تا پێکهێنانی پەرلەمان دوادەکەوێ، لەو بڕوایەدام ئەوە سیاسەتێکی پووچ و گەمژانەیە کە دەوڵەتی ئێران گرتویەتیەبەر))[90].

بەریتانیەکان بەو هیوایەبوون پاش هەڵوەشانەوەی ڕێکەوتننامەی ١٩١٩، ڕێگا چارەسەرێکی گونجاو بۆ کێشەی ئێران بدۆزنەوە، ئامانجی سەرەکی بەریتانیا ئەوەبوو، دەوڵەتێکی پتەو و جێگیر بەهێزی سەربازییەوە لە ئێران دروست بکا، تا بەهۆیەوە، بەر لە نفوزی بەلشەفیەکان بگرن لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، جەنەراڵ ئایرونسایدو نورمەن بالیۆزی بەریتانیا لە تاران لە میانەی چەند گفتوگۆیەکدا لەگەڵ شا جەختیان کردەوە لەسەر ئەوەی کە ئەفسەرە ئینگلیزەکان جێگای ئەفسەرە ڕوسەکان بگرنەوە، هەروەها ئەوەشیان خستەڕوو ئەگەر شای ئێران پێشنیارەکەی پەسەند نەکا ئەوا هەموو یارمەتیە داراییەکان لە هێزی قۆزاق دەبڕن، ئەم هەوڵەی بەریتانیا بۆ ئەوەبوو کە نەهێڵن هێزەکانی قۆزاق بێنە ناو تارانەوە. چونکە دەیانزانی گەر بگەنە تاران دەرکردنیان ئەستەمە، هەر ئەمەش دەیتوانی کاریگەری خراپی هەبێ لەسەر هەردوولا(بەریتانیا–ئێران) ئەوەبوو شای ئێران داواکارییەکەی پەسەندکرد بە لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندییەکانی ئێران، بەڵام موشیر دەولە لە دژایەتی کردن، لەبەر ئەوە لە پۆستەکەی دەستی کێشایەوە[91].

ئەوەبوو ئەم وەزارەتە نوێیەش شکستی هێنا لە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی پەرلەمانی بەریتانی، بۆیە ناچاربوو دەست لە کارکێشانەوەی خۆی پێشکەش بە شا کرد، ئەویش ڕاستەوخۆ پەسەندی کرد[92]. دواتر سپاهدان وەزارەتێکی نوێی دروستکرد[93]. کە لە دامەزراندنی وەزارەتەکەیدا ترومانی بالیۆزی بەریتانیا لە

تاران بەشداری کرد لە دیاریکردنی وەزیرەکان دا، وەزیری دەرەوەی ئێران نوسرەت دەولە پێشنیاری کرد بۆ بالیۆزی بەریتانیا کە پەیماننامەکە بگۆڕن بۆ دانەیەکی تر کە زیاتر سودی بۆ وڵاتەکەی هەبێ، یاخود لێژنەیەکی فارس-بەریتانی دروست بکەن بۆ ئامادەکردنی ڕونکردنەوەیەك سەبارەت بە دۆخەکە، بەڵام بالیۆزی بەریتانیا بڕیاردانی خۆی لەسەر ئەم پێشنیارە دواخست بۆ ئەوەی هەوڵی کێشکردنی ئێرانیەکان بدات، بەڵام بێ هودە بوو، ئەوەبوو ئەم وەزارەتەش وەك وەزارەتەکانی پێش خۆی شکستی خوارد لە باوەڕهێنانی پەرلەمان لەسەر پەیماننامەی بەریتانی-فارسی[٩٤]، لە لایەن نوێنەرانی ئەنجومەنەوە بەوە تاوانبارکرا کە لە هەموو حکومەتەکانی تر زیاتر لایەنگری ئینگلیزەکانە[٩٥].

بە هەڵوەشانەوەی ڕێکەوتننامەی ١٩١٩ بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا کەوتە مەترسییەوە، حکومەتی لەندەن بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆی لە ئێران و دورخستنەوەی مەترسییەکانی سۆڤیەت لە ناوچەکە بیری لە دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەك کرد، ئەوان بۆ بەرژەوەندی سیاسی و ئابوریان دوو ڕێگاچارەیان لە پێش بوو:

یەکەم/ دەبوو هەوڵبدەن گۆڕانێکی ڕیشەیی و بنەڕەتی لە ئێران بهێننە کایەوە، بۆ دروستکردنی حکومەتێکی نوێ کە لایەنگری خۆیان بێ، بەم پێیە جگە لە وەستاندنی پێشڕەوی سۆڤیەت بەرەو باشوری ئێران، بەرژەوەندییەکانشیان پارێزراو دەبێ.

دووەم/ یاخود دابڕینی ناوچەکانی باشوری ئێران، بەتایبەتی خۆزستان لە ئێران. لەو کاتەدا زەمینەی کارێکی لەم چەشنە فەراهەم بوو، بەم جۆرەش سەرچاوە نەوتیەکانی باشور دەکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی ئینگیزەوە[٩٦].

دەتوانین بڵێین ئامانجەکانی بەریتانیا لە ئێران بەر لە کودەتای فێبرایەری ١٩٢١و جەنگی یەکەمی جیهانی ئەمانەن:

– پارێزگاری کردن لە سنورەکانی نیمچە کیشوەری هند کە لەو سەردەمەدا بە بایەخترین داگیرگەی ئینگلیز دەژمێردرا، بۆ ئەم مەبەستەش پێویست بوو ئینگلیز نفوزی خۆی لە ئێراندا فراوان بکا لە دژی نفوزی ڕکابەرەکانی خۆی لەوانە ڕوسیاو دواتر فەرەنساو ئەڵمانیا بوەستێتەوە، وە ئاسایش لە سنورەکانی ئەم ناوچەیە بپارێزێ.

– لە بەرامبەر فراوانخوازییەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕوسیا بوەستێتەوە، بە مەبەستی پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندییە نەوتیەکانی لە هندو کەنداوی فارس.

– پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندییەکانی ئێران، کە لە کۆتایی ئەو سەردەمەدا گرنگیەکی بۆ بەریتانیا دەرکەوتبوو[٩٧].

– ئەو بەرژوەندییانەی بەریتانیا لە هندستان هەی بوو وایکردووە کە نەتوانێ دەستبەرداری ئێران بێ، لۆردکرزن لە ساڵی ١٩٠٢ وتویەتی:

((وڵاتی هند گیانی ئیمپراتۆریەتی ئینگلیزە، لەسەر بەریتانیا پێویستە کە هندو ڕێگاکانی لە تەنگ و چەڵەمەکانی بێگانە دوربخاتەوە، وە ئەو کۆسپانەی کە کەوتونەتە نێوان ڕوس و بەریتانیا، چارەسەری بکەن، بۆ ئەوەی کە ڕوس ڕێگای پەلاماردانی عێراق–ئێران–ئەفغانی نەمێنێ)). کەواتە بەریتانیا هەوڵی داوە ڕێ لە نفوزی ڕوس یان هەر بێگانەیەك بگرێ لە ناوچەکە[٩٨].

## پەراوێزەکان

١- د.مريم ميراحجي: پژوهشى در تاريخ معاصر ايران. برخورد شرق وغرب در ايران(١٩٥٠-١٩٠٠)، انتشارات استان قدس رضوى، ١٣٦٦، ص٢٨.

٢- راجر ستيڤرى: ئێرانى سەردەمى سەفەوى، وەرگێڕ: سەلاحەدين ئاشتى، چاپخانەى شڤان، سلێمانى، ٢٠٠٦، ل١٩٩.

* ميرزا ملكم خان ناظم الدوله: خەڵكى جلفاى ئەسفەهانە، لە ساڵى ١٩٢٠-١٩٢٧ باليۆزى ئێران بووە لە بەريتانيا و هەروەها ماوەيەكيش باليۆزى ئێران بووە لە ئيتاڵيا. دامەزرێنەرى هێڵى تەلەگراف بوو لە ئێران و يەكێك لەوانە بووە كە گەلاڵەنامەى هێڵى ئاسنينيان دارشت، سەرنوسەرى رۆژنامەى قانون و نوسەرى چەندين كتێبى گرنگى وەكو (احلول ادميت، نامەى غيبى) بوو، بيرو بۆچوونى ملكم لە ژێر كاريگەرى (اگوست كنت) بوو كە فەيلەسوفێكى فەرەنسى بوو، ملكم بە رێبەرى رەوتى بورژوا-ليبراڵ لە ناو روناكبيرى ئيرانى دەژمێردرێ، بروانە: هاشم كەريمى: ئاين و دەسەلات لە پرۆسەى مێژووى رۆحانيەتى شيعەدا، چاپى يەكەم، چاپخانەى قانع، سلێمانى، ٢٠٠٥، ل١٦٨.

٣- جورج ناتانيل كرزن: ايران و قضيه و ايران، ترجمه: غلا معلى وحيدر مازندرانى، جلد دوم، تهران، ١٣٨٠، ص٧٢١.

٤- د.منوچهر محمدى: مرورى سياست خارجى ايران دوران پهلوى يا تعميم گيرى در نظام تحت سلطه، چاپ اول، نشر دادگسترى، تهران ١٢٧٧، ص٢٢.

٥- راجر ستيڤرى: س.پ، ل١٩٩.

٦- جۆرج ناتانيل كرزن: س.پ، ل٧٣٢، ٧٣٣.

٧- د.منوچهر محمدى: س.پ، ل٢٢.

٨- راجر ستيڤرى: س.پ، ل٢٠٠.

٩- جۆرج ناتانيل كرزن: س.پ، ل٧٣٣.

١٠- د.على رضا امينى، حبيب الله ابوالحسن شيرازى: تحولات سياسى-اجتماعى ايران از قاجاريه تارخاشا، چاپ دوم، نشر قومس، ١٣٨٥، ص٢٣٥.

١١- حوسێنى مەدەنى: كوردستان و ئيستراتيژى دەوڵەتان، بەرگى دووەم، چاپى يەكەم، چاپخانەى وەزارەتى رۆشنبيرى، هەولێر، ٢٠٠١، ل٨، ٩.

١٢- د.مريم ميراحمدى: س.پ، ل٢٩.

١٣- د.منوچهر محمدى: س.پ، ل٢٩.

١٤- نازناز محمد عەبدولقادر: س.پ، ل٢٧.

١٥- د.امال السبكي: تاريخ ايران السياسي بين ثورتين(١٩٠٦-١٩٧٩)، ترجمە: أحمد ستاری العدواني، كويت، ١٩٩٩، ص١٦.

١٦- جورج ناتانیل کرزن: س.پ، ل٧٤٢.

١٧- نەوشیروان مستەفا ئەمین: کوردو عەجەم (مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێران)، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، چاپی سێیەم، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل٢٥٨.

* لە ٣١/ئاب/١٩٠٧ وەزیری کاروباری دەرەوەی ڕوسی، ئەلیکسەندەر ئیزۆلسکی و سەفیری بەریتانی لە (پیتەربۆرك)، سێرئارتور نیکسۆن. پەیمانی دوو قۆڵیان بەست، کە پێکهاتن لەسەر ئەوەی ئێران دابەش بکرێ بە سەر ناوچەی نفوزی ئینگلیزی و ڕوسی و مەڵبەندێکی بێ لایەن لە بەینی هەردوو ناوچەکەدا، لە ساڵی ١٩١١دا بەپێی ئەم ڕێکەوتنە ڕوس و ئینگلیز چوونە ناو خاکی ئێرانەوە، کاتێ جەنگیش هەڵگیرسا، سوپاکانی ڕوس و ئینگلیز، بەبێ ئەوەی ڕێزی سەربەخۆیی و بێ لایەنی ئێران بگرن داگیریان کرد: بڕوانە: نەوشیروان مستەفا ئەمین: هـ.س، ل٢٥٨.

١٨- د.منوچهر محمدی: س.پ، ل٢٩.

١٩- علی رضا اوسطی: ایران درسه قرن گزشته، جلد دوم، چاپ اول، چاپخانه برادران علمی، تهران، ١٣٨٢، ص٥١٤.

٢٠- د.امال السبكي: س.پ، ل٣٣، ٣٤.

٢١- حوسێنی مەدەنی: س.پ، ل٣٣، ٣٤.

٢٢- هـ.س، ل١٨.

* شۆڕشی مەشروتەخوازی(١٩٠٥-١٩١١) بە گرنگترین ڕووداوی مێژوویی ئێران دادەنرێت، خواستی ئەم بزافە جەماوەرییە دانانی سنورێك بوو بۆ دەسەڵاتی ڕەهای شاکانی قاجاری و ڕیفۆرم لە بوارە جیاجیاکان دا (ئابوری و سیاسی و کۆمەڵایەتی) و پێکهێنانی حکومەتی نیشتمانی و وەستان لەبەردەم دەستێوەردانەکانی وڵاتە بیانیەکان لە کاروباری ناوخۆ و دەرەوەی ئێران، بڕوانە: یاسین سەردەشتی: گەلی کوردو بزافی مەشروتە خوازی لە ئێران(١٩٠٥-١٩١١)، چاپخانەی هاوار، سلێمانی، ٢٠٠١، ل٨.

٢٣- د.منوچهر محمدی: س.پ، ل٢٢.

٢٤- د.مریم میراحمدی: س.پ، ل٢٧.

٢٥- د.منوچهر محمدی: س.پ، ل٣٠.

٢٦- پرواند ابراهامیان: ایران بین دو انقلاب از مشروطه تا انقلاب اسلامی، ترجمه: کاظم فیروزمند، حسن شمس اوری، محسن مدیر شانەچی، چاپ هشتم، تهران، ١٣٨٣، ل٩٣.

٢٧- رضا نیازمند: رضا ـ ر تولد تا سلطنت، چاپ اول، جامعه ایرانیان، ١٣٨١، ص٢٢١-٢٢٢.

٢٨- د.منوچهر محمدی: س.پ، ل٣١.

٢٩- دیڤید مەکداول: مێژووی هاوچەرخی کورد، وەرگێڕ: ئەبوبەکر خۆشناو، چاپی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥، ل١٢٢.

٣٠- ژان پیردیگارت، برنارد هودکار، یان ریشار: ایران در قرن بیستم بررسی اوچاع سیاسی، اقتصادی، اجتماعی، فرهنگی در یکهد سال اخیر، ترجمە: عبدالرزاق (هوشنگ)مهدوی، چاپ اول، چاپخانە اسمان، تهران، ١٣٧٧، ص٥١.

٣١- علی رضا امینی، حبیب الله ابوالحسن شیرازی: س.پ، ل٢٣٢.

٣٢- ژان پیر دیگارت، برنارد هودکار، یان ریشار: س.پ، ل٥٥.

* جیۆپۆلەتیك: واتە جوگرافیای سیاسی، ئەو سیاسەتەی کە جۆری زەوییەکەی کاریگەری بەسەریەوە هەیە. ئێران بجگە لە کەڵك وەرگرتن لە کەنداوی فارس سنورێکی درێژی هەبوو لە باکوری وڵات، بەسەر گەورەترین دەریای جیهانی دا واتە خەزەر(قەزوین) کە ئەویش پێگەیەك بوو بۆ ئێران کە لە ڕێگای قەفقازی ئەو بەر سنوری خەزەر دەگەیشتە زەریای ڕەش. بڕوانە: نازناز محەمەد عەبدولقادر: سیاسەتی ئێران بەرامبەر بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی نەتەوەیی کورد لە کوردستانی عێراقدا(١٩٦١-١٩٧٥)، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٨، ل١٩، ٢٢.

٣٣- نەوشیروان مستەفا ئەمین: کوردو عەجەم، ل٢٤٣.

٣٤- د.سەعدی عوسمان هەروتی: بزاڤی ڕزگاریخوازی نیشتمانی لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا(١٨٨٠-١٩٣٩)، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٤٢.

٣٥- نەوشیروان مستەفا ئەمین: کوردو عەجەم، ل٢٤٣.

٣٦- هەمان سەرچاوە، ل٢٤٣.

٣٧- حوسێنی مەدەنی، س.پ، ل٥٦، ٥٧.

٣٨- د.سەعدی عوسمان هەروتی: س.پ، ل٤٢، ٤٣.

٣٩- د.امال السبکی: س.پ، ل٤٢.

٤٠- پرواند ابراهامیان: س.پ، ل٢٣٥.

٤١- پرواند ابراهامیان: س.پ، ل٩٣.

٤٢- د.امال السبکی: س.پ، ل٤٣.

٤٣- رضا نیازمند: س.پ، ل٢١٧.

٤٤- د.منوچهر محمدی: س.پ، ل٣١.

٤٥- رضا نیازمند: س.پ، ل٢١٨، ٢١٩.

٤٦- ژان پیردیگارت، برنارد هودکار، یان ریشار: س.پ، ل٥٤.

٤٧- علی رچا امینی، حبیب الله ابوالحسن شیرازی: س.پ، ل٢٢٥.

٤٨- حوسێنی مەدەنی: س.پ، ل٥٨.

٤٩- علی رضا امینی: حبیب الله ابوالحسن شیرازی: س.پ، ل٢٣١.

* پەیمانی(برست-لینۆڤسك): لە نێوان سۆڤیەت و ئێران دا بەسترا کە هەردوولا لەسەر ئەوە رێکەوتن، کە هەر دەوڵەتێك بیەوێ دەسەلاتی داگیرکارانەی خۆی بەسەر ئێران دا بسەپێنێ، یان لە خاکی ئێرانەوە هێرش بکاتە سەر روسیا، یان گەر هاتوو سنوری دەوڵەتی (کۆماری یەکێتی سۆڤیەت) بکەوێتە مەترسییەوەو ئێران توانای چارەسەری نەبێ، ئەوا دەوڵەتی سۆڤیەت بۆی هەیە هێزی خۆی بنێرێتە خاکی ئێرانەوە بۆ بەرگریکردن لە خۆی، دوای نەمانی مەترسی هێزەکانی خۆی لە ئێران دەکشێنێتەوە: بروانە: حوسێنی مەدەنی: س.پ، ل٥٧، ٥٨.

* تەنها قوتابخانەیەکی عەسکەری کە لە ئێراندا هەبووە ناوی قۆزاقخانە بووە کە هەتا کودەتای سەربازی ١٩٢١ تاکە خوێندنگەی سەربازی بووە، هیچ رێسایەکی یاسایی نەبووە کە بتوانێ ناوی بنێ ئەمە کۆلێژی سەربازییە، لەم قوتابخانەیەدا بە زمانی روسی وانەی تیادا دەگوترا، ئەم زمانە روسیە شێوەیەك یان داردەستەیەك بوو بۆ روسەکانی ناو ئێران کە رۆژ بەرۆژ لە زیادبوندا بوون، بروانە: نجعقلی پسیان، خسرو معتضد: در عهدو پهلوی، چاپ اول، چاپخانه میرری، ١٣٧٧، ص٣٤.

٥٠- د.منوچهر محمدی: س.پ، ل٣٢.

٥١- ئەوشیروان مستەفا ئەمین: کوردو عەجەم، ل٤٠٢.

٥٢- علی رضا امینی: حبیب الله ابوالحسن شیرازی: س.پ، ل٢٣٧.

٥٣- د.منوچهر محمدی: س.پ، ل٣٢.

٥٤- هـ.س.

٥٥- علی رضا امینی: حبیب الله أبوالحسن شیرازی: س.پ، ل٢٣٧.

٥٦- عبدالهادی کریم سلیمان: ایران في سنوات الحرب العالمیة الثانیة، منشورات مرکز دراسات الخلیج العرب بجامعة البصرة، ١٩٨٦، ص٧.

٥٧- جهاد صالح العمر، اسعد محمد زیدان الجوادی: ایران فی عهد رضا شاه پلهوی(١٩٢٥-١٩٤١)، مطابع التعلیم العالي، ١٩٩٠، ص١٠.

٥٨- د.سەعدی عوسمان هەروتی: س.پ، ل٤٢، ٤٣.

٥٩- حوسێنی مەدەنی: س.پ، ل٥٨.

٦٠- د.نیلوفەر کەسری: ئێران و کۆمەڵەی گەلان، دۆسیێی ئێران، ژمارە(٦)، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی، مایسی ٢٠٠٧، ل٧٤.

٦١- نەوشیروان مستەفا ئەمین: کوردو عەجەم، ل٢٧٨.

٦٢- د.منوچهر محمدی: س.پ، ل٣٢، ٣٣.

٦٣- هوشنگ صباحی: سیاست انگلس و پادشاهی رچا شاه، ترجمه: پروانه ستاری، چاپ اول، نشر گفتار، تهران، ٢٠٠٠، ص٢.

* دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی، نوێنەرایەتی (٣٢) دەوڵەتی جیهانی لە ١٨/کانونی دووەمی/١٩١٩ لە پاریس کۆبونەوە بۆ بەرقەراربوونی سیستەمێکی نێودەوڵەتی. لە ٩/حوزەیران، کۆمیتەیەك پێکهێنرا، بە مەبەستی دامەزراندنی کۆمەڵەی گەلان. ئەوەبوو ئەم کۆمیتەیە بڕیاری دروست بوونی کۆمەڵەی گەلانی ڕاگەیاند، هۆی ئەم کۆبونەوەیە چارەسەرکردنی کێشەی وڵاتان بوو لە دوا جەنگی یەکەمی جیهانی، نەخشە داڕێژەرو پلان بۆ دانانی کۆمەڵەی گەلان لە لایەن ولسن ئامادەکرابوو، ئەم کۆمەڵەیە تا ساڵی ١٩٤٦ مایەوە کە دواتر نەتەوە یەکگرتووەکان جێگای گرتەوە، بڕوانە: نیلوفەر کەسری: س.پ، ل٧٣. محمد رەسول هاوار: کوردو باکوری کوردستان لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی تا دوای شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران، بەرگی دووەم، چاپی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل١٠.

٦٤- نزار ایوب حسن الطوي: علاقات ایرانیة-السوفیتیة(١٩٣٩-١٩٤١)، رسالة ماجستیر تقدم لكلیة الاداب في جامعة الموصل، غیر منشورة، موصل، ٢٠٠٥، ص٣٠، ٣١.

٦٥- د.نیلوفەر کەسری: س.پ، ل٧٤.

٦٦- حوسێنی مەدەنی: س.پ، ل٥٨.

٦٧- علی رضا امینی، حبیب الله ابوالحسن شیرازی: س.پ، ل٢٣٧.

٦٨- حوسینی مەدەنی: س.پ، ل٥٩، ٦٠.

٦٩- علی رضا امینی، حبیب الله ابوالحسن شیرازی: س.پ، ل٢٣٨.

٧٠- ژان پیردیگارت، برنارد هودکار، یان ریشار: س.پ، ل٤٧.

٧١- د.نیلوفەر کەسری: س.پ، ل٧٤.

٧٢- ژان پیردیگارت، برنارد هودکار، یان ریشار: س.پ، ل٤٨.

٧٣- ژان پیردیگارت، برنارد هودکار، یان ریشار: س.پ، ل٤٧، ٤٨.

٧٤- منوچهر محمدی: س.پ، ل٣٣.

٧٥- علی رضا امینی، حبیب الله ابوالحسن شیرازی: س.پ، ل٢٣٦.

٧٦- منوچهر محمدی: .پ، ل٢٣.

* شێخ خەزعەل کوڕی حاجی صابرخانی نوسرەت مولکە، لە ساڵی ١٢٨٠ لەدایك بووە لە هۆزی عەرەبی (بەنی کەعب) کە عەرەبی خۆزستانە، پیاوی بەریتانیا بوو، خاوەنی زەوی و زارێکی زۆر بوو، لە ساڵی ١٩٠٩ دەوڵەتی ئینگلیز ڕێککەوتنامەیەکی لەگەڵ دا مۆرکردبوو، لەسەر بنەمای ئەوەی بەرگری لە دامەزراوەکانی نەوتی کۆمپانیای ئینگلیز بکا لە باشوری خۆزستان، لە بەرامبەردا دەوڵەتی ئینگلیز مافی بەڕێوەبردنی شێخ خەزعەل و جێ نشینەکانی لەسەر (حزم شهر) دابین بکات، جێگری ساڵانەش بۆ خەزعەل دابنێ، ئەم ڕێکەوتنامەیە لە دواییدا بەهۆی ئینگلیزەوە پشتگیری لێکرا، بەشێوەیەك کە خەزعەل چەندین ساڵ بە تەواوەتی حاکمی خۆزستان بوو بە تایبەتی ناوچەی باشور، بڕوانە: رضا نیازمند: س.پ، ل٥٩٦.

٧٧- علی رضا امینی: حبیب الله ابوالحسن شیرازی: س.پ، ل١٣٦.

* ودرۆ وڵسن(١٨٥٦-١٩٢٤) سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بووە، لە فەرجینا لەدایك بووە، لەسەر لیستی دیموکراتەکان هەڵبژێرا بە سەرۆکی ئەمریکا. لە ساڵی ١٩١٢ لە بواری کاروباری ناوخۆدا بایەخی داوە بە دانانی سیستەمی بانکی نیشتمانی و سیاسەتی بێ لایەنی گرتەبەر لە جەنگی یەکەمی جیهانی، لە ساڵی ١٩١٦ هەڵبژێردرایەوە و لە ساڵی ١٩١٨ چواردە بەندەکەی ڕاگەیاند وەك بنەمایەك بۆ ئاشتی جیهان، بەشداری کرد لە کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس، کە چواردە بەندەکەی بوونە جێگەی وتوێژ لە نێوان وڵاتانی بەشداربووی ئەو کۆبونەوەیەدا کە وڵسن خۆی وەك کەسایەتیەك ڕۆڵی گەورەی گێڕا لەو کۆبونەوەیەدا. بڕوانە: الان بالمر: موسوعة التاريخ الحديث(١٧٨٩-١٩٤٥)، ترجمة: سوسن فيصل يوسف محمدامين، جزء الثاني، طبع الاولى، دار المأمون للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٩٢، ص٢٩٢-٢٩٣.

٧٨- منوچهر محمدی: س.پ، ل٣٣.

٧٩- كمال مظهر أحمد: دراسات في التاريخ ايران الحديث والمعاصر، مطبعة اركان، بغداد، ١٩٨٥، ص١٢٧.

٨٠- منوچهر محمدی: س.پ، ل٣٣.

٨١- علی رضا أمینی، حبیب الله ابوالحسن شیرازی: س.پ، ل٢٣٨.

٨٢- ژان پیردیگارت، برنارد هودکار، یان ریشار: س.پ، ل٧٧.

٨٣- علی رضا امینی: حبیب الله ابوالحسن شیرازی: س.پ، ل٢٤٠.

٨٤- رضا نیازمند: س.پ، ل٢٢٣-٢٢٤.

* ئایرونساید لە ١٨٨٠ لەدایك بووە، چەند زمانێکی دەزانی و کەمێکیش لە فارسی فێربوو بوو لە کارەکانی دا هەمیشە سەرکەوتو بووە، لەبەر ئەم سەرکەوتنانەی نەجمەی وەرگرتبوو، بەشێوازێك لە هاورێکانی تازە سەرگەرم بووبوون کەچی ئەو گەشتبوە سەر تیپی سێیەم، لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا کاری سیخوری زۆری لە ئەڵمانیاو ئەو شوێنانەی کە ئەڵمانی لێ بوو کردبوو، بە گەنجترین سەرکردەی بەریتانیا دادەنرا، بەهۆی بەتواناییەوە کاری زۆری پێ سپێراوە یەکێ لەوانە کاری بوو لە ئێران بروانە: رچا نیازمند: هـ.س، ل٢٣٢.

٨٥- د.علی اصغر زرگر: تاریخ روابگ سیاسی ایران و انگلس دردوره رچا شاه، ترجمه: کاوه بیات، چاپ اول، تهران، ١٣٧٢، ص٦٧.

٨٦- رضا نیازمند: س.پ، ل٢٢٣.

٨٧- د.منوچهر: س.پ، ل٢٢٣.

٨٨- د.امال السبکی: س.پ، ل٤٨-٤٩.

٨٩- منوچهر محمدی: س.پ، ل٣٤.

٩٠- رضا نیازمند: س.پ، ل٢٣١.

٩١- د.علی اصغر زرگر: س.پ، ل٦٤.

٩٢- د.امال سبکی: س.پ، ل٤٨، ٤٩.

٩٣- د.جماد صالح العمر، اسعد محمد زیدان الجوادی: س.پ، ل١١.

٩٤- د.امال السبکی: س.پ، ل٤٩.

٩٥- د.جماد صالح العمر، أسعد محمد زیدان الجوادی: س.پ، ل١١.

٩٦- محمود طلوعي: پدروپسر ناگفتها از زندگی و روزگار پهلوی ها، چاپ ششم، ١٣٧٦، ص٤٣١.

٩٧- منوچهر محمدی: س.پ، ل٣٥.

٩٨- محەمەد ئەمین مەنگوری: بە سەرهاتی سیاسی کورد لە ١٩١٤ وە هەتا ١٩٥٨، بەشی یەکەم، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل١٠.

# گوندی چەرمووی نزیك چم چماڵ وەك كۆنترین گوندی كشتوكاڵی لەرۆژهەلاتی ناوەراست

أومید خطاب وهاب

## دەروازە

بێگومان لەراستیدا كوردستان بەگشتی و ناوچەی چەمچەماڵ بەتایبەتی لانكەی شارستانی ژیان و ئاوەدانی بووە(*)، لەسەردەمەكانی پێش پەیدابونی مێژووەوە، لەروی كارگێرییەوە جگە لەمەركەزی چەمچەماڵ هەردوو ناحیەكانی ئاغجەلەرو سەنگاو سەر بەشارۆچكەی چەمچەماڵن، كە دەكەوێتە نێوان هەردوو شاری كەركوك و سلێمانیەوە، نزیكەی چل و نۆ كیلۆمەتر لەشاری كەركوكەوە دوورە، بەلاّم شەست و پێنج كیلۆمەتر لەشاری سلێمانییەوە دوورە، ناوچەیەكی فراوان و بەپیتی هەیە بۆ كشتوكاڵكردن، جگە لەوەی ناوچەیەكی زۆر دەوڵەمەندە لەروی سامانی سروشتییەوە بەتایبەتی نەوت (1) تەنها لەسنوری مەركەزی چەمچەماڵ ژمارەیەكی زۆر شوێنەوار هەیە كە هەندێكیان تۆماكراون لە بەرێوەبەرایەتی گشتی شوێنەواری عێراق، وەك (گردی سور) لەگوندی گورگەیی كاكەعەبدولاّ ، (گردی بانەبۆر) لە گوندی سەیدانی خواروو، (پرجۆگا) لەگوندی مارۆڵە، (گردی بنگرد كۆن ) لەگوندی بنگرد، (گۆرستانی چراغەرووتە)، (سەرباخ) لەگوندی نورە، (سەرگەردان) لەگوندی سەیدانی سەروو، (قبە شێخ حەسەن) لەگوندی سۆفی حەسەن، (گردی كەریم شایەر) لەگوندی تەژگا،

(ئەشکەوتی کەریم شایەر) هەرلەگوندی تەژگا،(گردی کلێسە) لەگوندی گورگـەیی سەرخاسە، گۆرستانی گورگـەیی چاوسـوور، (گـردی کـۆنی عوسمـان غـەزان) لـە گوندی عوسمان غەزان، (دارقەلاّ) لەگوندی قوولە [٢].

لەراستیدا شارۆچکەی چەمچەماڵ بۆ رۆژگاری ئەمرۆ بـەهۆی فراوانبوونییـەوە بـە تایبـەتی لـەلای رۆژئاوایـەوە گەیـشتووەتە بـانی مـەقان، دووری لەشـاری کەرکوکەوە تەنا سی و پێنج کیلۆمەترە بەلام لەشاری سلێمانییەوە پەنجاو پێنج کیلۆمەترە.

## یەکەم - قۆناغەکانی چاخی بەردین:

لەراسـتیدا پـێش ئـەوەی راسـتەوخۆ باسـی نـاوەرۆکی بابەتەکـەمان بکـەین چاکتروایە ئاماژەیەکی کورت بەقۆناغەکانی چاخی بەردین بکەین ئەوانیش:

١- چاخی بەردینی کۆن (العصر الحجری القدیم) کۆکردنەوەی خواردن ( pake lithic) کە دابەشدەبێت بۆ سیێ بەش وەك:

أ- چاخی بەردینی خوارەوە ١٠٠,٠٠٠ پ.ز بەردەبەلکە

ب- چاخی بەردینی ناوەراست ٥٠,٠٠٠ پ.ز شانیدەر

ج- چاخی بەردینی سەرەوە ٤٥,٠٠٠ پ.ز شانیدەر-هەزار مێرد.

٢- چاخی بەردینی ناوەراست (mcasolittic)( العصر الحجری الوسیط)، ئەم چـاخە ١٢,٠٠٠-٣٠٠٠ پ.ز، خایانـد وەك زاوی چـەمی زەرزی مـرۆڤ لـەم چـاخەدا توانی

أ- ئاژەڵ ماڵی بکات

ب- کشتوکاڵ بکات [٣]

ماوەی ئـەم قۆناغـە روداوەکـانی (پلاسـیۆنی) دەگرێتـەوە، بـەهۆی پاشمـاوە وردەکانیشییەوە بەچاخی (مـایکرۆلیکیش) ناسـراوە، چـونکە ئـەو ئاسـەوارانەی ئادەمیزاد لـەو سـەردەمەدا لەبـەردو ئێسقان دروسـتی کـردوون، پێشکەوتنێکی ئاشـکرای پێوەدیـارە لـەرووی لێفـەوتان و بایەخپێدانـەوە جگـە لـەزاوی چـەمی زەرزی،کـەریم شـایەر، کـە پانایییەکـەی نزیکـەی چـوار هـەزار مـەتر چوارگۆشـە دەبێت، دەتوانین دابینێین بە بنکەیەکی نیوە کۆچەری[٤].

٢- چاخی بەردینی نوێ (Neolithic) (العصر الحجری الحدیث)

ئەم چاخە لەلایەن توێژەرانەوە ناسراوە بە (عصر انتـاج القـوت) لەبەرئـەوەی لەم چاخەدا بژێوی رۆژانەیان لەرێگەی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵـەوە بـووە، کـە گرنگییـەکی گـەورەی هـەبووە لـە ژیـانی رۆژانـەی مرۆڤـدا [٥] لـەگرنگترین هۆکارەکـانی پێشکەوتنی مـرۆڤ لـەم چـاخەدا ئـەوە بـووە دانەوێڵـەی چـاندووە، زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە کشتوکاڵکردن بووە هۆی ئەوەی مرۆڤ نیشتەجێ بێت لەرۆژهەلاتی نزیك و لەکوردستانی عێراق و میسردا[٦].

## دووەم- واتـای گوندی چەرمووقەلاکەی و شوێنی جوگرافیەکەی:

واتاکـەی لـەزمانی کوردیـدا بـە چـەرموو لێکدەدرێتـەوە کـە بـەپیاوێکی بەساڵاچـوی ریش سـپی دەوترێـت کـە لـەدوا قۆنـاغی تەمەنیدایـە، دیـارە ئـەم لێکدانەوەیەش دێرینی شوێنەوارەکە دەردەخات[٧]، جگـە لـەوەی یەکـەم گونـدی کشتوڵییە لەرۆژهەلاتی ناوەراستداو یازدە کیلۆمەتر لەشارۆچکەی چەمچەماڵەوە دوورەو لەسـەر زەوییـەکی (١٢,٠٠٠-١٦,٠٠٠) مـەتر دوجـا بـووە[٨]، واتـە رووبەرەکەی ٩٠ بە ١٤٠ مەتر و دوو هەزارو پێنج سەد پێ لەئاستی روی دەریـاوە بەرزە[٩]، بەلام قەلای چـەرموو شـوێنەوارێکە دەکەوێتـە خۆرهـەلاتی شارۆچـکەی

چەمچەماڵ لەساڵی ١٩٤٨ نێردراوێکی سەر زانستگای خۆرهەڵاتی سەر بەزانکۆی شیکاگۆ بۆ کاروباری خۆرهەڵاتناسی بەسەرۆکایەتی (رۆبەرت.ج.برەوید) دەستی بە کنەو پشکنین تیایدا کردووەو تا ساڵی ١٩٥٥ بەردەوام بووە، کۆنترین گوندی کشتوکاڵی چاخی بەردینی نوێ ی دۆزییەوە کە سەردەمەکەی بۆ هەزارەی حەوتەمی پێش زایین دەگەڕایەوە (١٠).

## سێیەم- کورتەیەك دەربارەی گوندی چەرموو:

لەراستیدا بەپێی کنەوپشکنینەکان ئەو پەرەسەندنەی بەهۆی گۆڕانی گەورە لەژینگە بەتایبەت کشانەوەی بەستەڵەکی باکور رویداوە، مرۆڤ وردە وردە لە ئەشکەوتەکانەوە هاتووەتە دەرەوە بەرەو دۆڵ و دەشتاییەکان شۆڕبۆتەوە، هەوڵێکی سەرەتایی بۆ پەروەردەکردنی ئاژەڵ و دانەوێڵە دراوە وەك لە زاوی چەمی و پاڵی گەورە، بۆیە ئەم ئاواییە سەرەتاییانە بۆ چاخێکی روونتر کە رێخۆشکەر بوون وە بەشۆڕشی کشتوکاڵ ناسراوە، کە مرۆڤ لەگوندی جێگیر گیرساوەتەوە، چاندن و ئاژاڵداری ئەنجامداوە، وەك کەریم شایەر، پاڵی گەورە، چەرمۆ،لە خۆرهەڵاتی چەمچەماڵ و مەشارە لەباشوری کەرکوك(١١)، جگە لەوەی مرۆڤە سەرەتاییەکان نزیکەی حەوت ملیۆن ساڵ بەرلەئێستا ناسراون لەشێوەی مرۆڤی ئێستا، ئەوان جەستەیەکی بچوك و شێوەیەکی مەیمون ئاساییان هەبوو. بەگشتی لەچاخی بەردین لەسەر گۆی زەوی سێ جۆرە مرۆڤ بوونی هەبووە ئەوانیش مرۆڤی (جاوە، پەکین،نیاندەرتاڵ) بەڵام سەبارەت بەبونی جۆری ئەو مرۆڤەی کە لەچەرموو ژیاوە لەسەردەمانی کۆن روون نیە(١٢) زانیاری کەمە تارادەیەك، بەڵام دەتوانین بگەینە ئەو راستییەی کە ناوچەی چەمچەماڵ ناوچەیەکی ئاوەدانبووەو مرۆڤی تیادا ژیاوە، ئەوەی سەرنج رادەکێشێت لەم

ناوچـەیەدا مـرۆڤ خـۆی خـواردنی بەدەست هێنـاوە، بۆیـە لەسـەرەتادا شـێوەی ژیانێکی کارگێری و بەڕێوەبردنی نەبووە تاکو بتوانێـت لەسـەر هێڵێکـی ڕێکوپێـك پێویـستییە کارگێرییـەکانی بەڕێوەبـەرێت، سـەرهەڵدانی چـەرموو وەکـو گونـدێك لەسـەردەمی بـەردینی نوێـدا پێویـستییان هـەبووە بـەکاروبارە کارگێرییـەکان هەرچەند بەشـێوەیەکی سـادەبوبێت بەیـەکتری کۆیـانی کردوەتـەوە وایکـردووە ژیـانی خێزانـی لەچوارچـێوەی ناوچـەکەدا گەشـەبکات، پێویـستی کـردووە بـیر لەڕێکوپێککردنی ژیانیان بکەنەوەو بتوانن کاروبارەکانی ڕۆژانـەیان بەڕێوەبـەرن، هەوڵبدەن لێکگونجاندن بکەن لەبەڕێوەبەردن و هاوسەنگکردنی ژیانی کۆچەری و ژیانی کشتوکاڵیدا، چونکە گۆڕانی ژیـانی کۆچـەری لەشـێوەی ژیـانی هەڵەشـەی تاکتیکیـدا پێویـستی بەماوەیـەك هـەبووە بـۆ خۆسـازدان لەگـەڵ ژیـانی گونـدە کشتوکاڵییەکاندا(١٣).

سەرەتای جێگیربوون لەگوندی چەرموو دەگەڕێتـەوە بـۆ حـەوت هـەزار سـاڵ پـێش زایـین، ژمـارەی خانووەکـانی ئـەم گونـدی نزیکـەی(٣٠-٤٠)خـانوو (مـاڵ) بوونە، ژمارەی دانیشتوانی ئەم گوندە( ١٥٠-٢٠٠ )کـەس بوونـە(١٤)، خانوەکـامی ئەم گوندە لەخشتی قوڕ دروسـتکراون و سەربانەکانیـشیان بـە قامیـشو و زەل و دار گرتووەو بەقوور سواخدراون(١٥).

## چوارەم- کشتوکاڵکردن لەچەرمووودا

چاخی بەردینی نویێ لە دە هەزار ساڵ بەرلە زایین تاکو چاخی مـەفرەق نزیـك ٢٥٠٠ سـاڵ بـەر لـەزایین درێـژەی بـووە، بـەو شـێوەیە بـە قۆنـاغێکی نـوێ لەجۆراوجۆری بوونەوەرانی مرۆڤ دیاردەکرێـت، لەسـەردەمی چـاخە سـەهۆڵەکان توانەوەوپلەی گەرمی زەوی بەرزبووەوە، پاش ئـەو جۆراوجـۆری گیـای خـۆراکی

زۆر زیادی کرد گەرمتربونی کەشوهەوا لەهەمان کاتدا بەواتای پێداویستی کەمتر بەگۆشت بوو کە چەوری کالۆری زۆری هەیە، بەلاّم کاتێك کە سەرما نەما خەلّك توانییان گیاو دەنکی زیاتر بخۆن، لەکۆکردنەوەی خۆراك تا چاندن و دروێنە لەراستیدا سەرەتای کشتوکالّ لەتایبەتمەندییەکانی سەردەمی چاخی بەردینی نوێیە[١٦]، بەگشتی کشتوکالّ لەپەرەسەندندا بووە، بەلاّم بەشێوەیەکی لەسەرخۆ و بەوردی تا لەچەرموودا خەملّی، دواتر بەهۆی بارودۆخی سروشتی وەك وشکەسالّی و پەرەسەندنی ئامێرە کشتوکالّییەکان بەتایبەت پاش گواستنەوەی کشتوکالّ لەبەرزاییەکانەوە بۆ لێواری روبارەکان و کۆبونەوەی دانیشتوان بەشیوەیەکی چڕتر لەپێشوو بووەتە هۆی بەیدابونی شارەکان و ناوچەی زوورگ و لیتەی و دەشت[١٧]، کنەو پشکنینەکان لەم گوندە ئەوەیان دەرخست کە جوتیاری چاخی بەردینی نویّ بەرهەمی گرنگی هەبووەو چاندوێتی لەچەرمۆدا وەك گەنم، جۆ،نیسك[١٨]، لەپێناوی وزەی چەوریشدا (بستە)یان چاندووە هەروەها بەرووشیان چنیووە، لەپێشدا جۆرە گەنمێکی بەژی (بری)یان تۆوکردووە، پاشان جۆرێکی باشیان بەرهەم هێناوە کە بە (ئیمە رۆیت) ناسراوە، گولّە گەنمەکەیان لەو جۆرە بووە کە تۆوەکەی دوو ریز بووە کەزیاتر لەگەنمی بەژی نزیك بووە، هەروەها جۆرە جۆیەکیان بەرهەم هێناوە کە بە (هەلیدتۆ) ناسراوە وە دوو جۆرە جۆیان بەرهەم هێناوە یاخود تۆو کردووە گولّەکەی دوو ریز بووە ئەویش شەش ریز بووە[١٩]، کارو پیشەی دانیشتونی گوندی چەرموو بەرەو ئەوە چووە کە سالاّنە کشتوکالّی خۆیان دووجار بکەن و بەرهەمی بهێنن، بەشێوەیەکی گشتی لەگوندی چەرموودا دوو جۆرە دانەوێلّە بەرهەم هاتووە:

١- دانەوێلّەی خۆراك: ئەو بەروبومە سەرەکیانەی وەکو گەنم لەجۆری EMMER و جۆ لەجۆری Enkom کە مرۆڤی چەرموو بۆ ژیانی رۆژنەی

بـەكاری هێنـاوە، لەهــەمان كاتــدا كاوكۆتەڵەكـەی داوە بـە ئاژەڵـەكان، ئــەم بەروبومەش رۆژانە پێویستیان بە تیشكی خۆر هەیە، لەزەوییەكیشدا دەچێنرێت كـە دەوڵەمەنـدبێت بـە كەرەسـتەی كـانزایی جۆراوجـۆر كـەزەوی چەمـچەماڵ بەناوبانگە پێی، هەروەها پێویستی بەئاوی زۆر لە بەفروباران و تەرزەیە، رێـژەی بارانبارینی شارۆچـكەی چەمـچەماڵ لـەنێوان( ٤٠٠-١٠٠٠ملم) باراندایـە، ئەمـەش بەسە بۆ پێگەیشتنی ئەو جۆرە دانەوێڵانە.

٢- بەروبومە پاقلەمەنییـەكان: زیـاتر نیـسك و نـۆك دەگرێتـەوە كەلەچـینەكانی سەرەوەی چەرموودا دۆزراونەتەوەو مرۆڤ بـۆ خـۆراك بـەكاری هێنـاون، هـەروەها لاسكەكانی وەكو ئالیك بەئاژەڵەكانی داوە[٢٠].

## پێنجەم- ئاژەڵ بەخێوكردن لە گوندی چەرموودا

بێگومـان لـەم گونـدەدا بۆیەكـەمجار ئـاژەڵ مـاڵیكراوە وەك مـەرو بـزن و و بـەراز[٢١]، لـە ٩٥٪ ئـەو ئێـسكانەن لەگونـدی چـەرموودا دۆزراونەتـەوە ئێـسكی گیانلەبەری ماڵی بوون وەك(مەڕ، بزن، سەگ، بەراز، مانگا) ئەو ئێسكە ئاژەڵانەن لەگونـدی چـەموو دۆزراونەتـەوە دوای راگرتنـی سـەگ بزنیـان بـەخێو كـردووەو خواردنی سەرەكی دانیشتوانی گوندی چەرموو بوونە، هەروەها پاشمـاوەی زۆری بەراز دۆزراوەتەوە كە بەراوردبكرێت لەگـەڵ پاشماوەكـانی تـردا لەوانـە لەئاسـتی پاشماوەی مەڕ بێت هەرچەندە هیچ بەڵگەیەك لەبەردەسـت نیـە كەتیایـدا ئامـاژە بەماڵیكردنیان بدات تەنها ئەو ددانە بچكۆلانانە نەبێت كەلەچـینەكانی سـەرەوەی چەرموودا دۆزراونەتەوە، دەتوانین بڵێن كە چەرموو ناوچەیەكی راووشكاربووە بۆ مــرۆڤ، چــونكە دەوروبــەرە گژوگیاییەكــەی و دارســتان و زنجــیرە چــیاكانی دەوروبەری وایانكردووە كە شوێنی راوی مانگـای كێـوی و ئاسـك و شـێر و ورچ و

بەرازی کێوی و گورگ و ڕێوی بیت، هەرچەندە ئێستا بەشێك لەم ئاژەلانە نەماون[22].

برەیدوود دەلێت لەسەر ڕووەکەکان ژیاون ئێستاش بەهۆی نەمانی درەخت و روتەنی ناوچەکەوە لەناوچوون، هەروەها هەتاکو ئێستاش بەرازی کێوی و گورگ و ڕێوی لەناوچەکەدا ماون، لەگەل ئەوەشدا هەروەکو بزنەکێوی ئاسك و مەر زۆر راویان لەسەرە[23].

## شەشەم - تیۆرییە سەرەتاییەکان دەربارەی سەرهەلدانی کشتوکال و ئاژەلداری لەخۆرهەلاتی نزیکدا

**١- تیۆری** oasistheoy **گوردن چایلد:**

تاسالی ١٩٥١، گوردن چایلد لەپەرتوکەکەی خۆیدا بەناوی "مرۆڤ خۆی بنیات دەنێ" دەستی دایە لێکدانەوەی تیۆرییە نوێیەکەی خۆی، ئەو رونکردنەوانەی دەربارەی سەرهەلدانی کشتوکال و ئاژەلداری لەئارادابوو پشتیان بە بەلگەوتاقیکردنەوە نەبەستبوو، تیۆرییەکەی گۆلدن چایلد دەلێ لەکۆتایی سەردەمی بەردینی کۆندا ئاوو هەوا گۆراو بووە هۆی وشکبوونەوەی دەشتاییەکانی خۆرهەلاتی نزیك و بێ ئاوی، ئەمەش بووە هۆی کۆبوونەوەی کۆمەلە مرۆڤەکان و گیان لەبەرەکان لەدەوروبەری روبارو سەرچاوە کانی و ئاوییەکان، لەئەنجامی تێکەلی و ناسینی تەواوی گیان لەبەران و گژوگیادا لەبەر پێداویستی زیاتری مرۆڤ بۆ سەرچاوە خۆراکییەکان مرۆڤ هاتە سەر ئەوەی لەرێگای کۆنترۆلکردنی زاوزێ ی هەندێ لەگیان لەبەران و مالیکردنی مەرو بزن و چاندن و پەروەردەکردنی دانەوێلەی وەکو گەنم و جۆ تا سەرچاوەی سەرەکی خۆراکی خۆی پەیدا بکات.

گۆڵدن چایلد لەم بۆچونەیدا چەند بابەتێکی هێناوەتە ئاراوە بەبێ ئەوەی بەڵگەیەکی بەدەستەوەبێ وەك بابەتێکی حاشاهەڵنەگر خستوویەتییەروو،دەڵێت لە دە هەزار ساڵ پێش ئێستاوە لە خۆرهەڵاتی نزیکدا باسی کەشوهەوا دەکات جگە لەماڵیکردنی گیان لەبەران و چاندنی گژوگیا لەشوێنە نزم و نشێوەکاندا، ئەم تیۆریەی گۆڵد چایلد زۆربەزوویی نەك تەنها جێی رەزامەندی زۆربەی زانایانی بواری کۆمەڵناسی بوو، بەڵکو بەهۆی ئەوەوە کە لەو جۆرە تیۆرانە بوو کە تاقیکردنەوەیان لەسەر بکرێت دەستکرا بە زنجیرەیەك تاقیکردنەوە لەسەری دواتر بوونە سەرچاوەی رەوشی نوێی زانستی کۆمەڵناسی(٢٤).

## ٢- تیۆری بریدوود:

یەکەم زانانی بواری کۆمەڵ ناسییە کە تیۆریەکەی گۆردن چایلدی خستە ژێر تاقیکردنەوەوە، (روبرت بریدوود) گرنگترین رەخنەی لەسەر تیۆری چایلد بۆ گۆرانی ئاووهەوا روکردنە کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بەهۆی ئەو گۆرانەوە رۆڵێکی سەرەکی داناوە، بریدوود ئاشکرایکرد لەکۆنەوە تائێستا سێ سەردەمی سەهۆڵبەندان روویداوە کەلەنێوان هەرکام لەوانە ماوەیەکی گەرمای دوورو درێژ بووە، بریدوود ریبازی بابەتەکەی باس دەکات دەڵێت ئەو شۆرش و گۆرانەی لەبواری خۆراکدا هاتە کایەوە لەئەنجامی پەرەسەندن و پەلهاویشتنی کەلتورو روکردنە تایبەتمەندی رۆژ بەرۆژ لەزیادبوی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەورووبەری هەشت هەزار ساڵ پێش زایین، دانیشتوانی بنارو دەشتاییەکانی (کەوانەی بەپیت) شارەزاییەکی تەواویان پەیداکرد لەژینگەی خۆیاندا ئەمەش بووە هۆی ماڵیکردنی هەندێ لەگیانلەبەران و کە تا ئەو کاتەش تەنها راودەکراو

کۆدەکرانەوە، بەبۆچوونی برەیدوود ئەو شوێنانە چەند شوێنێك بووە کە تیایدا بزن و مەرو گەنم و جۆ بەشێوەیەکی خۆرسکی دەستکەوتووە[٢٥].

## ٣- بۆچونی هاوسەنگی :

لەنێوان ساڵەکانی ١٩٦٠-١٩٧٠ بۆچونەکانی برەیدوودیش نەیتوانی خۆی رابگرێ بەرامبەر ئەو بەڵگە نوێیانەی بواری کۆنناسی کە زانا (بینفۆرد)ی مامۆستای شیکاگۆ هێنایە ئاراوە، بینفۆرد لەوتارێکدا لەژێر ناونیشانی "خۆگونجاندنی دوای سەردەمی پلایستوسین"لەسەر بنەمای زانستی چەند بەڵگەنامەی کۆنناسی و مرۆڤناسی بابەتێکی نوێی خستەروو لەگەڵ بۆچوون و لێکدانەوەی "فلداندی" کە لەرۆژگاری ئەمرۆدا بەنرخترین و برەودارترین بۆچونێکە دەربارەی هۆی روکردنی مرۆڤ بۆ ژیانی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری بەگوێرەی بۆچونەکەی بینفۆرد کۆمەڵگای راوچی پێش مێژوو، پاش ئەوەی بەتەواوی گونجان لەگەڵ ژیانی ژینگەی خۆیان، گەیشتە بارودۆخێکی تارادەیەک ئارام لەلایەنی دانیشتوانی ئەو کۆمەڵگایانەوە، لەسەر بنەمای بۆچوونی بینفۆرد ژمارەی دانیشتوانی ئەم کۆمەڵگایانە لە پلەیەکدا رائەگیران کە تێپەراندنی ئەم پلەیە دەبووە هۆی تێکچوونی باری کۆمەڵایەتی ئەو ژینگەیەی کەتیایدا نیشتەجێبوون، بینفۆرد دەڵێت ئەم سیستەمی خۆگونجاندنە کاتێك تێکچوو کەهاوسەنگی دانیشتوانی ئەو کۆمەڵگایانە توانای دابینکردنی خۆراک لەژینگەکەدا لاسەنگی پەیدابووە کە خۆی لەدوو خاڵدا دەبینییەوە وەك:

أ- گۆرانی ژینگەو ئاووهەوا دەبێتە هۆی کەمبونەوەی بری ئەو خۆراکەی کەئەم کۆمەڵگایانە سودی لێوەردەگرن.

ب- گۆرانی ژمارەی دانیشتوان دەیتوانی ببێتە هۆی ئەوەی رادەیان زیاتر بکات لەرادەی توانای هەولْدان بۆ کۆکردنەوەی خۆراك لەو ژینگانەدا.

## ٤- بۆچوونی کنت فلاندی:

کنت فلاندی مامۆستا لەزانکۆی مێشیگان و ئەندامی دەرکەوتوو و دیاری تیمەکەی "برەیدوود" و "فرانك هوك" لەسەر بنەمای بەلْگەیەکی نوێ بۆچونێکی تریان خستەروو کەهەرچەند بەگشتی وەك بۆچونەکانی بینفۆرد وان، بەلاْم چەند تایبەتمەندییەکیان تێدایە کە زیاتر یارمەتی دەدەن بۆ تێگەیشتن لەو دیاردە چارەنوسسازە، فلاندی لەگەلْ ئەوەدا کەبۆچوونەکانی "بیردسلْ" و بینفۆرد"ی بەکارهێناوە بۆ رونکردنەوەی روکردنە سیستەمی کشتوکالْی کۆمەلْگا فاکتەرێکی تری لەبەرچاوگرتووە وەك گۆرانکاری لەژیانی مرۆڤدا، جگە لە دلْنیانەبوون لەرێژەی بەرهەمهێنان و گۆرانی کەشوهەوا(٢٦).

## حەوتەم - هاوسەردەمەکانی چەرموو

دیارە گەرانەوە بۆ سالْی ١٩٤٨ قۆناغی حەسونە، ئەم ناونیشانەش دەگەرێتەوە بۆئەوەی لەو سالْەدا شوێنەواری گردی حەسونە نزیك پارێزگای موسلْ دۆزرایەوە کەسەرەتاکانی گوندی کشتوکالْی لەعێراقدا دەرخست، شەش چینی خوارەوەی ئەم گردە تایبەتمەندی ئەوەیان هەیە کەوا خانوی بەقور دروستکراویان تیادایە، بەشێوەیەکی باش دروستکراون، ژمارەیەکی باش گۆزەو تەنوور و ئاگردان دۆزراونەتەوە، جگە لەوەی هەرسێ شوێنەوارەکە گردەلاْنن وەك قەلاْی چەرموو، حەسونە، شمشارە کەدەکەوێتە دەشتی رانیە باشوری رۆژهەلاْتی سەیرانگای دوکان کە شانزە چینی نیشتەجێبوون تیایدا دەرکەوتووە،

بەلاّم سێ چینەکەی ژێرەوەی هیچ پاشماوەیەکی سوالّەی تیا نەدۆزراوەتەوە[٢٧]، جیاوازی نمونەی TYPOLOICCAL نێوان چەرموو و حەسونە رەنگە بەپێی جیاوازی ناوچەیی بێت لەرووی تیۆرییەوە، رەنگە چەرموو کۆسپێکی سەردەمی خۆی بووبێت لەناوچە بەرزاییەکاندا بۆ فەرهەنگ و شارستانێتی حەلفاییەکان لەپێدەشتدا، دیاریکردن بەکاربۆن دوانزە تیشکدەر لەبەردەستدایە بۆ چەرموو کە لەنێوان( ٩٢٨٠-٣٠٠ پێش زایین بۆ ٢٣١٠-٤٥٠ی پ.ز) دەگرێتەوە، بەپێی گریمانەی برەیدوود( ٦٧٥٠پ.ز )پێدەچێت بەگشتی مێژوویەکی راست بێت بۆ چەرموو، بەو پێوەرەی کەوا قۆناغی چەرموو لەپێش قۆناغی حەسونەدایە، ئەمەش پێکهاتووە لەدیاریکردنێك تەنها لەحەسونە پێنجدا بۆ( ٥٦١٠-٢٥٠پ.ز)، بەپێی بۆچوونی برەیدوود هۆ زنجیرەی کۆرنۆلۆژی بەهۆی کاربۆنی تیشکەرەوە دیاریکراوە لە چینە یەك لەدوایەکەکانی گردی شمشمارەدا پیشەسازی دەمە ئامێری سیرامیك لەچەشنی ئەوەی چەرموو لەچینەکانی حەسونەی سامەرادا بەجێ ماوە[٢٨]، بۆیە دەتوانین بلّێن چەند ناوچەیەك ئاوەدان بووە لەسەردەمی چاخی بەردینی نوێ بەواتای هاوسەردەمی چەرموون وەك (گردی قادشی گەورەو قادشی بچوك)، کە بریتی بوونە لەچەند گردێکی دەوروبەری (گتسورو نوزیێ)، هەروەها دۆزینەوەی گردی مەتارە لەنزیك شارۆچکەی تازەخورماتوو، کە دەگەرێتەوە بۆ سەردەمە ئاوەدانەکانی (حەسونە)و (سامەرا) و(عوبێد) لەدەوروبەری( ٥٠٠٠-٤٠٠٠ پ.ز) کە پاشماوەکانیشی لەگەلّ حەسونە زیاتر لەیەك دەچن[٢٩].

## هەشتەم- کنەو پشکنینەکان لە چەرموودا

یەکەم ئاماژە بۆ شوێنەواری چەرموو لەلایەن (ناسر نەقشبەندی)یەوە بووە، کەسەرپەرشتیاری گشتی شوێنەوار بووە لەچوارچێوەی گەرانە مەیدانییەکانیدا بۆ دۆزینەوەی شوێنەوار لەشارۆچکەی چەمچەماڵ ئاماژەی بەم شوێنەوارەداوە[٣٠].

دوای پشکنینی شوێنی چەرموو لەلایەن بەرێوەبەرایەتی شوێنەوارەوە لەچلەکانی سەدەی رابردوودا، دەستەیەکی شوێنەوارناسی سەر بە پەیمانگای رۆژهەلاّتناسی زانکۆی شیکاگۆ دەستیان بە کنەوپشکنین کرد لەبەهاری ١٩٤٨ بۆ ساڵی ١٩٥٥ بەسەرۆکایەتی (رۆبەرت .جەی.برەیدوود)، توانییان شانزە چینی شوێنەواری تیادا بدۆزنەوە، بەلاّم تەنها پێنج چنی سەرەوەی تایبەتمەندێتی گلێنەی تیایدابووە بەلام چینەکانی خوارەوەی تایبەتمەندێتی گلێنەی تیادا نەبووە، بۆیە زانایانی شوێنەوار چینەکانی یانزەی خوارەوەی ناودەنێن بە قۆناغی پێش گلێنەسازی (عصور ماقبل الفخار)، ئەم قۆناغەش بەدیکراوە لەهەندێك بەڵگە شوێنەوارییەکانی رۆژهەلاّتی ناوەراست وەك(اریحا) لەفەلەستین و (جتل هیوك) لە تورکیا[٣١]، بەلاّم لەیازدە چینەکەی تری چەموودا هەندیك قاپ و قاچاخ دۆزراونەتەوە کە لەبەرد دروستکراون[٣٢].

## نۆیەم- بازرگانی لە گوندی چەرموودا

دەتوانین لەوە بگەین کە بونی پەیوەندی بازرگانی یان نەبونی بەهۆی ئەو کەرەستەو ئامێرە بەردینانەوەخۆی نیشانداوە یاخود دروستبووە کەلەشوێنەوارەکەدا دۆزراوەتەوە، خودی شوێنەوارەکە خۆی ئەو کەرەستەو ئامێرانەی نەبووە ئەمەش بەڵگەوی ئەوەمان بۆ دەستنیشان دەکات کە چەرموو

پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ ناوچە دوورەکانی دیکەدا هەبووە، شێوەی ئەو بازرگانییەش هەموو ئەو بەردە ئەستیٚ چاککراوانەو دەمە چەقۆو دەمەداس و ئامێری قەبارە بچوکی دروستکراو لەبەردی شوشەی رەش چاککراو کە لەناوچەی (گۆلاو)ی شاری وانی باکوری کوردستان هێنراون(٣٣).

جگە لەوەی کەرەستەی تایبەتیتر وەکو جلوبەرگ و کەرەستەی خۆرازاندنەوە وەك ملوانکەو موررووی لەبەردو قور دروستکراوو بازنگی مەرمەر و موستیلەو ئامێری هارینی رەنگەکان و قاپ و قاچاخی ناو ماڵ و کەوچك و دەرزی دروماں دروستکراو لەئێسقان و سەرەتەشی دروستکراو لەبەردەئەستێش لەم شوێنەوارە دۆزراوەتەوە، کە باری پێشکەوتوی دانیشتوانی چەرموو دەردەخات(٣٤).

زۆربەی سەرچاوەکان ئەوە دەگەیەنن کە جۆ لەگوندی چەرموو، مەتارە، گوێزراوەتەوە بۆ باشوری عێراق، کە ئەمەش سەرەتاییەکی بازرگانی ناوخۆیی سەردەماکانی پێش مێژوو بووە بەرەو باشوری عێراق، چونکە نرخی هەرزانتربووە لەگەنم جگە لەوەی پێش گەنج دێتە بەرهەم و دەدورێتەوە(٣٥).

## دەیەم- باری کۆمەڵایەتی لەگوندی چەرموودا

بێگومان لەراستیدا دەتوانین بڵێین زانیاری زۆر ورد بەرچاو ناکەون دەربارەی ژیانی کۆمەڵایەتی لەم گوندەدا، تەنها ئەو ئەنجامانە نەبێت یاخود دۆزینەوەکان نەبێت کە هێماو ئاماژەن بۆ چۆنێتی ژیانی کۆمەڵایەتی لەم گوندەدا. لەبەرئەوەی ژیانیان لەسەر کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردن بووە، گوندەکەش لەچەند خێزانێك پێکهاتوە لەوەش دەچێت هەموو ئەندامێکی ئەم کۆمەڵگایە مرۆیەك بووبێت ئەو کارانەی سەرشانی کەپێی سپێردراوە لەقۆناغەکانی ژیانید

واتە لەدایکبوونییەوە هەتا مردنی جێبەجێی کردووە، بۆئەنجامدانی هەموو کات پەنای بردووەتە بەر سروشت و ملکەچی بووە، دەشێت لەو سەردەمەدا گوندی چەرموو جۆرە دیموکراسیەتێکی تیادا بووبێت بەجۆرێك یەکێتیە کۆمەڵایەتییەگان کە پێوە پەیوەست بووە، یەکێتیەکی وابووبێت لەسەر بنەمای خزمایەتی هاتبێتە کایەوە، لەشێوەی خێزانی باوکایەتیدا رێکیان خستبێت، بە پێوانەی بەڵگەی رەگەزی هەموو کەسێك لەناو کۆمەڵگەدا لەو سەردەمەدا بۆی هەبووە موڵکایەتی تایبەتی خۆی هەبووبێت[٣٦].

دۆزینەوەی یەکەمین پەیکەری خوداوەندی دایکیش لەم گوندەدا نیشانەی ئەوەیە کە خەڵکی چەرموولەکۆندا رێزی زۆریان لە ژن گرتووە[٣٧]، جگە لەوەی بەواتا بەپیت و فەری زەوی و هێنانە بەرهەمی بەروبووم دەکات کە بە خودای دایك ناسراوە، دانیشتوانی چەرموو بایەخێکی تەواویان بەئاژەڵە نێرینە داوە بەتایبەت لەو ژمارە زۆرانەی دەردەکەون کەلە کنەو پشکنینەکاندا دۆزراونەتەوەو بەجوانی دروستکراون[٣٨].

**سەرچاوەکان:**

*-خوینەری بەریز ئەم بابەتەی بەردەستت بەشیکە لەو تویژینەوەیەی کە لە داهاتودا لەسەر بەشیك لە شوینەوارەکانی ناوچەی چم چماڵ بلاودەبیتەوە.

١- بۆ زانیاری زیاتر بروانە السید عبدالرزاق الحسنی، العراق القدیما وحدیثا،مطبعة العرفان،١٩٥٨،ص٢٢٦.

٢- بێگومان ژمارەیەکی زۆر شوێنەوار بونی هەیە لەسنوری ناوەندی چەمچەماڵ کەئێمە نەماتوانیوە ئاماژە بەهەمووی بکەین، بۆ زانیاری زیاتر بروانە مدیریة الاثار عامة، مواقع الاثریة العراق،نشرة مطبعة فی مطبعة حکومة، بغداد،١٩٧٠،ص ١٩٩ ومابعدها.

٣-وانەکانی دکتورە رافیدە عەبدولا، زانکۆی سلێمانی،بەشی مێژوو، قۆناغی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٣.
تەها باقر و اخرون، تاریخ العراق القدیم، الجزء الاول،مطبعة جامعة صلاحدین،اربیل،١٩٨٧،ص٧٣ ومابعدها.

٤-سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)، گۆرانە ئابورییەکانی کەرکوك لەروانگەی سەردەمە مێژووییەکانەوە،چاپی یەکەم،دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی،سلێمانی،٢٠٠٩،ل١٤.

٥-طة باقر واخرون،تاريخ العراق القديم،جزء الاول، المصدر السابق،ص ٧٩.

٦-پەخشان عەبدولا محمد، جرمو من مستوطنات الاولى فى کوردستان، گۆڤاری هەزارمێرد،ژمارە ٩ی ساڵی سێیەم ئەیلولی ١٩٩٩،ص١٧٠.

٧-ئومێد خەتاب، چەمچەماڵ کانگایەك لەشوێنەواری زێرین ،رۆژنامەی چەرموو، ژمارە ٢٧ی ساڵی سێیەم ٢٠٠٩/٩/١٢، ل ٦.

٨- یاسین صابر صالح،ئینسکلۆپیدیای گشتی، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم،سلێمانی، ٢٠٠٥،ل ٤٠٤ .

٩- دکتور جمال رشید ئەحمەد و دکتور فوزی رشید، تاريخ الكرد القديم، **مطبعةجامعة** صلاحدين،اربيل، ١٩٩٠،ص ٢٨.

١٠- زەردەشت کەمال، شوێنەواری قەڵای چەرموو چاخی بەردینی نوێ لەرووی ئابوری و کۆمەڵایەتییەوە، گۆڤاری هەزارمێرد،ژمارە ٢٧ی ساڵی دووەمی ئازاری ١٩٩٩،ل٦.

١١- کامەران کوێخا جەلال-مێژووی کۆنی کەرکوك لەبەردەم رۆشنایی دەقەکانی نوزیدا-چاپی یەکەم-چاپخانەی خانی-هەولێر ٢٠٠٨-ل ٦٦.

١٢- پاتر یسیاد نێسلی، کامیل نەجاری، چاخی بەردین،چاپی یەکەم، چاپخانەی رۆژهەلات، هەولێر بەبێ ساڵی ساڵی چاپ ل ل ٣٣-٤٧وە دواتری.

١٣- سمکۆ بەهرۆز محەمەد (ئەژی)،مێژووی سەردەمی کارگێری و بەرێوەبەرایتییەکانی پارێزگای کەرکوك، چاپی یەکەم،چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی، کەرکوك، ٢٠٠٥، ل٢٠١.

١٤- ط باقر واخرون، المصدر السابق، ص ٨٢.

١٥-سەروەر ئەحمەد کەری، چەمچەماڵ بەر لەمەملەکەتی ئاشور تا حکومەتی هەرێم، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٣ ل٢٨.

١٦- پاتر یشیاد.تتسلی، چاخی بەردین ، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٣.

١٧- کەمەران کوێخا جەلال، مێژووی کۆنی کەرکوك،سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٧.

١٨-ط باقر واخرون،تاريخ العراق القديم،جزء الاول، المصدر السابق، ص٨٢.

١٩- سمكـۆ بـەهرۆز مـەحموود (ئـەژی)، گۆرانـە ئابوورییـەكانی كـەركوك لەروانگـەی سـەردەمە مێژووییەكانەوە، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧.

٢٠- زەردەشـت كـەمال، شـوێنەواری قـەلای چـەرموو چـاخی بـەردینی نـوێ لـەرووی ئـابوری و كۆمەلایەتییەوە،سەرچاوەی پێشوو، ل٦.

٢١- دكتور جمال رشيد ئەحمەد و دكتور فەوزی رشيد، المصدر السابق .ص ٢٨.

٢٢- سمكـۆ بـەهرۆز مـەحموود (ئـەژی)، گۆرانـە ئابوورییـەكانی كـەركوك لەروانگـەی سـەردەمە مێژووییەكانەوە، سەرچاوەی پێشوو، ل ل١٦-١٧.

٢٣- سەروەر ئەحمەد كەريم، چەمچەماڵ بەر لەمەملەكەتی ئاشور تا حكومەتی هـەرێم، سەرچـاوەی پێشوو، ل ٢٨.

٢٤- عەباس عەلی زادە، سەرهەڵدانی كشتوكاڵ و ئاژەڵداری لەخۆرهەلاتی نزيكدا لەروانگـەی زانـستی نوێی كۆنناسييەوە، و:حەسەن عەبدولكـەريم،گۆڤاری هـەزارمێرد- ژمـارە ١٠-سـالی سـێيەم كـانونی يەكەم ١٩٩٩.ل ل ٨-٩.

٢٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ل ٩-١٠.

٢٦- هەمان سەرچاوەە ل ١٦.

٢٧- ئومێد خەتاب-چەمچەماڵ كانگايەك لەشوێنەواری زێرين، سەرچاوەی پێشوو، ل٦.

٢٨-پێدەر مۆر يەنسن، چەردەيەك دەربارەی كۆرنۆلۆژيای كۆمەلگا بەراييەكان لە گوندی كشتوكاڵی لەباكوری عێراقدا، گۆڤاری هەزارمێرد، ژمارەی ٩ی سالّی سێيەم،ئەيلوولی ١٩٩٩،ل ١٤٤.

٢٩- سمكـۆ بـەهرۆز مـەحموود (ئـەژی)، گۆرانـە ئابوورییـەكانی كـەركوك لەروانگـەی سـەردەمە مێژووییەكانەوە، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩.

٣٠- پەخشان عەبدولا محەمەد، جرمو مىن مستوطنات اولى فی كردستان، المصدر السابق ، ص ١٧٠.

* روبەرت.جەی.بريدوود بەناوبانگترين زانـای شوێنەوارناسـی ئەمريكيـەو مامۆسـتای رەگەزناسـی و جيهـانی شوێنەوارناسـييە لـەزانكۆی شـيكاگۆ، ناوبـانگی كارەكـانی لەكوردسـتاندا پەيـداكردووەو كنەوپشكنينی زانستی لەيەكـەم گونـدی كـشتوكالّيدا ئەنجامـداوە لـەنێوان سـالانی ١٩٤٨-١٩٥٥ز، كەمال نوری مەعروف، تيرۆژە تيشكێك بۆسەر شوێنەواری بەردە بەلەك، گۆڤاری هەزارمێرد، ژمارەی ٧ی سالّی دووەم، ئازاری ١٩٩٩، ل ٤٣.

٣١- دكتور جمال رشيد ئەحمەد و دكتور فەوزی رەشيد- المصدر السابق،ص٢٨.

٣٢- زەردەشـت كەمال،شـوێنەواری قـەلای چـەرموو چـاخی بـەردینی نـوێ لـەرووی ئـاوبوری و كۆمەلایەتییەوە، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢.

٣٣- هەمان سەرچاوە ل

٣٤- سەروەر ئەحمەد کەریم، سەرچاوەی پێشوو،ل ل ٢٨-٢٩.

٣٥- سمکۆ بەهرۆز مەحموود (ئەژی)، گۆرانە ئابوورییەکانی کەرکوك لەروانگەی سەردەمە مێژووییەکانەوە، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠.

٣٦- زەردەشت کەماڵ، شوێنەواری قەڵای چەرموو چاخی بەردینی نوێ لەرووی ئاوبوری و کۆمەڵایەتییەوە، سەرچاوەی پێشوو،ل ١٢.

٣٧- سەروەر ئەحمەد کەریم، سەرچاوەی پێشوو،ل ٢٩.

٣٨- ط باقر واخرون، تاریخ العراق القدیم، جزء الاول-المصدر السابق، ص ٨٤، زەردەشت کەماڵ، شوێنەواری قەڵای چەرموو چاخی بەردینی نوێ لەرووی ئابوری و کۆمەڵایەتییەوە، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١.

# دەیسەمی کوڕی ئیبراهیمی کوردی فەرمانڕەوای ئازەربیجان( ٣١٥ ـ ٣٤٦ك/ ٩٢٦ ـ ٩٥٦ز)

نوزاد خالد رؤوف

ئەم توێژینەوەیە بریتیە لە خستنەڕوی ئەو ڕوداو و پێشهاتانەی لە سەردەمی دەسەلاتی سەرکردەیەکی کورد بەناوی (دەیسەمی کوڕی ئیبراهیمی کوردی ) ڕویانداوە کە بۆ ماوەیەك فەرمانڕەوایەتی هەرێمی ئازەربیجانی کردووە ، ناوبراو وەك کوردێك ڕۆڵی کارای لەو ئالۆگۆڕە سیاسی و سەربازیانە بینیوە لە نێوان سالآنی (٣١٥ـ ٣٤٦ك/ ٩٢٦ـ ٩٥٦ز) لە هەرێمی ئازەربیجان و توانیویەتی بۆ ماوەیەك فەرمانڕەوایەتی ئەو هەرێمە بکات، توێژینەوەکەمان بەسەر دوو بەشدا دابەش کردووە، هەریەك لە بەشەکانیش لە دوو تەوەرە پێك دێت.

## بەشی یەکەم: بەهێزبوونی پێگەو دەسەلاتی دەیسەم لە ئازەربیجان

### تەوەری یەکەم: دەیسەم و گرتنەدەستی دەسەلات لە ئازەربیجان[١]

دەیسەم کوڕی ئیبراهیمی کوردیە ، سەبارەت بەناوی باوکی دەیسەم بیروڕای جیاواز هەیە لە نێوان مێژوو نوسان و سەرچاوەکانی نزیك لە ماوەی حوکمی دەیسەم ، ئیبن حەوقەل بە( دیسم بن شاذلویة ) ناوی هێناوە [٢]، بەلام هەریەکە لە مسکویە وابن الاثیر و بەناوی (دیسم بن ابراهیم الکردی) ناویان هێناوە [٣] ، باوکی دەسیەم یەکیك بووە لە هاوکارانی هارون شاری[٤] کاتێك

هارون کوژرا ئەو ڕای کرد بۆ ئازەربیجان و لەگەڵ کچی سەرکردەیەکی کوردی ئەویێ هاوسەرگیری کردو لەدەرئەنجامی ئەم هاوسەرگیریە دەیسەم لەدایك بوو[٥]. لەسەرچاوەکاندا ئاماژە بە ناوی ئەو سەرکردە کوردە نەکراوە کە باوکی دەیسەم هاوسەرگیری لەگەڵ کچەکەی کردووە

دەیسەم لە ئازەربیجان گەورە بوو و پەیوەندی کرد بە فەرمانڕەوای ئازەربیجان کەناوی یوسف بن ابی ساج بوو لەلای ئەویش پلە کانی سوپای بڕی و تاکو بوە جێگری والی، لەکاتی سەرقاڵبوونی بە شەڕەکانەوە کاروباری والی ئەنجام دەدا، ابن ابی ساج لە ساڵی( ٣١٥ك/٩٢٧ز)لەشەڕێکدا لەگەڵ قەرامیتەکان بەدیل گیراو دواترکوشتیان ، لەدوای ئەو دەیسم بوو بە والی ئازەربیجان [٦] لێکۆڵەرێك پێی وایە ساڵی ٣١٥ك کە ساڵی کوژرانی یوسف بن ابی ساج د بەسەرەتای فەرمانڕەوایەتی دەیسەم دادەنرێت لە ئازەربیجان[٧] بەڵام سەبارەت بە چۆنیەتی گرتنەدەستی دەسەڵات لەلایەن دەیسەمەوە سەرچاوەکان ئاماژەیەکی ڕون نادەن بەدەستەوە ، نەك هەر لەو ماوەیەدا باسی گرتنەدەستی دەسەڵات لەلایەن دەیسەمەوە ناکەن،بەڵکو ناوی دەیسەم ١٠ ساڵ دواتر دەردەکەوێت لەسەرچاوەکاندا لەکاتی هێرشەکەی لەشکری بۆسەر ناوچەی ئازەربیجان ، لەتەوەری دووەمدا باسی دەکەین.

## تەوەری دووەم: ڕووبەڕووبوونەوەی نێوان دەیسەم و لەشکری

لەساڵی(٣٢٦ك / ٩٣٨ز) لەشکری کوری مردی کە جێگری وەشمگیری فەرمانڕەوای دەوروبەری ڕەی بوو بۆ کاروباری چیا ، ویستی دەست بەسەر ئازەربیجاندا بگرێت ،بۆ ئەو مەبەستە هەڵسا بە کۆکردنەوەی خۆراك و سوپا و

بەرە و ئازەربیجان کەوتەڕێ ، لەو کاتەدا دەیسەمی کوڕی ئیبراهیمی کوردی فەرمانڕەوای ئازەربیجان بوو ، ئەویش هەڵسا بە کۆکردنەوەو پێکهێنانی سوپایەك لە کورد و چەند ڕەگەزێکی تر بۆ ڕوبەڕو بوونەوەی لەشکری[٨] .

لە ئەنجامی شەڕی نێوان هەردوولا کە ماوەی دوو مانگی خایاند سوپاکەی دەیسەم تێکشکا ، بۆجاری دووەم دەیسم سوپاکەی کۆکردەوە بەلاّم ئەم جارەش سوپاکەی تێکشکایەوە، لەشکری توانی دەست بەسەر ئازەربیجاندا بگرێت و تەنها شاری ئەردەبیل[٩]بەهۆی بەهێزی قەلاّکەی و خۆڕاگری خەڵکەکەی توانی لەبەردەم شالاّوی ئەو خۆڕابگرێت ، لەشکری گەمارۆی شارەکەیدا و بۆ ماوەیەکی درێژ گەمارۆکە بەردەوام بوو ، لەوماوەیەداسوپای لەشکری توانیان سەرکەونە سەر قەلاّکە و لە چەند لایەکەوە کونی بکەن و دەستیان بەسەر شارەکەداگرت ، خەڵکی شارەکە لە لەشکری هەڵگەڕانەوە توانیان شورای قەلاّکە چاکبکەنەوە ، پاشان دەیسەمیان لەو بارودۆخە ئاگادارکردەوە و داوای بەهاناوەچونیان لێکرد ، لەکاتێکدا خەڵکی شارەکە ڕوبەڕوی لەشکری دەبوونەوە ، دەیسەم بە خۆی سوپایەکەیەوە لە دواوە هێرشی کرد و توانی زۆر بە خراپی تێکی بشکێنێت و ژمارەیەکی زۆریشی لێکوشتن[١٠] .

لەشکری لەئەردەبیل هەلاّت و ڕۆیشت بۆلای ابن دولە لە موقان ، ئەویش زۆربەباشی پێشوازی لێکرد و یارمەتی لەشکریدا بۆ ڕوبەڕوبونەوەی دەیسەم ، لەشکری جارێکی تر توانی دەست بەسەر شارەکەدا بگرێتەوە و دەیسەم هەلاّت بۆ ڕوباری الرس[١١] ، لەشکری دەستەیەك لە سوپاکەی بۆ نارد و لەوێش دەیسەمیان تێکشکاند، دەیسەم بە ناچاری ڕوی کردە لای وەشمگیر کە

فەرمانڕەوای شاری ڕەی بوو و داوای یارمەتی پێدانی سوپای لێکرد بۆ ئەوەی دژی لەشکری بوەستێتەوە ، ئە ویش ڕازی بوو بەوە ، بۆیە دە هەزار سەربازی لە کوردو دەیلەم خڕکردەوە بۆی لەبەرامبەردا دەیسم بڕیاریدا خواردنی ئەو سوپایە دابین بکات و لە مینبەرەکانی ئازەربیجان ناوی وەشمگیر بخوێنرێتەوە و سالآنەش ٦٠ هەزار دیناری بداتێ، هەرکاتێکیش لەشکری تێکشکاند سوپاکەی بۆ بگەڕێنێتەوە، کاتێك لەشکری هەواڵی هاتنی دەیسەمی بیست ناوچەکەی جێهێشت و ڕۆیشت بۆ ئەرمینیا و لەڕێگاش دەستی گرت بەسەر شاری موصل وهەرشارێك بکەوتایەتە سەر ڕێی تالآنی دەکرد ، کاتێکیش گەیشتە ئەرمینیا خەڵکەکەی ئاگایان لێنەبوو ئەویش دەستی کرد بەتالآنکرن و بەکۆیلەکردنیان . بەڵام لە کۆتایدا ئەرمەنیەکان بۆسەیەکیان بۆنایەوە و توانیان لەشکری بکوژن زۆربەی سوپاکەشی لەناوچوو ، دوای ئەوە دەیسم توانی بەتەواوی دەست بەسەر ئازەربیجاندا بگرێتەوە [١٢].

## بەشی دووەم : قۆناغی لاوازبوونی دەیسەم و لەدەستدانی دەسەلآت

### تەوەری یەکەم: داگیرکردنی ئازەربیجان لەلایەن دەیلەمیەکانەوە

هەرچەندە زۆربەی سوپاکەی دەیسم لە کوردەکان پێك هاتبوو بەڵام دوای ئەوەی بەیارمەتی سوپای وەشمگیر توانی دەست بگرێتەوە بەسەر ئازەربیجاندا! ژمارەیەك لەسەربازانی دەیلەمی لەگەڵ سوپای دەیسەم مانەوە و لە ناوسوپاکەیدا پلەیان بەرزبۆوە ، ئەمەش تارادەیەك نیگەرانی لای سەرکردە کوردەکان دروست کردبوو ، چونکە دەیسەم زۆرپشتی پێدەبەستن لە کاروباری بەڕێوەبردندا ، لەوکاتەشدا وەزیرەکەی دەیسەم کەناوی ابوالقاسم علی کوڕی

جعفر بوو و کاتبێکی ئازەربیجانی بوو پەیوەندی لەگەڵ دەیسم تێکچو و ڕای کرد بۆ طرم و پەیوەندی کرد بە محمدی کوڕی مسافیری سەرکردەی دەیلەمیەکان و لەهەمانکاتدا دوژمنی دەیەسم بوو ، لەوکاتەدا ناکۆکی کەوتبووە نێوان محمد و وەهسوزان[١٣] و مەرزەبانی[١٤] کوڕی و مەرزەبان توانی دەست بەسەر زۆربەی قەڵاکانی باوکیدا بگرێت ، بۆیە علی کوڕی جعفر چووە پاڵ مەرزەبان و باسی دەوڵەمەندی و زۆری ماڵ و سامان و ئەو پێگە گرنگەی ئازەربیجانی بۆ مەرزەبان کرد و هەردووکیان لەو بارەیەوە ڕێککەوتن ، علی لەسەر مەزهەبی باتنی شیعی بوو بۆیە مەرزەبان ڕێگەی پێدا بەئازادی بانگەشە بۆ مەزهەبەکەی خۆی بکا[١٥].

علی کوڕی جعفر دەیزانی کێ لە دەیسم ڕازیە و کێ لێی نارازیە جا چ لەسیاسەتی بێت یان لە مەزهەبی دەیسم ، چونکە دەیسەم و باوکیشی لەسەر مەزهەبی الشراة (مەزهەبێکی خەواریجی بوو) بوون ، بۆیە توانی لایەنگری دەیلەمیەکانی ناو سوپای دەیسم بۆلای خۆی ڕابکێشێت ، پاش ئەوەی مەرزەبان لەوە دڵنیابوو بە سوپایەکەوە لە( ٣٣٠ك /٩٤٢ز)بەرەو ئازەربیجان کەوتەڕێ و لەگەڵ دەیسەم کەوتەشەڕکردن ، لەوکاتەدا دەیلەمیەکان و هەندێ لە کوردەکانیش ڕیزەکانی سوپای دەیسەمیان جێهێشت و چوونەپاڵ سوپای مەرزەبان ، ئەمەش کاریگەری هەبوو لەسەر تێکشکانی سوپای دەیسەم و بەخۆی و ئەو سەربازانەی لەگەڵی بوون ڕای کرد بۆ ئەرمینیا و زۆربەی ناوچەکانی ئازەربیجان کەوتنە ژێردەستی مەرزەبان[١٦].

دوای ئەوەی علی کوڕی جعفر چوو بۆ تەبرێز[١٧] ، پاش ئەوەی دەوڵە ... ی و بەهێزی شوراکانی شارەکەی بۆ دەرکەوت، بۆ هێنانەدی

خواستەکانی خۆی ویستی دەست بەسەر شارەکەدا بگرێت و لە مەرزەبان هەڵبگەڕێتەوە ، بۆ ئەو مەبەستەش نامەی بۆ دەیسەم نارد و بانگهێشتی کرد ، بەڵێنی پێدا کە لەگەڵیدا لەدژی دەیلەمیەکان بجەنگێ ، لەوەڵامدا دەیسەم پێی وت تاکو ئەو کاتەی شەڕلەگەڵ دەیلەمیەکان نەکەیت بڕوات پێناکەم ، بۆیە لەوکاتەدا خەڵکی تەبریز لەدەسەلاتی دەیلەمیەکان هەڵگەڕانەوە و ژمارەیەکیان لێکوشتن و لەشارەکە وەدەریان نان ، داوایان لەدەیسەم کرد کەبێتەوە و یارمەتیان بدات، دەیسەم لەگەڵ ئەو سەربازانەی کەلەگەڵی مابوون هاتەوە تەبریز ، لەهەمان کاتیشدا کاتێك کوردەکانی لای مەرزەبان کەهەواڵی هاتنەوەی دەیسەمیان بیست ئەویان جێهێشت و چوونەوە لای دەیسەم ، دەیسەم کەوتەوە جەنگان دژی دەیلەمیەکان ، بەڵام دوبارە دەیلەمیەکان سەرکەوتنەوە بەسەریدا و گەمارۆی تەبریزیشیان دایەوە ، جارێکی تر علی کوڕی جعفر خیانەتی لە دەیسەم کردەوە و لەگەڵ مەرزەبان ڕێککەوتنەوە و ئامادەیی خۆشی بۆ تەسلیم بون دەربڕی ، ئەمەش دەیسەمی ناچار کرد تەبریز جێبهێڵێت و بچێت بۆ ئەردەبیل ، مەرزەبان یەکسەر بەشێك لە سوپاکەی ناردو گەمارۆی شاری ئەردەبیلی دا[١٨].

دەیسەم لە ئەردەبیل خۆی ڕێکخستەوە ودوو بارە کەسێکی تری غەیرە کوردی بەناوی ابا عبدالله محمد بن احمدی النعیمی کردە وەزیر و ڕاوێژکاری خۆی لە جێگای علی بن جعفر، ئاماژە بەوە دەکرێت کە ئەم وەزیرە لەلایەن مەرزەبانەوە نێردراوە بۆ ئەوەی ببێتە وەزیری دەیسەم [١٩]، لەدیاری کردنی ئەم وەزیرە و وەزیرەکانی تریش ئاماژە بەو بنەمایانە نەکراوە کە دەیسەم بۆ هەڵبژاردنی وەزیرەکان ڕەچاوی کردوون ، بۆیە دەبینین وەزیرەکانی لەدواوە

گورزی کوشندەی لێدەدەن و دەبنە هۆکاری سەرەکی لە شکستەکانی.

نعیمی هەر لەسەرەتاوە مەبەستی فێڵکردنی لە دەیسەم هەبوو بۆ ئەو مەبەستەش داوای لە دەیسەم کرد کە لەگەڵ مەرزەبان ڕێکبکەوێت و ملکەچی خۆی بۆ دەربڕێت ، بۆیە پێی ڕاگەیاند ئەگەر گەمارۆکە درێژە بکێشێت ئەوا خەڵکی شارەکە بێزاردەبن و دەرگای شارەکە بۆ مەرزەبان دەکەنەوە، دواجار دەیسەم بە ڕێککەوتن لەگەڵ مەرزەبان ڕازی بوو و کۆمەڵێك لە کەسە دیار و پیاوماقوڵانی شارەکەی نارد بۆ لای بەمەبەستی ڕێککەوتن و وەرگرتنی ئەمان ، لەو کاتەدا النعیمی وەزیری ئەم پەیامەی بۆ مەرزەبان نارد ( ئەو سەرکردانە دەستگیربکە و مەیان نێرەوە شارەکە تاوەکو ئەو کاتەی دەیسەم دێت بۆلات بۆئەوەی هەڵویستی ئەو نەگۆڕێ و هەروەها ئەگەر خەڵکی شارەکە ببینن سەرکردەو کەسایەتیەدیارەکانیان گیراوە کۆدەبنەوە و هیچ کاتی پێنادەن و... بێجگە لە دەرچوونی ئەو لە زوترین و خێراترین کات بە هیچ شتێکی دیکە ڕازی نابن )[٢٠].

مەرزەبانیش ئەو پلانەی جێبەجێ کرد، خەڵکی شارەکەش دەیسەمیان ناچارکرد بچێت بۆ لای مەرزەبان و ئەویش ڕێزی لێناو پاشان سەرکردەکانی شارەکەی بەردا و دەستی بەسەر شارەکەشداگرت ، بەم شێوەیە مەرزەبان توانی دەست بەسەر هەموو ئازەربیجاندا بگرێت و لەسەر مینبەرەکانیش ناوی دەهێنرا، دواتر ڕێگەی بەدەیسەم دا کەلەگەڵ خزم و کەسوکارەکەی لە قەڵای طرم[٢١] نیشتەجێبن لە بەرانبەر دا دەبوو ساڵانە ٣٠ هەزار دینار و هەندێك ئازوخە بدەن بە مەرزەبان[٢٢].

## تەوەری دووەم: دەستگرتنەوەی دەیسەم بەسەر ئازەربیجاندا

لەساڵی( ۳۳۷ك/۹٤۹ز) بەهۆی فراوانبونی دەسەلاتی مەرزەبان و خواستی فراوانخوازی ئەو و ترسی رکن الدولە[۲۳]ی بوەیهی لێی پەیوەندیەکانی نێوان هەردولا تێکچوو و لەشەڕێکدا کە لەنێوان هەردوو لادا ڕویدا مەرزەبان گیراو لە قەلای سمیرم[۲٤] بەند کرا ، رکن الدولەکەسێکی بەناوی محمد عبدالرزاق ی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ئازەربیجان لە جێگای مەرزەبان دیاری کرد [۲٥].

گیرانی مەرزەبان و ئەو پێشهاتانەی لەو ماوەیەدا ڕویاندا ڕێخۆشەر بوون بۆ ئەوەی جارێکی تر دەیسەم دەست بگرێتەوە بەسەر ئازەربیجاندا ، لەو کاتەدا دەیلەمیەکان بەسەرۆکایەتی وەهسوزانی برای مەرزەبان بۆ ڕوبەڕوبوونەوەی سوپاکەی ڕوکن الدولە ناچاربوون دەیسەم لە قەلاکە (طرم)ئازاد بکەن چونکە( ئەو سەرکردەیەکی کۆنی ئازەربیجان بوو و کوردەکانیش گوێڕایەڵی بوون)[۲٦] پاشان دەیسەم بەپاڵپشتی کورد و دەیلەمیەکان توانی محمد بن عبدالرزاق تێکبشکێنێ و تەواوی ئازەربیجان بخاتە ژێردەستی خۆیەوە [۲۷] .

بالادەستی دەیسەم بەسەر ئازەربیجاندا زۆری نەخایاند ، مەرزەبان توانی فەرماندەی قەلای سمیرم بکوژێت و خۆی ڕزگار بکات، پاشان سوپایەکی گەورەی لە دەیلەمی و لایەنگرانی خۆی کۆکردەوە نامەشی نارد بۆلای دەیلەمیەکانی لای دەیسەم و بەرەو ئەردەبیل ڕۆی ، لەوکاتەدا دەیسەم هەواڵی هاتنی مەرزەبانی بیست و بۆ ڕوبەڕوبونەوەی ئەو ڕۆیی ، لەو کاتەدا دەیلەمیەکان لێی هەڵگەڕانەوە و سوپاکەی تێك شکا و مەرزەبان دەستی گرت بەسەر ئەردەبیلدا[۲۸] .

دەیسەم بەناچاری لە ئەرمینیاوە ڕۆیشت بۆ بەغداد و لە لایەن معزالدولە[۲۹]

ڕێزێکی زۆری لێگیراو ژیانێکی خۆشیشی بۆ دابینکرا ، داواشی له معزالدولەکرد سوپای پێبدات ، بەڵام ئەو داواکاریەی ڕەت کردەوە چونکە مەرزەبان لەگەڵ ركن الدولەی برای ئاشت ببۆوە و ئەو نەیدەتوانی لە دژی براکەی بجولێتەوە، پاشان دەیسەم لە (٣٤٣ك/٩٥٤ز )بەغدای جێهێشت و چوو بۆ موصل و پاشان بۆ شام [٣٠].

دوای ئەوەی هەندێ لە کوردەکان داوایان لێکرد بگەڕێتەوە بۆ ئازەربیجان ، دەیسم لە شامەوە گەڕایەوە بۆ شاری سەڵماس [٣١]، لەوکاتەدا مەرزەبات سەرکردەیەکی خۆی بۆ ڕوبەڕوبوونەوەی نارد بەڵام بە تێکشکاوی گەڕایەوە ، بۆیە پاشان بۆ خۆی بەرەو شاری سەڵماس ڕۆیی[٣٢].

لەو کاتەدا دەیسەم شارەکەی جێهێشت و چوو بۆ لای ابن دیرانی[٣٣] لە ئەرمینیا ، مەرزەبان نوسراوێکی نارد بۆلای ابن دیرانی و فەرمانی پێکرد دەیسەم دەستگیربکات ، سەرەتا ڕەتی کردەوە بەڵام دواتر لەترسی مەرزەبان دەستگیری کرد و پاشان تەسلیمی مەزەبانی کرد ، ئەویش چاوی کوێرکردوو بەندی کرد، پاش مردنی مەرزەبان لەساڵی (٣٤٦ك/٩٥٧ز) شوێنکەوتوانی دەیسەمیان کوشت [٣٤].

جێگەی ئاماژەپێدانە وادیارە دەیسەم بەتەواوی سەربەخۆ بووە بەبەڵگەی ئەوەی بەناوی خۆیەوە سکەی لێداوە و تائێستاش چەندانەیەك لە دراوەکانی ماون و پارێزراون [٣٥].

## سەرچاوە و پەراوێزەکان

---

(١) ئازەربیجان : ناوچەیەکی فراوانە دەکەوێتە نێوان کوهستان و ئاران ، چەندین شار و گوند و شاخ و ڕوبار دەکەونە سنوری ئەو هەرێمەوە . القزويني، اثار البلاد واخبار العباد ،دار صادر ، بيروت ، ص ٢٨٤ "هەروەها بڕوانە پاشکۆی ژمارە( ١).

(٢) ابن حوقل ، صورة الارض ، مطبعة دار مكتبة الحياة للطباعة والنشر ، بيروت، ١٩٩٢،،ص ٢٨٧.

(٣) مسكويه، تجارب الامم و تعاقب الهمم ، تحقيق : سيد كسروى حسين ، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت ، ٢٠٠٣ ،،ج٥ ،ص٢٤٩" ابن الاثير ، الكامل فى التاريخ ، ، راجعه و صححه : د. محمد يوسف الدقاق ، ط١، دارالكتب العلمية ، بيروت ، ١٩٨٧، ج٧، ص١٤٠،

(٤) هارون الشاری : سەرکردەیەکی خەواریجی بوو ، چەندین جار لەگەڵ سوپای عەباسیەکان جەنگاوە سنوری چالاکیەکانی ئەو لەدەوروبەری موصل و تکریت بووە ، لە هەندێ لەشەڕەکاندا توانیویەتی سەربکەویت و دەست بەسەر شاری موسڵدا بگرێت ، بەڵام لە ساڵی( ٢٨٣ك /٨٩٦ز)لەسەردەمی خەلافەتی موعتەزەد (٢٧٩ـ ٢٨٩ك/ ٨٩٢ ــ ٩٠٢ز))لەشەڕێکدا تێکدەشکێت و دەستگیر دەکرێت، پاشان دەکوژرێت. ابن الاثير، الكامل ،ج٦،ص٢٨٤–٢٨٥.

(٥) مسكويه ، تجارب الامم،ج٥ ص٢٥٠ " قادر محمد حسن ، الامارات الكردية في العهد البويهي ، ط١ ، مطبعة روزهةلات ، اربيل ، ٢٠١١ ص٢٣.

(٦) ابن الجوزي ، منتظم في تاريخ الملوك والأمم، ،دراسة وتحقيق :محمد عبدالقادر عطاو مصطفى عبدالقادر عطا، ط١،دار الكتب العلمية ، بيروت ،١٩٩٢،ج١٣ ، ص ٢٦٥" زرار صديق تۆفيق ، كوردو كوردستان لە ڕۆژگاری خیلافەی ئیسلامیدا، چ٢ ، چاپخانەی ڕۆژهەلات ، هەولێر،٢٠١٢،ل ١١٦–١٧" ابن الاثير ، الكامل ، ج٧ ،ص ١٦٤.

(٧) زرار صديق توفيق ، الكرد في العصر العباسي حتى مجيء البويهين (١٣٢–٣٣٤هـ/٧٤٩–٩٤٦م) اطروحة ماجستير غير منشورة مقدمة الى كلية الاداب بجامعة صلاح الدين (اربيل :١٩٩٤) ص ١٥٧.

(٨) ابن الاثير ، الكامل ، ج٧ ، ص١٤٠" ابن خلدون ، تاريخ ابن خلدون ، تحقيق: خليل شحادة ، دارالفكر للطباعة والنشر، لبنان ،٢٠٠٠، ج٣،ص ٥٠٤.

(٩) ئەردەبیل : بەناوبانگترین و گەورەترین شاری ئازەربیجانە ، بە شورا دەورە دراوە ، خاکێکی بەپیت و ئاوداری هەیە ابن حوقل ،،صورة الارض ، ص ٢٨٧ " یاقوت الحموي ، معجم البلدان، تحقیق : عمر عبدالسلام تدمیری، دارصادر ، بیروت ، ١٩٧٧، ج١ ص ١٤٥" القزویني ، اثار البلاد ، ص٢٩١.

(١٠) مسکویه ، تجارب الامم، ج٥ ص ٢٢١ " ابن الاثیر ، الکامل ، ص١٤٠- ١٤١ " احمد عبدالعزیز محمود ، الامارة الهذبانیة الکردیة في اذربیجان و اربیل والجزیرة الفراتیة ، مطبعة وزارة التربیة ، اربیل ، ٢٠٠٦، ص٨٠.

(١١) ڕوباری الرس : ئەم ڕوبارە لە ناوخاکی ئەرمینیاوە هەڵدەقوڵێت و بەسنوری ئازەربیجاندا تێپەڕدەبێت ، ڕوبارێکی گەورەیە و ئاوێکی تیژ ڕەوی هەیە ، صورة الارض ص ٢٩٦" القزویني ، اثار البلاد ، ص٢٨٥.

(١٢) مسکویه ، تجارب الامم ، ج٥ ، ص ٢٢١-٢٢٤"ابن الاثیر ، الکامل ، ج٧ ص١٤١-١٤٢ " .زرار صدیق تۆفیق ، الکوردفي العصر العباسي، ص ١٥٨-١٥٩.

(١٣) وەهسوزان : کوڕی محمدی کوڕی مسافیری دەیلەمیە ، کەسایەتیەکی خراپ بووە ، ئەمەش وای کردووە لەگەڵ باوکیدا نێوانیان تێکبچێت و دژایەتی یەکتری بکەن ، پاشان لەگەڵ مەرزەبانی برای توانیان دەسەلأت لەژێردەستی باوکیان دەربهێنن بۆخۆیان دەسەلأت بگرنەدەست ، دوای گیرانی مەرزەبان لەلایەن رکن الدولەوە( ٣٣٧ك/٩٤٨ن) بۆ خۆی سەرکردایەتی دەیلەمیەکانیکردووە، مسکویه ، تجارب الامم، ج٥ ،ص ٢٤٩ ، ٢٥٠،٣٠٩.

(١٤) مەرزەبان : کوڕی محمد ی موسافیر و برای وەهسوزان بوو.

(١٥) ابن خلدون ، تاریخ ابن خلدون ، ج٣ ص٥١٣-٥١٤" مسکویه ، تجارب الامم،ج٥ ص٢٤٩ -٢٥٠:" زرار صدیق تۆفیق ، الکوردفي العصر العباسي، ص١٦١.

(١٦) مسکویه ، تجارب الامم ، ج٥ ص ٢٥٠ " ابن الاثیر ، الکامل ، ج٧ ، ص١٦٥.

(١٧) تەبرێز : شارێکە لە ئازەربیجان ، لەنێوان شاری داخرقان و سەڵماسدایە . ابن حوقل ، صورة الارض ، ص ٢٨٦، ٢٨٩" هەروەها بڕوانە پاشکۆی ژمارە( ١).

(١٨) مسکویه ، تجارب الامم، ج٥ ، ص ٢٥١.

(١٩) مسکویه ، تجارب الامم، ج٥ ، ص ٢٥٢.

(٢٠) مسكويه ، تجارب الامم، ج٥ ، ص ٢٥٢ .

(٢١) قەڵای طرم : قەڵایەکە لە لەسنوری کرمان لە وڵاتی فارس ، یاقوت الحموي ، معجم البلدان ، ج٤ ، ص٣٢.

(٢٢) مسكويه ، تجارب الامم، ج٥ ، ص ٢٥٢– ٢٥٣ : ابن خلدون ، تاريخ ابن خلدون:، ج٣ ص٥١٤: احمد عبدالعزيز محمود ، الامارة الهذبانية ، ص٨٢: زرارصديق توفيق ، الكورد في العصر العباسي ، ص١٦٤–١٦٥.

(٢٣) روكن الدەولە: ناوی ئەبوعەلی حەسەن کوڕی بوەیەیە ، نازناوی رکن الدولەیە ، فەرمانڕەوای ئەسفەهان و ڕەی و هەمەدان و عێراقی عەجەم بوو. ابن خلكان ، وفيات الاعيان و أنباء ابناء الزمان ، تحقيق ، احسان عباس، مطابع دارصادر ، بيروت ،١٩٧٢،ج٢ ص ١١٨.

(٢٤) قەڵای سمیرم : ئەم قەڵایە دەکەوێت نێوان اصفهان و شيراز. القزويني ، اثار البلاد ، ص٣٩١.

(٢٥) ابن الاثير ، الكامل ،ج٧ ص ٢٢٨ : زرار ، الكورد في العصر العباسي ، ص ٨٣ .

(٢٦) مسكويه ، تجارب الامم ، ج٥ ، ص ٣٠١: قادرمحمد حسن ، الامارات الكردية ، ص ٢٨.

(٢٧) مسكويه ، تجارب الامم ، ج٥ ، ص ٣٠٨.

(٢٨) مسكويه ، تجارب الامم ، ج٥ ، ص٣٠٩.

(٢٩) معزالدولە: ناوی ئەبو حسێن ئەحمەد کوڕی ئەبو شجاع بوەیەیە، نازناوەکەی معزالدولەیە، فەرمانڕەوای عێراق و ئەهواز و کرمان بوو ، ابن خلكان ، وفيات الاعيان ،ج١ ، ص ١٧٤–١٧٥.

(٣٠) ابن الاثير ج٧ ص ٢٤٤–٢٤٥: مسكويه ، تجارب الامم ، ج٥ ، ص ٣٠٩.

(٣١) سەڵماس : شارێکی هەرێمی ئازەربیجانە ، دەکەوێتە نێوان تەبرێز و ئورمیە، القزويني، اثار البلاد ، ص ٣٩١

(٣٢) ابن الاثير ، الكامل ،ج٧ ص٢٤٥.

(٣٣) حاجيق ابن الديراني : لەسەرچاوە ئەرمەنیەکاندا بە (غغيف الظالم ) ناسراوە فەرمانڕەوای ناوچەیەکی بچوکی ئەرمینیابوو لەو ماوەیەدا، دەسەڵاتەکەی زەویەکانی وان و سلطان تا ناوچەکانی نەخجوانی دەگرتەوە ، بۆ ماوەی ٢٩

ســـاڵ حـــوکمی کـــردووە . قـــادر محمـــد حـــسن ، الامـــارات الكرديـــه ، ص ۲۷ ، انظـــر هامش رقم ٤٩.

(٣٤) مسكويه ، تجارب الامم ، ج٥ ، ص٣١٠: ابن الاثير ، الكامل ،ج٧ ص٢٥٨.

(٣٥) زرار صديق تۆفيق ، كوردو كوردستان ، ل ١١٧.




## پاشکۆکان

نەخشەی ئەرمینیا و ئازەربیجان و ئاران

سەرچاوە : ابن حوقل ، صورة الارض ، ص٢٨٦.

# ڕۆژهەڵاتناسی و ئامانجەکانی

ئامادەکردنی قوتابی: ئیسماعیل ئیبراهیم ئیسماعیل
قۆناغی سێیەمی مێژووی گشتی لە کۆلیژی ئەدەبیات

## پێشەکی

ڕۆژهەڵاتناسی بووەتە بوارێکی مەعریفی دیارو بەرچاو و بنەماو چوارچێوەو قوتابخانە گەلی خۆی هەیە کە شایەنی لێوردبوونەوەو کارلێکردنن، هەروەها هەندێك لەو لایەنانەی بایەخیان پێدەدات، بوونەتە سەنتەری زانستی و ڕۆشنبیری کە بە شێوەیەکی دەستەجەمعی توێژینەوەیان لە بارەوە دێتە ئەنجامدان. بزوتنەوەی ڕۆژهەڵاتناسی لە کاتی پەیدابوونییەوە کاری لەسەر شتێکی نەگۆڕ و دیاریکراوەوە کردووە، بۆ ئەوەش بە ئەنجامی خۆی بگات هەموو ڕێگایەکی بەکارهێناوە جا ڕێگەکە هەرچی تێچوبێت بەلایەوە گرینگ نەبووە بەڵکو گرینگ لای شتە بەرهەمهاتووەکە بووە کە کاری لەسەر کردووە، بێگومانیش ئایینی ئیسلام و موسڵمانان و خاکەکەیان ئەو شتە بووە کەوا ڕۆژهەڵاتناسی کردبوویانە ئامانج و کاریان لەسەر کردووە لە کاتی دروستبوونیەوە تاکو ئێستاش کە گۆڕان بەسەر ناوەکەشی داهاتووە. بەڵام هەر نوسراوێك یان وێنەیەك یان لێکۆڵینەوەیەك یان هەرشتێکیان لە بارەی ڕۆژهەڵات نوسیبێت جا بۆ هەر مەبەستێك بێت بۆ میللەتانی ڕۆژهەڵات گرینگی خۆی هەیە و جێگای چاوتێبڕین و لێکۆڵینەوە لەسەر کردنن چونکە بە سەرچاوەی گرینگی ئەو میللەتە دادەندرێت کە خۆیان گرنگیان بە مێژووی خۆیان نەداوە. بۆیە

دەتوانین بڵێین رۆژهەلاتناسەکان هەم لایەنی باش و هەم لایەنی خراپیشیان هەبووەو هەیە. بۆیە بابەتی لەم شێوەیە گرینگی خۆی هەیە بۆ روونکردنەوەی هۆکارو ئامانجی رۆژهەلاتناسان بۆ ئەوەی بەتەواوی لێیان تێبگەین و بۆمان روون بێتەوە کە چ مەبەستێکیان هەیە. بۆ ئەم راپۆرتەشم هەولم داوە کۆمەڵێك سەرچاوەی گرینگ بەکاربهێنم، وە لە ناوەرۆکیشەوە لە دوو تەوەرە پێکهاتووە لە تەوەرەی یەکەم باس لە پێناسە و مێژووی رۆژهەلاتناسی دەکەم، لە تەوەرەی دووەمیش باسی ئامانجەکانی رۆژهەلاتناسی دەکەم کە خۆی لە کۆمەڵێك ئامانج گرتووە کە بە روونی باسم لێوەکردوون.

## تەوەرەی یەکەم

### یەکەم/ پێناسەکانی رۆژهەلاتناسی:

بۆ ناساندنی زاراوەی رۆژهەلاتناسی (Orentalism) چەند پێناسەیەك هەیە هەندێکیان دەخەینەروو، سەرەتا با پێناسەیەکی گشتی بکەین، دەکرێ بڵێین شێوازێکی هزری رۆژئاوایە واتا دیتنی شتەکان و هەڵسوکەوت و مامەڵە لەگەڵ کردنیان بەدیدی رۆژئاوایی[١].

رۆژهەلاتناسی تەوژمێکی فیکرییە لەو لێکۆڵینەوەو دیراسە هەمەچەشنانەدا رەنگی داوەتەوە، کە دەربارەی رۆژهەلات و گەلانی موسڵمان نوسراون و تێیدا رۆژئاواییەکان لە ئاین و زمان و ئەدەب و شارستانییەت و کلتووری رۆژهەلاتیان کۆڵیوەتەوە.

ئەم تەوژمە رۆڵێکی گەورەی لە صیاغەی دیدو تیروانینی غەربییەکاندا لەسەر جیهانی ئیسلامی هەبووەو گوزارشتی لە پاشینەی فیکری ی ململانێی شارستانێتی ی نێوانیشیان دەکات[٢].

هەندێ ڕۆژئاوایی تر ڕۆژهەڵاتناسانیان ناساندووە، لەوانە ڕۆژهەڵاتناس (رودی بارت) کە دەڵێت: "ڕۆژهەڵاتناسی زانستێکە تایبەتە بە فقهی زمانی تایبەت نزیکترین شت لێی ئەوەیە بیر لەو ناوەی لێنراوە بکەینەوە، وشەی ڕۆژهەڵاتناسی لە وشەی (ڕۆژهەڵات) وەرگیراوە، وشەی ڕۆژهەڵاتیش واتا ڕۆشنایی ڕۆژ، بە گوێرەی ئەمە ڕۆژهەڵاتناسی بریتییە لە زانستی ڕۆژهەڵات یان زانستی جیانی ڕۆژڵاهەتی)). ڕۆژهەڵاتناسی ئینگلیزی (ئاربرت) پشت بە پێناسەی ئۆکسفۆرد دەبەستێت کەوا پێناسەی ڕۆژهەڵاتناس دەکات بەوەی ((هەرکەسێ لە زمانەکانی ڕۆژهەڵات و دابو نەریتەکانی قوڵبێتەوە))[٣].

ئەگەر بچینە لای عەرەب و موسڵمانان ئەوانەی باسی ئەم زاراوەیان کردووە، ئەوە دەبینین (ئیدوارد سەعید) چەند پێناسەیەکی بۆ ڕۆژڵاتناسی کردووە لەوانە: ((شێوازێکە لە بیرکردنەوەی لەسەر جیاکاری بنیادنراوە کەوا پەیوەستدارە بەبوونی مەعریفە لە نێوان ڕۆژهەڵات و نێوان ڕۆژئاوا)). ئیدوارد سەعید ئەوەشی دەخاتەسەر کە ڕۆژهەڵاتناسی((تەنها بابەتێکی سیاسی نییە یان کایەیێکی لێکۆڵینەوە بێت بە شێوەیەکی نەرێنی ڕەنگبداتەوە بە جیاوازی کەلتورەکان و لێکۆڵینەوەکان یان دامەزراوەکان، هەروەها کەڵەکەبونێك نییە بۆ کۆمەڵێکی گەورە لە دەقەکان لە بارەی ڕۆژهەڵاتەوە... پاشان دابەشبوونی ئاگایی جوگرافی بۆ دەقەکانی جوانی و زانستی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و فقهی زمانەوە)) لە بابەتێکی تر سەعید پێناسەی ڕۆژهەڵاتناسی دەکات بەوەی "کایەیێکی مەعریفەیە یان زانستییە کەوا بەهۆیەوە لە ڕۆژهەڵات دەگەیشترێت بە شێوەیەکی ڕێك وەك بابەتێك بۆ فێربوون و دۆزینەوەو جێبەجێکردن" لە شوێنێکی تر دەڵێت: ڕۆژهەڵاتناسی جۆرێکە لە باڕینی ڕۆژئاوا بەسەر ڕۆژهەڵات هەروەها بەڕێوەبردنی ڕۆژئاوایە بۆ ڕۆژهەڵات[٤]. دەکرێت بڵێین ڕۆژهەڵاتناسی

بریتیە لە هەر هەوڵێکی لێدوان و نوسینی جیهانی رۆژئاوا لەسەر رۆژهەڵات بە هەولی تاکە کەسییان بێت یان دەستەو کۆمەڵ بن، وەسفکردن بێت یان دژایەتی[٥].

رۆژهەڵاتناسی واتا ئەو دیسیپلینانەی کە ئامانجیان لێکۆڵینەوەی شارستانیەتەکانی رۆژهەڵاتە، زاراوەی رۆژهەڵاتناسی کە بە عەرەبی (استشراق)و بە فارسی(خاورشناسی)و بە فەرەنسی (Orientalisme)ی پێدەگوترێت. لە وڵاتانی رۆژهەڵاتدا بۆ یەکەم جار نووسەرە عەرەبە لوبنانیەکان لە کۆتایی سەدەی (١٩) لە جیاتی زاراوەی (Orientalisme) بەکاریان هێنا بۆ دیاریکردنی ئەو زانستەی، کە نووسەرە رۆژئاواییەکان لە ئاکامی گەشتەکانی خۆیان بەرەو رۆژهەڵات خۆیان پێوە خەریك کردبوو بۆ لێکۆڵینەوە لە میللەتانی رۆژهەڵات[٦].

## دووەم/ مێژووی رۆژهەڵاتناسی:

رایەکان لە بارەی سەرەتای رۆژهەڵاتناسی جیاوازن، هیچ سەرەتایەکی دیارو روونی بۆ پەیدابونی رۆژهەڵاتناسی بوونی نییە، بەشێوەیەك لێکۆڵەری ئەم بوارە بتوانێت مێژوویەکی بۆ دابنێت، کە تیایدا گرینگیدانی رۆژهەڵاتناسی بە زانستی نەتەوەکانی تر و کلتوور و بیروباوەڕو خورەوش و داب و نەریتەکانی کە لە رۆژهەڵات هەیە دەستی پێکردبێت. رایەکان دەربارەی سەرەتاکانی رۆژهەڵاتناسی زۆربووە تا گەیشتۆتە یانزە را، هەندێکیان مێژوویێکی دیاریکراو بە دەستەوە دەدەن، هەندێکی تر کات یان سەردەمێك لە سەردەمەکان کەوا رۆژهەڵات یان جیهان پێیدا رۆیشتووە بەدەستەوە دەدەن، سێیەمیان کاتێك نادەن بە دەستەوە بەڵکو پشت بە رووداوگەلێك یان مەبەستگەلێك کە

ڕۆژهەلاتناسی ویستوویەتی پێی بگات بەدەستەوە دەدەن، ئەمەشیان کردووتە سەرەتاکانی ڕۆژهەلاتناسی(٧). وەك هەندێك بۆ سەرەتای فتوحاتی ئیسلامی دەگەڕێننەوە، بەتایبەتی بۆ یەکەم بە یەککەیشتنی موسڵمانەکان لەگەڵ ڕۆمە بیزەنتیەکان لە هەردوو جەنگی (مونتە)و (تەبوك)(٨). بڵاوبوونەوەی شارستانیەتی ئاینی ئیسلام بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بۆ گشت لایەنەکانی جیهان پەلی هاویشت، کاریگەری هەبووە لەسەر گشت نەتەوەکانی ڕۆژهەلات و ئەفریقیا و ئیسپانیا ودوای فەرەنسا، ئەمەش دوای گەیشتنی سوپای ئیسلام بە سەرکردایەتی (عبدالرحمن الغافقی) لە جەنگی (بلاط الشهداء)(٩).

یان بۆچونێکی تر هەیە کە ڕۆژهەلاتناسی بۆ بڕیارەکانی سەرکردەی کەنیسەی مەسیحی کە نەخشەی سیاسەتی ئەوروپای بەدەستەوە بووە لە سەدەکانی ناوەڕاست، کە لە ساڵی ١٣١٢ز. ئەنجومەنی کەنیسەی ڤیەننا بڕیاری خوێندن و دراسەکانی زمانەکانی ڕۆژهەلاتی عەرەبی و عیبری و سریانی یۆنانی دەرکرد، بەپێی ئەم بڕیارەش دەستیان کرد بە وتنەوەی ئەو زمانە ڕۆژهەلاتیانە لە زانکۆ سەرەکیەکانی (پاریس، پۆلۆنیا، ئۆکسفۆرد، سلامینکا)(١٠).

هەندێکی تریان بۆ ڕۆژانی دەوڵەتانی ئومەوی لە سەدەی دووەمی کۆچی دەیگێڕنەوە، لە شام چالاکبوو بەهۆی راهیب یوحنای دیمەشق کە دوو پەرتووکی بڵاوکردەوە، ئەوانیش یەکەمیان (ژیانی محەمەد)و دووەمیان( گفتوگۆ لە نێوان گاور و موسڵمانێکدا). ئامانجیشی ڕابەرایەتی گاوران بکا لە مشتومڕیان لەگەڵ موسڵمانەکاندا(١١).

بۆچونێکی تر وا سەیری پەیدبونی ڕۆژهەلاتناسی دەکاتی کە پەیوەندییەکی ڕاستە ، و جددی بە ماوەیەك هەیە کە بە ماوەی چاکسازی ئایینی لە سەدەی شازدەهەمی زاینی ناسراوە لە ئەوروپا، ئەمەش سەرەتای سەردەمی

هێرشکردنە بۆ سەر جیهانی عەرەبی و ئیسلامی، یەکەم زانای رۆژئاوایی کە لە کاری رۆژهەلاتناسی بە دیارکەوت رۆژهەلاتناس(ولیم باستیل) بوو کەوا زۆر دلسۆز بوو بۆ کەنیسە[١٢].

یان وەك پاپای فەرەنسی (ئوربانی دووەم) لە شارۆچکەی (کلیرمۆنت) دەکەوێتە باشوری فەرەنسا لە سالی (١٠٩٥ز) بانگەوازی هەلمەتی سەربازی کرد بۆ ئەنجامدانی جەنگی پیرۆز لە دژی موسلمانان، لە تێروانینی ئەوان (کافرەکان) کە لە مێژوودا بە جەنگی (خاچ درووشمەکان) ناسراوە لەبەر ئەوەی نیشانەی خاچیان بە رەنگی سور لەسەر سینگیان بەستبوو، توانیان چەند ناوچەیەکی رۆژهەلات وەك کەنارەکانی شام و فەلەستین داگیربکەن. بەلام سەرکردەی کوردی موسلمان (سەلاحەددین ئەیوبی) لە سالی ١١٨٧و توانی رووبەروویان بوەستێت و بەرپەرچیان بداتەوە، لە ئاکام سوپای رۆژئاوایی مەسیحی بەرامبەر بە سوپای رۆژهەلاتی موسلمان شکستی هێنا. دەوترێ کە سەرەتای سەرهەلدانی بۆ هاوارەکەی (لویسی نۆیەم) دەگەرێتەوە، کە لە ٨ی ئایاری سالێ ١٢٥٠ز پاش ئەوەی لە بەرامبەر سوپای موسلمانان شکان وتی: (با بە ووشە شەڕ دەست پێبکەین بە تەنیا ئەمە لە توانای دا هەیە موسلمانان شکست پێبهێنێ)، لەمەوە دەردەکەوێ کە مێژووی رۆژهەلاتناسی بۆ سەدەی شازدەهەم دەگەرێتەوە[١٣]. وە هەر لە فەرەنسا لە سەرەتای سەدەی شازدەهەمدا بوو بە شێوەیەکی رەسمی چەسپا، ئەوەبوو لە سالی ١٥٣٠ز لە پاریس کۆلیژی شاهانە (College Royal) لە سەردەمی فرانسوای یەکەمدا کرایەوەو لەو کۆلیژەدا دەرسی زمانی یۆنانی و عیبری دەگوترایەوە. هەر لە هەمان سەردەمدا لە ئەنجامی پێشکەوتنی بازرگانی نێوان رۆژهەلات و رۆژئاوا[١٤].

پەیوەندی دیبلۆماسی و سیاسی نێوان فەرەنساو وڵاتانی رۆژهەڵات پەرەی سەند. لە سەردەمی ١٦م بەولاوە فەرەنسا بالوێزخانەی خۆی لە پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی و سەفەویی ئێراندا کردەوە ئەمە کارێکی باشی کردە سەر پێشکەوتنی پەیوەندی کەلتوری نێوان ئەوروپاو رۆژهەڵات، هێندەی پێنەچوو لەبەر بایەخی زانستەکە لە ساڵی ١٨٧٣دا یەکەمین کۆنگرەی نێو نەتەوەییانەی رۆژهەڵاتناسی بەسترا بە ناوی (المؤتمر الدولي الأول للاستشراق)[١٥].

زۆرن ئەوانەی لەسەر پەیدابوونی رۆژهەڵاتناسیان نوسیوە زۆربەیان کە لە(ئیدوارد سەعید، نزیر حمدان، زقزوق، عدنان وزان، نجیب العقیقی، هتد) پێکدێن پێیان وایە بە شێوەیەکی زانستی رۆژهەڵاتناسی بۆ ساڵی (٧١٢ك-١٣١٢ز) دەگەڕێتەوە، لەو کاتەی کۆنگرەی ڤیەنای کەنیسە بەسترا بانگەشەی دروستکردنی کۆرسی لە زمانەکانی عەرەبی و عیبری و یۆنانی و سریانی کرد لە چوار زانکۆی سەرەکی ئەوروپا، پاشان زانکۆی پێنجەم لە بلات باوت. وا دیارە ئەم بۆچونە لە راستی نزیکترە، چونکە مێژوویەکی دیارو روون و کردەیەکی دیاری کراو بە کات و شوێن و ئەنجامەکانەوە بە دەستەوە دەدات، لەبەر ئەوە زۆرێك لە لێکۆڵەران بۆی چوون و وەریان گرت، بەوەی لە بۆچونەکانی پێشوو زۆر ئەکادیمی ترە[١٦].

## تەوەرەی دووەم

### ئامانجی ڕۆژهەڵاتناسی

### یەکەم/ ئامانجی ئایینی:

ئەگەر ئێمە باوەڕمان هێنا بەو گوتەیەی کە ڕۆژهەڵاتناسی سەرەتا بە هاندانی کەنیسەو پیاوانی ئاینی دەستیپێکردووە، ئەوە گرینگیدان بە ئاین بە ڕەهایی بە گرینگترین و یەکەمین ئامانجی ڕۆژهەڵاتناسی دادەندرێت، ئەو کاتەی گاورەکان بەتایبەتی پیاوانی ئایینی لە ناویاندا بینییان ئیسلام ناوچەی گاورەکانی ڕامالّیی و زۆرێکیش لە گاورەکان ئاینی ئیسلامیان قبولّ کرد(بونە ئیسلام) نەك تەنها لەبەر میهرەبانیەکەی و بەس بەلّکو لەبەر ئەوەش لە بیروباوەڕو سێگۆشەی باوەڕی گاوری دوورە، چونکە ئیسلام سیستەمێکی کاملّە بۆ ژیان. هەروەك پیاوانی ئاینی گاورەکان لە شوێن و پلە کۆمەلّایەتی و سیاسیەکەیان دەترسان، دەبوایە لە ڕووی ئیسلام وەستابان، چونکە لە ئیسلامدا چینی پیاوانی ئایینی یان(اكليروس) بوونی نییە هەروەك لە ناو گاوردا هەیە.

ئامانجی ئایینەکە لە ناسینی ئیسلام تا لەگەلّی بجەنگێن و وێنەی بشێوێنن و گاورەکان (ئەوانەی ببوونە ئیسلام) و لە ئیسلام دوریان بخەنەوە، گاورەکان ناسینی ئیسلامیان وەك ئامرازێك بەکاردەهێنا بۆ کردەیی بە گاورکردن کەوا بۆ سەر ولّاتانی ئیسلامی دەستی پێکرد(١٧).

### لە ئامانجەکانیاندا:

١- گومانکردن لە ڕاستییەتی پەیامی پێغەمبەر(ص)و، فەرموودەی پێغەمبەر(ص)یان وا پیشاندا کە بریتییە لە کرداری موسلّمانەکان لە ماوەی سێ سەدەی یەکەمدا. ئامانجی پیسیش لە دواوەی بریتییە لە جەنگکردن لەگەلّ

سوننەت بە مەبەستی لەناوبردنی، تا موسڵمانەکان وێنەی پراکتیکی ڕاستەقینەی ئەحکامەکانی ئیسلام و ژیانی پێغەمبەر(ص) لەبیربکەن، بەمەش ئیسلام گەورەترین ڕەگەزی بەهێزی لەدەست دەچێت.

٢- گومانکردن لە ڕاستییەتی قورئان و تانە لێدانی، تا موسڵمانەکان خۆیان کە لەسەر یەك ئامانج و سەرچاوەی هێز کۆدەبنەوە دووربخەنەوە.

٣- بێ نرخکردنی فیقهی ئیسلامی بەوەی لە فیقهی ڕۆمانی وەرگیراوە.

٤- سڕینەوەی زمانی عەرەبی و دورخستنەوەی تواناکەی لە هەڵکردن لەگەڵ کاروانی پێشکەوتندا، بەوەی لێکۆڵینەوە لە شێوەزارەکان بکرێت تا شوێنی عەرەبی (فصحی) بگرێتەوە تا پردی بەستراوەیی بە تێگەیشتن لە ئەحکامەکانی قورئان و سوننەت بڕوخێنن، (بوونی دەق بەبێ توانا لەسەر تێگەیشتن لە زمانەکانی دەبێتە هۆی وازلێهێنان و گۆڕینی بە یەکێکی تر)، ئەمەش ئەو شتەیە کەوا ئەمانە بۆی هەوڵدەدەن[١٨].

٥- ناردنی فەرمانبەران بۆ چەند دەزگایەکی پاشکۆی خۆیان لە ڕۆژهەڵاتدا، بەتایبەتیش بۆ کەنیسە و دێر و پەرسگا نەسرانیەکان[١٩].

٦- دورخستنەوەی موسڵمانان لە ئاینی خۆیان (واتە ئیسلام)، یان پاشگەزکردنەوەیان. لەم بارەیەوە(لۆرانس براون) دەڵێت: "ئەگەر موسڵمانان لە یەك ئیمپراتۆریەتدا یەك بگرن، ئەوا بە ئاسانی دەست بەسەر جیهاندا دەگرن، لەوانەیە ببنە هۆی نەفرەت و مەترسی بۆ خەڵکی جیهانی، یان لەوانەشە ببنە نیعمەت و مایەی خێرو خۆشی بۆیان، بەڵام ئەگەر پەرتەوازەو لەیەك دابڕاوبن، ئەوا بەبێ هێزو کاریگەری دەمێننەوە"[٢٠].

٧- شێواندنی ڕاستیەکان و وەسفکردنی موسڵمانان بە خوێنڕێژ و دڕ و جەردەو ئارەزووباز[٢١٠].

٨- بۆ ئەوەی خەڵکی رۆژهەڵات بڕوای بە بیروباوەڕەکەی و کێشەکەی نەمێنێ، دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەو دانانی چەند پەرتوك و نوسراوێکی چەواشەکار دەربارەی قورئان و رێبازی ئیسلام و پێغەمبەر(ص)[٢٢].

٩- پشت بەستن بە فەرمووده لاوازەکان (الاحاديث الضعيفة)و بەداستانە دانراو و دەست هەڵبەستەکان، لە پێناوی سەرخستنی بیروڕاکانیان و بەهێزکردنی تیۆر و فکرەی خۆیاندا[٢٣].

١٠- موژدەدەرانی مەسیحی یان لێکۆڵەران کار لەسەر دژایەتی کردنی ئیسلام کردوە، وە بانگەشەی دەکرد بۆ لەناوبردنی بزوتنەوە ئیسلامیەکان، هەر بۆ خۆی کاری موژدەدەران جۆرێك بووە لە جۆرەکانی داگیرکاری. هەروەها کاری دەکرد لەسەر دەرخستنی رۆژئاوایی مەسیحی بە روخساری خۆشەویستی و ئاشتی هەروەها زانست و رووناکی، وە تۆمەتبارکردنی ئیسلام و مێژوەکەی بە شەڕ و شۆڕ و تاریکی و نەزانی[٢٤].

## دووەم/ ئامانجی سیاسی و داگیرکاری:

رۆژهەڵاتناسی خزمەتی ئامانجە سیاسییە داگیرکارییەکانی وڵاتانی رۆژئاوای کردووە، رۆژهەڵاتناسەکان لەگەڵ کاروانی داگیرکاریدا بوون، هەروەك مامۆستا محمود شاکر(رەحمەتی خوای لێ بێت)، ناوی ناون بە(هەڵگری خەمەکانی باکوری مەسیحی) زانیاریەکی فراوان و زۆریان دەربارەی ئەو وڵاتانە پێشکەش دەکرد کەوا وڵاتانی رۆژئاوایی ئارەزوی داگیرکردن و دەستگرتن بەسەر سامان و خێراتەکانیان هەبوو، لە ماوەیەك لە ماوەکان کارەکە لە نێوان داگیرکەرو رۆژهەڵاتناس تێکەڵبوو، چونکە زۆرێك لە فەرمانبەری داگیرکەر شارەزاییەکی تەواویان لە رۆژهەڵات لە لایەنی زمان و مێژوو و سیاسەت و ئابووری هەبوو، هیچ

ئیتر پەیوەندیـ ـ ـی کاردانـەوەی لـە سـەر تاکـەکانی ئـەو دوو نەتەوەیـەش دەبێت، لە بەغدای شارستانی و پایتـەختی دەوڵـەتی عەباسـی و دارولسـەلامدا ، خۆشبەختانە ! ئەورۆ لەسایەی دەسەلاتداریتیەکەدا کاول و بێ نیزامـە و هەرچـی سیمای مەدەنی بوونی شار هەیە تێیدا نابینرێت.

ئێمـەی توێـژەری وێـڵ و سـەرگەردان بـۆ دەستخسـتنی بەڵگەنامـە و دەستنوسەکانی تایبەت بە مێژووی نەتەوەکـەمان سـەرباری ناخۆشـی و تـرس و نەبوونی ئاسایش و هەبوونی تیرۆر لە بەغدای پایتـەختی میلیشـیا جۆربـەجۆر و ناشیرن و قێزەونـەکان و سـەرەڕای مانـدووبوون و زەحمـەتی ڕێگـا و نارەحـەتی دەروونی بەبینینی ئەو هەموو دیمەنە جەنگەڵستان و گەندەڵستانە، ناچاردەبین پـەنا بـۆ ئـەو پاشـاگەردانیە ببـەین و ڕوو لـە دۆزەخـی بەغـدا بکـەین ..لـە سەفەرەکەمدا بۆ گەڕان بەدوای دۆکیۆمێنتی فەرمی حکومەت وەکـو سەرچـاوەی زانستی بۆ توێژینەوەکـەم سـودی لێببیـنم، لـە شـوباتی ٢٠١٣ کـەوا چـوار ڕۆژان مامەوە، کرۆکی باسەکەم لێرەوە دەست پێدەکات.

هەر لەدەروازەی شار چویتە ژوورەوە ئـالاّی ڕەنگـاو ڕەنگـی سـۆر و سـەوز و زەرد و ڕەش دونیای تەنیە، بـە تاکسـی ڕێگـای ١٥دەخولـەك دەبێتـە کاتـژمێر و نیوێك (لەلایەك بەهۆی جادە ئۆتۆبان و مۆدێرنەکانی پایتەختی فیدراڵەوە لاکـەی تریش بە هۆی ڕێزگرتنی حکومەت وخەڵك لە یاسای هات و چۆ!)

بەهەرحاڵ گەیشتمە خانەی کتێب و بەڵگەنامەکانی نیشتمانی، لەکاتی چـوونە نـاو باڵەخانەکـە و هـۆڵی مایکرۆفیلمـەکان بـەوە خۆشـحاڵ دەبیـت چـەند کچـە فەرمانبـەرێکی کـوردانی فـەیلی دەبینیـت کـە زانیـان کوردیـت بـە شـێوەزارە جوانەکـەی خۆیـان دەدوێـن و هـەر هـیچ نـەبێت ئومێـدی ئـەوەت پێدەبەخشـێت هاوخوێن و هاونەتەوەی خۆتن و هاوکاریت دەکەن، ئەوەی بۆ توێـژەران جێگـای

هیوایە بەڕێوەبەری گشتی ئەو خانەیەش د.سەعد بەشیر ئەسکندەرە کوردە و پسپۆری مێژووە دوای ئەوەی ڕۆژی یەکەم مامەوە لەنێوبەڵگەنامەکان و تێگەیشتم ئەو بەڵگەنامانەی بۆمن پێویستن پێویستیان بەرەزامەندی بەڕێوەبەر هەیەئەو ڕۆژە نەمتوانی نێوبراو ببینم بەهەر حاڵ ڕۆژی دووەم بە ئومێدەوە سەردانم کرد و دوای سڵاو ڕێز و دەربڕینی کەیف خۆشی ئامانجی دیدارەکەم بۆ ڕوون کردەوە کەوا من هاتووم هاوکاریم بکەی بۆ پێدانی ڕاپۆرتە کارگێڕییەکانی نێوان شاری هەولێر و بەغدا لە ساڵانی ١٩٦٣-١٩٧٠و لیستی گیراوە سیاسیەکان لەو ماوەیەدا، دکتۆراکەم لەسەر ڕەوشی سیاسی شاری هەولێرە وەکو بەشێك لە مێژووی نەتەوەکەمان، بەڵام بەداخەوە هەرزوو وەڵامێکی نارازیکەری دامەوە و گوتی ناکرێت پەردە لەسەر نهێنیەکان راماڵرێت، ئەوە بەهیچ شێوەیەك نابێت پێویستی بە بڕیار و ڕەزامەندی (ئەنجومەنی وەزیران) هەیە ، لە ڕاستیدا (من تۆزێك بەسەر سوڕمانەوە وەرمگرت، چونکە دەزانم ئەوەی بوونی نەبێت لەبەغدا سیستەمە !خێرە کاکی دکتۆر لەسەرمن وا بویتە یاسا پارێز و نیشتمانی و مافێکی ئاسایی توێژەران دەکاتە مەسەلەی بودجە و پێشمەرگە! ئاخر ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق و مالیکی کێشەی دزەکردنی دۆکیۆمێنتی هەیە کە تەمەنی ٤٠-٥٠ساڵە؟!)گوتم کاکە دکتۆر بەڕێزت لە ڕۆژئاوا خوێندووتە و پسپۆڕیت مێژووە لە هەموو دونیا ئەرشیف لەدوای ٢٠-٥٠ساڵ بۆ توێژەران واڵا دەکرێت تەنها ئەوانە نەبێت کە زۆر نهێنین و پەیوەندی بە ئاسایشی نەتەوەیی هەیە ..من مێژووی شارێك دەنوسمەوە نەك مەترسی بێت بگرە وشیاری مێژوویی بۆنەتەوەکەم دەستەبەردەکەم، پاسأوی بەڕێوەبەر ئەوەبوو بەڵگەنامەکانی ئەو کاتە ناوی سیخوڕەکانی تێدایە و ناوی کۆمەڵێك کەسایەتی تێدایە و ڕاشکاوانە گوتی بۆ پارتی و یەکێتی نهێنیەکانیان واڵا دەکەن؟ دێن داوا لەمن دەکەن با

ئەوان والآی بکەن تا منیش والآی بکەم، چەندی هەوڵمدا پێی بڵێم ئەرك و ئامانجی من توێژینەوەی زانستیە و کۆمەڵێك دیدارم سازداوە پێویستی من بەو بەڵگەنامانە تەنها ئەوەیە دیدگای حکومەت بەرامبەر رووداوەکان بزانم و هەر ناوێك بزانم زیانی بۆ ئاسایشی نەتەوەیی من هەبێ لە ئێستادا لایدەدەم و پێویستیم پێی نیە، تەنها من دەمەوێت مێژووی رووداوە ناوخۆییەکان و هەڵوێست و رۆڵی دانیشتوانی شارەکە بەرامبەر پێشهات و رووداوەکان و لیستی گیراوە سیاسیەکانی هەولێر و بناغەی راستیەکان لەرووی مێژوویەوە هەڵێنجم، من دەپرسم ئەوانەی سیخوڕیان کردووە بۆچی پاداشت بکرێنەوە و خۆ مێژوو رەحم بەکەس ناکات و راستیەکانیش هەر ئاشکرادەبن، هەر چەندە من مەبەستم ناوڕۆکی بەڵگەنامەکانە .

بەهەرحاڵ نەیسەلماند و هاوکاری نەکردم بۆمێژووش دەگێڕمەوە و بەئەرك و مافی خۆمی دەزانم ئەوە سەربووردەی من بوو لە سەفەرەکەمدا بەداخەوە سەرەڕای حکومەتە ئیفلیجەکەی بەغدا، مالیکی لەبەغدا توانیویەتی هەستی نەتەوایەتی دەیەها کادیر و خەڵکی دڵسۆزی نەتەوەکەمان لە بۆتەی عێراقچێتیدا بتوێنێتەوە، داوایەکی رەوا لەحکومەت و وەزارەتی خوێندنی باڵآو سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەددین دەکەم ئاوڕێکی جدی لەو مەسەلەیە بدەنەوە و پێویستە خانەیەکی پاراستنی دۆکیۆمێنتەکان لە هەولێری پایتەخت بکەنەوە هەروەها حکومەتی هەرێمیش لە دانوستانەکانی لەگەڵ مالیکی رەزامەندییکمان بۆ وەرگرێت تاکو بەڕێوەبەری گشتی خانەی پاراستنی کتێب و بەڵگەنامەکانی نیشتمانی عێراقی قایل بێت !.

# کورتەیەك لە مێژووی بــودیــەت Buddhism

م.کەلسومە جەمیل



پەیکەری بودا

بودیەت یەکێکە لەو بیروباوەڕانەی لە هیندستان سەریهەڵداوە کاریگەری زۆری لەسەر خەڵکی ناوچەکە و ڕۆژهەڵاتی ئاسیا وەك وڵاتانی چین و یابان و نیپال هتد.. دروست کردووە بووە بە ئایینی فەرمی .لەلایەکی دی , بیروباوەڕەکە هێندە سرنجڕاکێش بووە , بۆیە بۆتە بیرباوەڕی ڕێژەیەکی زۆری دانیشتوانی سەرزەوی دوور لە نەتەوەیەکی دیارکراو .لەم کورتە باسەدا هەوڵدەدەین مێژووی سەر هەڵدان و فەلسەفە و ڕێنمایی و پەرستشەکانی بودیەت بخەینە ڕوو.

## ناو و مێژووی ژیانی بودا

ناوی بودا بە مانای (مامۆستا یان زانا یان پەنهان زان یان مولهیم–ئیلهام بۆ کراو )دێت. ناوی بودا ناوی کەسی نییە , بەڵکو لەقەبە هەروەکو سەرچاوەکان لەسەر ئەوە کۆکن و ئاماژە بەو ڕاستیە دەکەن , کەواتە ناوی ڕاستەقینە و کەسی بودا بریتیە لە (سـیدهارتا Siddharata) و ناوی باوکیشی (سودهودانا Suddhodana)بووە ,کە لەبنەماڵیەکی دیاری کۆمەڵگای هیندی بووە , کە لە بنەڕەتدا ئەو بنەماڵەیە چینی جەنگاوەران(کشتاریا), کە ئەوانە لە هۆزی ساکیا(Sakya) بوونە.لە شارۆچکەی کەپیلاڤاستۆ(Kapilavastu),کە دەکەوێتە بەشی ڕۆژهەلاتی هیندستان لە تەنیشت مەملەکەتی( کۆسالا) لە نێوان شاری بنارس وچیاکانی هیمالایا و لە باکوری ڕووباری گەنجی پیرۆز(بەوەی لە لای هیندیەکان زۆر پیرۆز بووە خۆیان لەناو دەشوشت)بووە. ئێستا (کەپێلاڤاستۆ)دەکەوێتە سنوری ولاتی نیپاڵ.سیدهارتا لە ساڵی ٥٦٣ پ.ز لە دایك بووە.دایکی ناوی(مایا Maya)بووە لە دوایی هەفتەیەك لە بوونی کوڕەکەی کۆچی دوایی کردووە.پلکی(پووری – واتا خوشکی دایکی) بە ناوی(مەهایاپاتی Mahayapati)بە خێوکردنی دەگرێتە ئەستۆ دواتر باوکی دەیهێنێت و دەبێتە هاوسەری.هۆزی ساکیا لە هۆزە بالادەستەکانی هەرێمەکە بوونە,کە دەکرێ بلێین لە چینی خانەدانان وکاربەدەستەکانی هەرێمەکە بوون .ئەو کەسە لە ناز و نیعمەت و ژیانێکی پڕخۆشگوزەرانی و بەختەوەری بووە لە چەشنی کوڕانی پاشایان و بالادەستەکان دەژیت .لە هیچ شێوازێکی خۆشگوزەرانی بێ بەش نەبووە, بەوەی بلێین هەموو دونیا لەژێر فەرمان و حەز و دەسەلاتی ئەو دابووە.جگە لەمانەش, ئەو هەرێمەی کە ئەوانی تێدا دەژیا بەهەشتێکی سەر زەوی بووە, چونکە ئەو هەرێمە لە ڕووی ئاووهەواوە زۆر خۆش بووە : بە هەبوونی

دار ودرەخت و ڕووەکی بەردار و ئاووهەوایەکی تەندروست .کـاتێ تەمـەنی دەگاتـە نۆزدە ساڵ خێـزان پێـك دەهـێنێ بـە هێنـانی کـچێك لـە نزیـك بنەماڵـەی خـۆی بـە ناوی(یاسودهارا), کە دەڵێن دەقا و دەق هاوتەمەنی ئەو بـووە, چـونکە لـە هـەمان ڕۆژی لە دایك بوونی ئەو لە دایك بووە.باوکی زۆر لـە خـەمی کوڕەکـەی بـووە. بـۆ گـوزەرکردنی ژیـانی نـوێی لـە کۆشـکێکی شـاهانە یـەکجار خـۆش و پـڕ جـوانی بۆکوڕەکەی ئامادە دەکات. ئەو کۆشکە بە جۆرێك بووە هـەتا هـەموو خۆشـیەکانی ژیانی تێدا بووە .بەردەوام ئاهـەنگی سـەما و مۆسـیقا و هۆکـاری تـری ڕابـواردن و دڵخۆش کردنی تێدا بووە.ئەمـەش لەبەرئـەوە بـووە تـا کوڕەکـەی بەختـەوەر بێـت .چونکە بە پێی پێشبینی کاهینـەکان کـاتێ داهاتوویـان بـۆ خودێنـدبوٚوە و پێیـان ڕاگەیاند بـوو" کوڕەکـەیان داهـاتوێکی ڕوونـاکی دەبێـت لەوانەیـە ببێتـە پێـشەوا. پاش ماوەیەکی کەم لە هاوسەرگیری بوزا و یاسودهارا کوڕێکیان دەبێت بە ناوی ( راهولا Rahula).لـە گـەڵ هـەموو خۆشـگوزەرانیەکانی ژیـان کەچـی ئـەو دووچاری خەمۆکی و دڵتەنگی دەبێت, ئەو لە لە ناخـەوە هەسـتی بـە هـیچ جـۆرە خۆشـی و بەختەوەریـەك نـەدەکرد , چـونکە بۆچـوون و تێڕوانینـی ئـەو بـۆ خۆشیەکانی ژیان جۆرێکی تر بوو.

## فەلسەفەی سیدهارتا

لەگەڵ هەبوونی فاکتەرەکانی خۆشگوزەرانی ژیان, بەڵام سیدهارتا خۆشحاڵ نەدەبوو, چونکە ناخەوە دەروونی بەمانە بەختەوەر نەدەبوو.بە هۆی جیـاوازی بیرکردنەوەی لەبەرامبەر هەندێ دیمەنی قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤایەتی دووچـاری ئازارێکی دەروونی زۆری کـردووە,هـەروەکو لـە هەنـدێ چـیرۆك دەگێڕنـەوە,کـە بـەردەوام لـەناو کوشـکە شـاهانەکەی دەژیـا بـە هـیچ جـۆرێ ئاگـاداری ژیـانی

دەرەوەی کۆشك و ژیانی ئاسایی هەژاران نەبووە ,بۆیە داوا لە باوکی دەکات کە ڕێی پێبدات بچێتە دەرەوەی کۆشك .هەرچەندە باوکی سەرەتا بەمە رازی نەبوو, بەلآم (سیدهارتا) زۆر داوای لێ دەکات , با وەك فیلێکی بەندکراو بەزنجیر لە شوێنێکی ووشکایی مامەلەی لە گەلێ دا نەکات. بۆیە ناچار دەبێت بەلآم بە مەرجێ لەگەلێ کەسێك وەك پارێزەر و چاودێر لەگەلی دا بێت . ئەو چاودێرەش ناوی (چانا Channa ) بوو دواتر وەك هاوڕێیەك بەردەوام لە گەلی دەبێت .لە کاتێ بە ڕێگادا دەڕۆن چاوی بە پیاوێکی بە سالآ چوو دەکەوێت ,کە لە بارودۆخێکی تەندروستی زۆرخراپ دا بووە. بەوەی خۆی بە کۆپالەکەی گرتووە و پشتی چەماوەتەوە بە جۆرێ نەیدەتوانی سەری بە تەواو ڕابگرێ . کاتێ سیدهارتا چاوی بەم وەزعە دەکەوێ زۆر پەرێشان بووە لە ناخەوە هەستی بە خەم و پەژارەیەکی زۆر کردووە.بەلآم هاوڕێ و چاودێرەکەی (چانا) وەلآمی دەداتەوە پێی دەلێ "ئەمە یاسای ژیانە , ناتوانین لێی ڕابکەین.چیرۆکێکی تر هەیە ئاماژە بەوە دەکات کاتێ سیدهارتا نەخۆشێك دەبینێت لەبەر ئازاری جەستەی زۆر پەرێشانە هەرچەندە ,خزم وکەسانی لە دەوری کۆببوونەوە, بەلآم هیچیان بۆ پێ نەدەکرا و نەیاندەتوانی ئازارەکانی کەم بکەنەوە.هەروەها دەرمانیش چارەسەری نەدەکرد .دووبارە سیدهارتا زۆر نارەحەت دەبێ .هاوڕێکەی (چانا) پێی دەلێ "ئەمە یاسای ژیانە." چیرۆکی سێیەم دەلێ "کاتێ بە شوێنێك تێدەپەرن کەسێکی مردوو دەبینێت کە جەستەی زۆر بە خراپی تێك چوو بوو و بۆگەنی-گەنیو ببوو, بۆنێکی یەکجار ناخۆشی لێ دەهات.دیسان بەم وەزعە زۆر نیگەران دەبێ هەروەها هاوڕێ دلسۆزەکەی هەمان قسەی جارانی بۆ دوبارە دەکاتەوە وپێی دەلێ :"ئەمە یاسای ژیانە." ئەم ڕووداوانە وای لە سیدهاتا کردووە بیر بکاتەوەو تێبکۆشێ بۆ

ئــەوەی سەرچــاوەی ئــەو ئــازار و مەینــەت و ناخۆشــیانەی ژیــانی مرۆڤایــەتی بدۆزێتەوە؟ مرۆڤەکان چۆن بتـوانن لـەم بـارە ناخۆشـە رزگـاربن؟ بـە تایبـەتی هەموو مرۆڤێك رۆژێك دێ بەوەی دووچاری نەخۆشی بێت یان پـیر بێـت,یـان بـە سالاّ بچێت, بەرەو دارمان و لە ناوچون هـەنگاو بنێـت یـان سـەرەمەرگ و مـردن ببینێت.ئەمانە زۆر ئازاری داوە. کاتێ بیری دەکردەوە ئاخۆ دەبـێ سەرچـاوەی ئەو ئازارانە چی بێت ؟؟!ئەمە زیاتر دڵتەنگی دەکرد,هەرچـەندە بـاوکی هـەوڵی لە گـەڵ دەدا تـا یارمـەتی بـدات بـەوەی ڕەوشـەکە وەك خـۆی وەربگرێـت بـەلاّم سوودی نەبوو. ئەو دیمەنە کارەساتئامێزانە ڕەگیـان لـە دڵ داکوتـا بـوو, بۆیـە بڕیـار دەدات لــە هــەموو ژیــان دوورکەوێتــەوە و گۆشــەگیر بــێ.لــەو شــەوەی کۆرپەڵەکەی لە دایك دەبێت,لەکۆشك ئاهەنگ دەگێرن بە بۆنەی لـە دایـك بـوونی کوڕەکـەی .هـەر لـەم شـەوە سـەیرێکی منـداڵ و خێزانەکـەی دەکـات. هـەموو خۆشیەك لە ژیانی شاهانە بەجێ دەهێڵـێ.ژیـانی ڕەبەنایـەتی هەڵدەبـژێرێت.بـۆ ماوەی حەوت ساڵ دووردەکەوێتەوە, دەچێتە شوێنێکی دووری شـار و ئـاوەدانی کە زۆربەی رەبەنـەکانی ئـەو کـات لـەوێ بوونـە.لـەم مێـژووەدا نـاوی دەبێـت بـە (گوتامـا Gautama) واتـا رەبـەن(الراهـب),دیـارە بـودا بـۆ هەڵبـژاردنی ئـەم ڕەفتـارەی کـەوتبوە ژێـر کاریگـەری فەلـسەفەی هیندۆسـیەوە .لەلایـەکی تـر بــەوەی کــە نــەیتوانیووە ڕووبــەڕوی ئازارەکـانی ناخۆشــی ژیـانی مرۆڤایــەتی ببێتەوە , بۆیە پەنای بۆ دوورکەوتنە و تەنیایی و بردووە,تاوەکو لەم ڕێگایەوە بتــوانێ بەســەر ناخۆشــیەکانی ژیــان زاڵ بێــت.(گۆتامـــا) لـــەو ماوەیـــەدا دوورەپەرێزیەکی زۆر دایگرت , ئەو پەرگیریە لە خەڵك خاڵی وەرچەرخان بـوو لـە ژیانی بودا دا. لە ژیانی ڕەبەنایەتیدا ئـازاری زۆری جەسـتە و گیـانی خـۆی دەدا ,بە ئەنجام دانی وەرزشێکی سەخت و دژوار ,جڵەکانی لەبەرخۆی دادەکەند و بـە

گەلآی دار هەڵیدەواسین, وەك مرۆڤێکی نیمچە ڕووت دەردەکەوت : هیچی لە بەر دا نەبوو تەنیا جیێ شەرمەکانی خۆی دەشاردەوە .هەروەها خۆی برسی دەکرد تەنیا برێکی زۆر کەم خواردنی دەخوارد .ئەم جۆرە ژیانە سەختەی هەڵبژاردووە بەمەبەستی گەشیتن بە نهێنیەکان وتا لەم ڕێگایەوە بتوانێ دەرباز بێت لە مەینەتیەکانی ژیان, بەلأم (گۆتاما) بە هیچ ئاکامێك نەگەیشت.لەگەڵ ئەوەش دا دووچاری بێ هێزی و لاوازی جەستەیی و دەروونی بۆوە. دواتر بۆی دەرکەوت ,بە کوشتنی ئارەزووەکان ناتوانێ بە سەر کێشەکانی ژیان دا زاڵبێ,بۆیە وازی لە ژیانی ڕەبەنایەتی هێنا و پاشەگەز دەبێتەوە .ئینجا گەیشتە ئەو قەناعەتە ئەوەی کە دەیگەینەتە ئامانج عەقڵە بۆ ئەم مەبەستەش دەبێت خاوەنی ژیریەکی تەواو تەندروست و جەستەیەکی بە هێزە بێ. ئەویش بە جێ بە جێ کردنی ئارەزووکان لە خواردن و خواردنەوە و ژیانی خێزانی فەراهەم دەکرێ , نەك بە وازهێنان لە خواردن و ئازار دانی جەستە و کوشتی ئارەزووەکان,بەم ڕەفتارانە نەگەیشتە هیچ بە ختەوەری و ئاشتەواییەك , بۆیە هەروەکو ئاماژەی پێ کرا وازی لە ئازاردانی جەستە و دوورکەوتنەوە و نەخوادردن دەهێنێ .ئیتر ژیانی ئاسایی دەست پێ دەکاتەوە بەوەی خۆی دەشوا و خواردن دەخوا هتد..... بە هۆی ئەو وەرزشە سەختەی ئەنجامی دا بوو جەستەی دووچاری کزی و لاوازیەکی زۆر ببوو.کاتێ تەمەنی دەگاتە سی و حەفت ساڵ پەنا دەباتە بەر تێڕامان و بیر کردنەوە ڕۆژێك لە ژێر سێبەری دارێك لە دارستانی (ئۆروێلا) دادەنیشێت بۆ پشوودان لە ئێوارەی هەشتی کانوونی یەکەم بووە . ئەم دارە دواتر بوو بە داری زانیاری.زۆر بە موقەدەسی سەیر دەکرا,ئەم دارە خاوەن پێگەیەکی بەرزە لە لای بودایەکان هەروەك خاچ کە پاییەکی گرینگی هەیە لە لای کریستانیەکان . لەژێر ئەو دارە دەگاتە ئەوەی

مەبەستی بووە. لەو کاتەوە ناوەکەی لە سودهارتاوە گۆڕا, بوو بە (بودا) واتا( زانا یان مامۆستا یان پەنهان زان ,یان ئیلهامی بۆ هاتوو).نەهێنیەکانی ژیانی لە ژێر ئەو دارە بۆ ئاشکرا بووە و گەیشتە ئەو ڕووناکیەی کە پەچەی لەسەر پەنهانیەکان بۆی لادراوە . گەیشتۆتە ڕۆشەنی و سەرکەوتوویی. هەروەکو بودا دەڵێ ( لەو کاتەدا رزگارم بوو لە ئارەزووەکان و تاوانی سەر زەوی وخراپەکاری و نەفامی......)دیارە لە دوایی ئەو ڕووداوە توانیویەتی بەسەر ئاستەنگەکانی ژیان زاڵ بێت. ئەو حاڵەتە پێی دەڵێن(نیرڤانا)واتا(نەهێشتنی ئارەزوو ولە ناوبردنی رق یان نەهێشتنی بوونی تاك لە ناوبردنی ئازار) لە دوایی ئەوە بودا بڕیاری دا بانگەواز بۆ ئەوەی پێی گەیشتووە بکات. ڕێنموونی خەڵك بەو ئیلهامەوە بکات .هەرچەندە سەرەتا دوو دڵ بووە لەوەی کە بانگەواز بکات یان نە, بەڵام دواتر گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە پێویستە ئەو بەختەوەرییەو خۆشبەختیە دەروونیە و خێر و چاکەیە گشت مرۆڤایەتی لێی بێبەش نەبێ. سەرەتا بانگەوازی لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەی کرد کە کاتێ بۆ گەڕان بەدوایی ڕاستی لە گەڵی بوونە, واتا لە ژیانی رەبەنایەتی، هەندێ لە سەرچاوەکان دەڵێن ژمارەیان پێنج کەس بووە، دوای گفتوگۆیەکی دوورو درێژ بڕوایان پێهێنا. دواتر ڕێژەیەك لە گەنجان هاتنە سەر ڕێبازەکەی ئەوانیش بوون بە پەیڕەوانی بودیزم، دەستیان کرد بە بڵاو کردنەوەی بیروباوەڕەکەی. لە ئەنجام دا ڕێژەیەکی زۆر لە پیاوان و ژنان و گەنجان و بە ساڵا چووان باوەڕییان پێ هێنا. بودا خۆی ببووە سەر مەشق و پێشەوا بۆیان. هەموو کات پرسیاریان لێ دەکرد، ئەویش بە زیرەکی و دانایی وەڵامی دەدانەوە، بە خۆشەویستی و چاودێری و گرینگی پێدان, ,سەرپەرشتی دەکردن.(بودیەت )لە سەردەمی بودا بە شێوازێکی زۆر بەرفراوان بڵاوبوویەوە، بەبێ جیاوازی لە نێوان چینی هەژاران

و دەوڵەمەندەکان. بەلام هەرچینێك بە پێی بۆچوون و بەرژەوەندی خۆیان دەهاتنە ناو ڕێکخراوەکە. بانگەوازەکەی بۆ گشت چینێك بووە بەبێ مەرج .بۆ نموونە چینی پاشاکان و سەربازەکان باوەڕیان پێ هێنا بە مەبەستی ڕزگار بوون لە ژێر جەور و ستەمی بەراهیمەکان , گەورە پیاوانی هیندۆسیەکان) .

لەلایەکی تر بودیزم دژایەتی چینایەتی کۆمەڵگای دەکرد .چونکە چینی بەراهیمە و خانەدانان لەو پەڕی خۆشگوزەرانی بوونە ڕیژەیەکی زۆری کۆمەڵگا هەژار بووونە و لە ڕەوشێکی ژیانی خراپ بوونە.لەلایەکی تر کەسایەتی بودا کاریگەری زۆری هەبووە لەسەر خێرایی بڵاوبوونەوەی.هەروەها بودیزم دژی دەمارگیری ئایینی بوو چونکە لەو باوەڕە دا بووە دەمارگیری گەورەترین دوژمنی ئاین و توڕەیی و ئاژاوە و شەڕە .بۆیە بەردەوام ئامۆژگاری مورید و شوێنکەوتوانی دەکرد دووربن لە دەمارگیری و قسەی نەشیاو ناشایستە.بەم جۆرە لە زۆربەی هەرێمەکانی هیندستان بیروباوەڕی بودا بڵاوبویەوە. بە تایبەتی لەسەدەی سێیەمی پێش زاین لەسەردەمی پاشا (ئاشوکا), کە گرینگی زۆری بە بودیەت داوە ,ڕۆڵێکی یەکجار مەزنی هەبووە .بانگخواز و پەیڕەوانی بۆ هەموو شوێنێکی هیندستان ناردووە ,خۆشی پاش ئەوەی واز لە هەموو شتێك دەهێنێ و دەبێتە بانگخواز بۆ ئەم ئایینە یا تەریقەتە. کەچی لەسەدەی حەوفتەمی زایینی بودیزم بەرەو کزی و لاوازی هەنگاوی نا ئەمەش زیاتر بە هۆی دژایەتی کردنی هیندۆسیەکان بووە. لە گەڵ ئەمەش دا, بە شێوەیەکی بەرفراوان لە هەرێمەکانی سیلان و بەرمانیا و سیام و کەمبۆدجیا و تورکستان و تبیت و چین و کۆریا و یابان بڵاوبۆیەوە. لە پاش کۆچی دوایی بودا,بودیزم لە هیندستان بەرەو لاوازی چوو بە هۆی دژایەتی کردنی بەراهیمە هیندۆسیەکان لە لایەکی تر بە هۆی هەبوونی بۆشایی دەروونی و نەبوونی پەرستش,واتا نەبوونی خوداوەند

لە ناو بودیزم, هەرچی هیندیەکان بوون باوەڕیان بە هەبوونی کۆمەڵێ خوداوەند هەبووە. ئەو حازرنەبوونەی خوداوەند لە بودیەت و فرە خوداوەندی هیندۆسی , ململانێی نێوان ئەو دووەی قووڵتر دەکردەوە , بۆیە بۆ ڕزگاربوون لە بۆشایی بێ خودایی , پەیرەوکەرانی بودیەت , کەسایەتی بودای مرۆڤیان بەرەو زاتی خوداوەندێك برد .بۆ ئەو مەبەستە و پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە رۆحیەی بودیەت , پەیڕەوانی بودیەت ڕوویان کردە پەرستگاکانی هیندۆسی و پەیکەری تایبەتیان بۆ بودا دروست کرد و کردیان بە خوداوەند و پەرسترا. دواتر بودیەت لە گەڵ هیندۆسی تێکەڵ کرا .

### بودیزم لە نێوان عەقیدەو فەلسەفەدا :

گشت ئەو سەرچاوانەی لەبەر دەست دانە لەسەر ئەوە کۆکن کە بودیەت ئایینێکە باوەڕی بە هەبوونی خوداوەند نییە,بەشێوەیەکی تر ئایینێکە خودا بوونی نیە, بەوەی خاوەن هێزێکی بێ سنوور بەدیهێنەر بێ و عیبادەتی بۆ بکرێت .دەکرێ بڵێین بۆدیزم وەك شۆرشێك بووە, لە دژی بەارهیمەکان . یان دژی بیروباوەڕی چەواشەی بەراهیمەکانی هیندی , کە ئەوان لە گەڵ نەجیب زادەکان (النبلاء) هەرێمەکانی هیندیان بەڕێوەدەبرد.بەلأم دەکرێ هۆکاری خێرایی بلاوبوونەوەی بودیەت بۆ چەند فاکتەرێك بگێرینەوە :

١. ڕەوشی ئابووری هیند

ئەو کات هیند بۆ چەند هەرێمەێك دابەش ببوو، بەلأم لە گەڵ ئەمەش دا لەڕووی شارستانێتیەوە پێشکەوتووبوونە ولەڕووی باری ئابوورییەوە دەکرێ بڵێین ڕەوشی ئابووری خەڵکەکە باش بووە.

٢. ڕەوشی فەلسەفی و ئایینیی

ئەو ڕەوشـە ئابوریـەی سـەرەوە وایلێکـردوون گرینگـی زۆری بـە فەلسـەفەو ئایینزاکـان بـدەن.لـە لایـەکی تـر ئـازادی تـەواوی دەربڕینـی بیروبـاوەڕ هـەبووە بەوەی هەر گروپێك بانگەشەی بۆ هەر بنەما فکریەك دەکرد خۆیان باوەڕیان پـێ بووە.

٢. وشیاری خەڵك نەك قاڵبگرتن بە شتی باو

بوداش مەبەسـتی بـووە خەڵکەکـە ووشـیار بکاتـەوە و بـەوەی نەکەونـە ژێـر کاریگـەری بیروبـاوەری کاهینـەکان , کـە ئـەوان خەڵکەکـەیان فریـو دەدا, بـە بۆچوونی بێ بنەما وەك پەرستنی پەیکەر یان ئەنجام دانی نوێژی تایبەت بۆیان. دەیویست بە خەڵکەکە بڵێت پەرستنی پەیکەر و نوێژەکان و هیچ گۆرانکاریەك لە ژیانتان دروستناکات, بەڵکو ئەوە خـۆتی چارەنوسـی خـۆت دیـاری دەکـەی .بـۆ نموونە لە کاتی ئامۆژگاری کردنی چەند ڕاهیببێـك ,کـە لێیـان پرسـی حیکمـەتی جیهـان چـیە؟ ئـەویش لـە وەڵام پێیـان دەڵـێ لـە چـاکە تـەنها چـاکە فەراهـەم دێ.ئەنجامی خراپە هەمیشە خراپەیە.ئەوانیش ووتیان ئێمەش ئەمەمان دەزانی . بـودا پێـی ڕاگەیانـد ئەمـەتان دەزانـی بـەڵام کارتـان پـێ نـەکردووە. کاهینـەکان ووتیـان" کەواتـە پەرسـتش و نوێـژەکانمان و پێـشکەش کردنـی قوربـانی بـۆ خوداوەندەکان شتێکی بێ بنەماو ڕاستیە,هیچ شتێك ناگۆڕێن. ئەنجام ئـەوانیش دانیان پێ دانا و بوون بە پەیرەوانی بودیزم. بودا باوەڕی وا بوو. جیهان بە پێـی یاسـایەك بـەڕێوە دەچـێت ,بـە پێـشکەش کردنـی قوربـانی بـۆ گـشت پـت و سەنەمەکانی هیندستان گۆڕانگاریان بەسەر نایەت ,بۆیە لەم ڕێگەیەوە دەیوسـت سەرنجی مرۆڤەکان بۆ لای خۆی ڕابکێشێ تا ووشیار ببنەوە بـە دوای مەعریفـەت بگەڕێن,بۆئەوەی لە ناخی خۆیان بیدۆزنەوە بۆ ئەمـەش عـەقڵ و دڵیـان بـە کـار بهێـنن واز لـە تـاریکی و پـشتەوەی سروشـت بهێـنن کـە ئـەو کـات هـەبوونی

بیروبـاوەڕی چەواشـە بـاڵی بەسـەر بـڕوای خەڵکـەکان دا گرتبـوو،وەك ترسـانی هەمیشەیی لە تورەیی خوداوەندەکان و دوورکەوتنەوە لە خۆشـیەکانی ژیـان بـە کپ کردن و نەهێشتنی ئارەزووەکان .بۆیـە بـودا دەیویـست ئـەوان واز لـەو بـیرە هەلیت و پەلیتانە بهێنن وبۆ گەیشتن بە خۆشبەختی لە ناخی خۆیـان بیدۆزنـەوە بە هەڵبژراندنی رێگای ناوەند بەوەی نە ژیانی پڕ لە چێژ ڕێگایـەکی دروسـتە نـە ژیانی ریازەت خوازانە .

جەوهەری فێرکاریەکانی بودا دەتواندرێت بۆ دووبەشی مەعریفی پۆلێن بکـرێ ئەو فێرکاریانە (لە چوار هەقیقەتی ڕەسەن) پێکهاتبوو:

یەکەم:سەرەتا ئەوەی کە ژیان پڕە لە ڕەنج و ناخۆشی .

دووەم: ریشە و بنچینەی ڕەنجەکان لە ئارەزووەکان دایە

.سێیەم:وازهێنان لە ئارەزووەکان.

چوارەم: ڕێگای کۆتایی هێنان بـە ڕەنجـەکان بـە پـشت بەسـتن بـە (هەشـت بنـەماکان)ی مـەعریفی هـەروەکو کاهینـەکان لـە بودایـان پرسـی چـۆن دەتـوانن رێگای ناوەند بدۆزنەوە؟ ئەویش پێی ڕاگەیاندن بە گرتنەبەری ڕێگایـەك کـە لـە هەشت بەش پێکهاتووە ناسراوە بە هەشت بنـەما بـۆ یاسـای ژیـان(هەشـت ڕێگـا ڕەسەنەکە):

*باوەڕی دروست.ڕاستی ،ڕێنمایی مرۆڤ دەکات.

*بڕیاری دروست.بەوەی دەبێت مرۆڤەکان ئازاری هیچ بونەوەرێك نەدەن

*ڕەفتای دروست.بەوەی نابیّ مرۆڤەکان کارێك ئـەنجام بـدەن دواتـر هەسـت بـە شەرمەزاری بکەن.وەك دزی و پیاو کوشتن.

*گوفتـاری دروسـت:دوورکەوتنـەوە لـە گوتـاری ناشـیرین و نەشـیاو وەك درۆ و دووڕوویی ....

*کاری دروست.دوورکەوتنەوە لە کاری خراپ وەك دەست بەسەر داگرتنی شتێك کە هی خۆت نەبێ,یان زەوت کردن مالی خەلك .خۆ دەرخستن بە پێچەوانەی ڕاستیەکان.

*پێداگرتن و هەولدانی دروست. هەولدان هەموو کات بۆ چاکە ودوورکەوتنەوە لە هەموو خراپەیەك .

*تێڕامانی دروست.بەوەی هەموو کات هێمن و لەسەرخۆبی نەکەویتە ژێر کاریگەری خۆشیەکان وناخۆشیەکان.

*سەرنجی دروست.ئەمە بەوە دەبێت بە پەیڕەو کردنی گشت بنەماکان گەیشتن بە ئاشتەوایی هەمیشەیی.

بەمەبەستی تێگەیشتنی ئاسانتر لە پێنج ڕاسپاردە کۆ کرانەونەتەوە , بەلام لە هەندێ سەرچاوەدا بە دە سپاردە دیاری کراون , کە بریتین لە :

١- مەکوژن ,واتا ژیانی هیچ جۆرە بوونەوەرێك لە ناومەبەن .(لاتقتل)

٢- دزی مەکەن (لا تسرق)

٣- زینا(داوینپیسی)مەکەن ڕێگە مەدەن جەستەتان توشی تەمەبەلی بێت(لا تزن)

٤- خۆتان لەو مادانە بە دووربگرن کە سەرخۆشی یان مەستی دەهێنن(لا تتناول مسکرا)

٥- درۆ مەکەن و پرو پاگەندەی خراپ بلاو مەکەنەوە.(لا تکذب)

٦- لە شەوان خواردن مەخۆ هەروەها ئەو خواردنەش مەخۆن کە تەواو پێ نەگەیشتوون.

٧- مە ڕۆن بۆ شوێنێك کە ئاهەنگی سەماو گۆرانی تێدا بێت.

٨- نابێ زێر و زیوت هەبێ .

٩- خۆت بۆندارمەکە بە بۆنی خۆش

١٠ - نابێ شوێنی دانیشتن و حەوانەوەت گران بەها بێت.

لە دوای جێ بەجێ کردنی ئەم بنەمایانە دەتوانن بگەن بە(نیرڤانا)واتا( نەهێشتنی ئارەزوو و لەناوبردنی رق)هەندێ رێوشوێنی توندتر هەبوو وەك(خۆ هەژار کردن و مانەوە بە زگورتی) لەو حاڵەتە دا ئەوا شانسی زۆرتریان دەبێت هەتا خۆیان لەو جیهانە مادیە رزگار بکەن و بگەن بە نیرڤانا.



## بودنیزمی مێژوویی هەنووکەیی

لە دوای خستنەرووی ئەم کورتە مێژووییە بۆمان دەدەکەوێ بودا زیاتر وەك چاکسازێکی کۆمەڵایەتی یان بیرمەند و فەیلەسوفێك دێتە بەرچاو نەك وەك پەیامبەر, کە زیاتر جەختی لە سەر بەها کۆمەڵاتیەکان دەکاتەوە. لە رێگای چاك کردنی رەفتاری کۆمەڵگا بە پەیرەوکردنی هەشت بنەماکان دێتە دی.بە هیچ

جۆرێ بانگەشەی بۆئەوە نەکردووە کە سروشی بۆ هاتبێت .یاخود داوای پەرستنی خوداوەندی کردبێ . بە پێچەوانەوە خۆی بە دوور دەگرت لە هەموو بیروباوەڕێك لەسەر بنەمای هەبوونی خوداوەند دامەزرابێ .بەڵام لە پاش ئەوەی بودا کۆچی دوایی دەکات دوایی زیاتر لە سەدەها سالْ شوێنکەوتووانی ئەوانەیان هەموو لە بیر کرد و بودایان گەیاندە پلەی خوداوەند و پەرستیان . لە بارەی ئامادەنەبوونی خودا لە پەیامەکەیدا , پەیرەوکەرانی بودیەت پاساوی زۆر نالۆژیکیان دەهێنایەوە و دەیان ووت باسی خوداوەندی نەکردووە, چونکە خۆی خوداوەند بووە.

لە کتێبە پیرۆزەکانیاندا کە ناوی (دامابادا) بوو .چیرۆکی هەمەجۆریان لە بارەی خوداوەند بودا نوسیووە,کە چەندەها پەیکەریان بۆ دروست کردووە و قوربانیان پێشکەش دەکرد , ئەوەیان پشت گوێ خست کە چۆن بودا دژی پەیکەرو پتەکانی هیندی و کاهینەکان دەجەنگا, کەچی پەرستگا و کاهینی تایبەت دروست بوو , بودینیزم بوو بە ئایین .بەڵام کاهینەکان لە شیکردنەوەی فەرمایشتەکان تێنەدەگەیشتن , بۆیە جیاوازی بیروڕا لە نێوانیان سەریهەڵدا ناچار بوون چەند کۆنگریەك گرێبدەن بۆ گەیشتن بە ڕێگا چارەسەیەك لە نێوانیاندا .لە هیند بودیەت لەناو بیروباوەری هیندۆسی توایەوە و بودا بوو بە یەکێ لە خوداوەندەکانی هیندۆسی.لەسەدەی حەفتەمی زایینی بودیەت لە هیندستان ئەو گرینگەی نەما تەنها لە بەشی هەرێمەکانی پشت چیای هیمالایە نەبێت . بەڵام بە شێوەیەکی گشتی بودیەت بەرەو ڕۆژهەڵاتی ئاسیا پەرەی سەند وەك چین و یابان و بۆ باشوریس بۆرما و سیام و سیلان هتد....

## مەزبەکانی( ئاییینزای ) بودایی

لە بودیزم دا دوو ئایینزای سەرەکی هەیە:

١- مەزهەبی باشور(واتا باشوری ولاتی هیند) .بودا دەپەرەستن وەك مامۆستایەکی مەزن ,نەك وەك خوداوەندێك ئەمەش لە هەرێمەکانی باشوری هیند و دوورگەی سیلان بووە .

٢- مەزهەبی باکور (باکوری هیند).بودا وەك خوداوەند تەماشا دەکرێت , واتا گەیاندیانە ئاستی خودایەتی. ئەم مەزهەبە لە ولاتانی تبت و مەنگۆلیا و چین ویابان باکوری هیندستان تەشەنەی کردووە.ئەوان زیاتر بوونە هۆی داهێنانی بودایی نویَ بە پیرۆز زانی پاشماوەکانی رابردوو بەکارهێنانی ئاوی موقەدەس و مۆم وبوخور وتەسبیح و پۆشاکی کاهینی (رەبەن و ژنە رەبەکان) قژ تاشین(سەرکودی کردن) و بە رووژوبوون لە چەند رۆژێکی دیاریکراو و سازدانی سروتەکان و پاککردنەوە و ئەنجام دانی نوێژ و پارانەوە بۆ مردووەکان.

بەم جۆرە ئاینزای باکوری بودایی لە ئاسیا پەسندکرا و بودایی لە گشت ئاسیا پەرستگای بۆ بونیات نراو لە هەر پەرستگا دا پەیکەری تایبەت بە بودا لیَ دانرا و پەیڕەوانی سەردانی دەکەن و گولَ لە لای پێی پەیکەری بودا دادەنیَ و بوخور دەسوتێنن و یادی بودا دەکەنەوە.

هەرچەندە تا هەنوکە زیاتر لە دوو هەزار و چارسەد و هەشتا و سیَ سالَ بەسەر مردنی بودا تێپەریووە. فەرمایشتەکانی لە نێو ڕێژەیەکی زۆر دانیشتوانی جیهان ماوە و لە گەلَ هەبونی جیاوازی لە بیروڕای جیاواز بەلاَم هەموویان لەسەر هەشت بنەما سەرەکیەکان کۆکن، بەوەی جیاوازی لە نێوان خەلَك دا نیە تەنها بە هەولَ تێکۆشان و کردەوەی چاك تا بگەنە نیرڤانا و هەروەکو باوەڕیان وایە لە چاکە تەنها چاکە فەراهەم دیَ و لە خراپەش تەنها خراپە هەیە. لەگەلَ

ئەو هەموو بنەما فەرمایشتە مرۆڤ دۆستانەدا لە وڵاتێکی وەك (میانمار) بۆرمادا دەبینین پەیڕەوانی بودیەت دوور لە هەموو ڕەوشێکی یەکتر قبوڵ کردن بەردەبنە گیانی مرۆیایانی هاونیشتمان و هاو نەتەوەی دین جودا . بەم پرۆسەیەش بیاننەوێ یان نەیانەوێ, هەر خۆیان دژایەتی لە گەڵ فەرمایشتەکانی بودایی ڕاستەقینە دەکەن ,چونکە لە بنەما سەرەکیەکانی بودایەت نەکوشتنی مرۆڤ و هەموو گیان لەبەرانە,لەمەوە دەردەکەوێ کە فەرمایشتەکانی بودا لە پەیڕەوانی بەرجەستە نەبووە.بە کورتی بودایی ئەو تەناهیە بۆ مرۆڤ فەراهەم ناکات , ئەو نا–توندوتیژیەی بانگاشەی بۆ دەکەن لە گوفتاری ڕۆژانە دەردەکەوێت کە تەنها قسەی ڕووتن , قسەی ڕووتیش هەداری ڕۆحی دروستناکات.

بۆ نوسینی ئەم بابەتە سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە
١–فليسيان شالي,موجز تاريخ الاديان,ت .حافظ الجمالي,دمشق,١٩٩١.
٢–سليمان مظهر,قصة الديانات,القاهرة,١٩٩ .
٣–صادق عبد علي الركابي,لمحات عن اديان العالم,القاهرة,٢٠٠٧ .
٤–ج.م.روبرتس,موجز تاريخ العالم,ت.فارس قطان,دمشق,٢٠٠٤ .
٥–وفاء فرحات,موسوعة الاديان,بيروت,٢٠٠٤.
٦–د.سمير عبدالحميد ابراهيم,الاسلام والاديان في اليابان,الرياظ ,٢٠٠١.
٧–غوستاف لوبون,حظارات الهند,ت.عادل زعيتر,القاهرة,٢٠١٠ .
٨ يارو سلاڤ کراچی ,شارستانێتی ئاسیاو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست,ویوسف خزر چویان,هەولێر ,٢٠٠٧.
٩–چەند پێگەیەکی ئەلیکترۆنی.

# میرانی بەدلیس

ئامادەکردنی: عبدالرقیب یوسف

مێژوونوسی مەزن شەرەفخان کە لە ساڵی (١٠١٢ك/١٦٠٤ز)دا کۆچی دوایی کردووە تا کاتی خۆی ناوی میرانی بدلیسی لە باپیرانی خۆی نوسیوە لە شەرەفنامەدا بەڵام لەبەر ئەوەی کاتی دروستبوونی میرنشینی روشکی (میرنشینی بدلیس) نەزانیوە لەوانەیە ناوی هەندێ لە میرە هەرە کۆنەکانی نەزانیبێ و هەروەها لە بارەی هەندێکیان توشی هەڵە بووە و ناوی هەندێکیان و هەروەها کاتێ هەندێکیان لەم لێکۆڵینەوەماندا باس دەکەین کە لە شەرەفنامەدا نەهاتووە لەگەڵ لیستی ناوی ئەو میرانەی پاش شەرەفخان هاتوون و لەگەڵ پوچەڵ کردنی ئەوەی نوسیوە کە میرانی روشکی لە زوریەتی شاهە ساسانیەکانە بەڵکو بە گوێرەی بۆچونم لە عەشیرەتی بلباسن بە گوێرەی هەندێ زانیاری کە نەکەوتونەتە بەردەستی شەرەفخان.

دەوڵەتی عوسمانی میرنشینی روشکی لە بدلیس لەنێوبرد لە کاتی(میرپولاد)ی کورێ شەرەفخانی دەیەم کە لە ساڵی (١٢٤٥ك/١٨٢٩ز) کۆچی دوایی کردووە پاش ئەو شەریفی کوری محەمەد فەتاح خان هەوڵیدا میرنشینەکەی زیندو بکات و شەری لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی کرد بەڵام سەرنەکەوت و لە (١٢٦٥ك/١٨٤٩ز) دورخرایەوە بۆ ئیستەمبۆل و لە (١٢٧٠ك/١٨٥٤ز) لە ئیستەمبول کۆچی دوایی کرد بە گوێرەی ئەو زانیاریانەی وەرم گرتوە لە خوالێخۆشبو عادل شەرەفخان. شەرەفخان هۆی ئاوارەبوونی

عەشیرەتەکی زۆر لەوانە عەشیرەتی بلباس بۆ ناوچەی بدلیسی دور–رونی نەکردەوە.

بێگومان ئەمانە بە خۆڕایی ئاوارە نەبوون و دەبێ هۆیەکی گەورە هەبێ و لە سەدەی دوازدەیەم و سێزدەیەمدا لە شالاّوی مەغۆل گەورەتر نەبووە و تەنیا ئەوە دەتوانێ عەشیرەتی گەورەی بلباسی شەڕکەر لە ولاّتەکەی لە ناوچەی موکرِی و بابان دەربەدەری بکات.

قەناعەتم بە قسەی شەرەفخان نیە کە ئاوارەبونیان گەیاندوەتە نیوەی یەکەمی سەدەی دوازدەیەم و کاتی سەلجوقی و لەو کاتەدا ئەمە ڕوینەداوە چونکە سەلجوقی لە نیوەی یەکەمی سەدەی یازدەیەمدا لە ئێران و کوردستان و عێراقدا جێگیرببون و ئەو کاتە بدلیس لەژێر دەستی دەوڵەتی دوستکی کورد بوو وەك نوسیومانە کە کتێبەکەمان (الدولە الدوستکیە).

لە شەرەفنامە(لا ٤٨٤) دا هاتووە کە زانیاریەکانی لە (تاریخ روضة الصفا)ی وەرگرتوە کاتێ سوڵتان جلال الدین خوارزم شاە دەوروبەری (٦٢٥ك/١٢٢٨ز) لە ترسی مەغۆلەکانی جەنگیزخان لە ئێران ڕایکردو هاتە بازاڕی خەلات و داگیریکرد لە کاتی مەلیك ئەشرەف بدلیسی و خەلات موڵکی ئەو بوو.

مجدالدین برای وەکیلی بوو لە خەلات و مەلیك ئەشرەف داوا لە پادشاکانی شام و مصری کرد هێزی بۆ بنێرن و هێزیان بۆ هات و لە دەشتی قوش سێ ڕۆژ شەڕ بوو و جلال الدین راگر بوو خەلات ... و هاتە بدلیس مەلیك ئەشرەفت(روشکی) میر بدلیس کچی خۆی دایە جلال الدین و کاتی هێزی کوڕی جەنگیزخان گەیشتە بدلیس جلال الدین لەگەڵ ژنەکەی یان کچی مەلیك ئەشرەف لە شەودا لە شار دەرچون و ئیتر دەنگ و باسی جلال الدین لە لای مێژوونوسان بە کۆتایی هات. یانی کەس نەزانی چی بەسەرهات علاءالدین سمنانی لە (رسالەء

اقبالیە) نوسیویە لە دێیەکێ لە دێهاتی بەغداد دەست بەکاری ئاینی کردو بو بە پینەدۆز و هەندێ دەڵێن یەکێك لە خەڵکی خەلات کە برای لە شەڕی خەلاتدا کوژرابو جلال الدینی ناس کردو کوشتی بەپێ روایەتی(تاریخ کزیلە)و بەپێی روایەتی کتێبی(تذکرۀ دولتشاە) هەندێ کورد تەماعیان لە ئەسپ و جل و بەرگەکانی کرد و کوشتیان.

ئەمەی لە شەرەفنامەدا هاتووە پێچەوانەی ئەوەیە کە ابن الاثیر لە (الکامل)دا لە رووداوەکانی ساڵی (٦٢٨ك/١٢٣١ز) نوسیوە کە شەوێك لە دەرەوەی شاری دیاربەکر تەتەر(مەغۆل) بەسەر جلال الدینیاندا و هێزەکەی پەرت و بڵاویان کرد و لەو کاتەوە دەنگ و باسی ئەو نەماو کەس نازانێ چی بەسەرهات. بێگومان ئەمە لە کاتی ابن الاثیر دابوەو ابن الاپیر پاش رووداوەکانی ئەم ساڵە کە تەتەرەکان ناوچەی دیاربەکرو سێرت و هەندێ لە بۆتان و ماردین و هەولێر و کەرکوکی تالان کرد کۆتایی بە مێژووە گەورەکەی (الکامل)ی هێناوەو لە موسڵ دادەنیشت.

ابن الاثیر نووسیویە کە جلال الدین هاتە شاری (أخلاط) جەوابی نارد بۆ وەکیلی(الملك الأشرف) لە خەلات یانی الملك الأشرف موسی کوڕی الملك العادلی برای صلاح الدین الأیوبي و پێی ووت ئێمە بۆ شەڕو ئەزیەتدان نەهاتوین و نیازی بوو بچێتە ناوچەی دیاربەکر و جەزیرە.

ابن الاثیر باسی نەکردووە خەلاتی بە شەڕ گرتبێ و باسی هاتنی بۆ بدلیس نەکردوە و تەنیا نوسیوە کە زانی تەتەر بە دوای ئەو دادێن چوو بۆ دیاربەکر.

هەروەها نوسیویە هەندێ لە تەتەر لە دیاربەکر چوینە بەدلیس و بلدیسیان سوتاند و شارەکانی سەر بە خەلات ئەردیش(ارجیش) کە شارێکی گەورە بوو هەروەها بارگیرا(یانی مرادیە ئێستا)یان تالان کرد لە مانگی ژی الحجەی ٦٢٨ دیسان لێرەدا باسی نەکردوە کە خەڵاتیان داگیرکردبێ.

شایانی باسه له ی (٦٠٤ک/١٢٠٨ز)دا (الملك الأوحد) کوڕی الملك العادلی برای صلاح خەلاتی داگیرکرد و پاش کۆچی دوایی ئەو خەلات بوه موڵکی الملك الأشرفی برای و(اوحد ایوب کوڕی الملك العادل) له مانگی ربیع الأول ساڵی (٦٠٩)دا وەفات بوو له مەلازگر.

نائب اشرف له خەلات براکەی (الملك المظفر غازی) بوو تا (٦٢٧ک) له بارەی الملك الأوحد والملك المظفر تەماشای (لا ٢٧٣-٢٧٥ و ٣٢٢-٣٢٤) له (شفاء القلوب في مناقب بني أيوب)ی أحمد بن ابراهیم الحنبلی چاپی ١٩٧٨ له شفاء القلوب (لا ٢٩٤-٢٩٥)دا هاتووه که جلال الدین خوارزم شاه له(٦٢٦ک/١١٢٩ز) ئابلوقەی خەلاتی کرد و به شمشێر شالاوی بردەسەر به کوشتن و ئەسیرکردن لەبەر ئەمە الملك الأشرف لەگەڵ کیقبادی (کوڕی کیخسرو) پادشای روم پێکەوەچوون بۆ شەڕی جلال الدین و شەڕ دەستی پێکرد له بیست و نۆی ڕەمەزانی (٦٢٧)و جلال الدین خراپ شکاو زۆر له لەشکری کوژراو هەڵدێرا له شاخەکان و جلال الدین لاوازبوو و ئەشرەف خەلاتی گرت که وێران کرابوو له لای جلال الدینەوه و پاشتر پادشایەکان ڕێکەوتن و سوندیان خوارد دەستدرێژی نەکەنه سەر وڵاتەکانی یەکتر. ملك الاشرف له (٦٣٥ک/١٢٣٧ز) کۆچی دوایی کرد.

حنبلی له (لا ٢٩٩)دا نوسیویەتی نائب الملك الاشرف وەختەك له خەلات حسام الدین(علی حماد الموصلی) بووه له (لا ٣١٤) له شفاء القلوب دا هاتووه که له ساڵی (٦٣١) الملك الایوبی چوو بۆ سەر وڵاتی کیقبادی کوڕی کیخسرو چونکه دەستدرێژی کردبوه سەر خەلات.

ابن خلکان له(وفیات الاعیان)دا باسی ڕووداوەکانی خەلاتی کردوه، له بەرگی (٥، لا ٨١) چاپی دار صادر-بیروت داهاتووه جلال الدین له مانگی شوالی (٦٢٦)

ئابلوقـەی خـەلاتی دەدا کـە الملـك الاشـرفی ئـەیوبی بـوو و لـە مـانگی جمـادی الاخرەی ساڵی (٦٢٦)دا، بەڵکو لە (لا ٦٢٧)دا داگیریکرد، و لـە ڕۆژی هـەینی ١٢ ڕەمەزانی ٦٢٧ ملك الاشرف خەلاتی گرت کە وێران کرابوو بـەهۆی ئـەو شـەڕەی ملك الاشرف و علاءالدین کیقباد لەگەڵ جلال الدین لە نێوان ارزنکان(ئەرزنجان) و خەلات وەك لە (لا ٣٣٢)دا هاتووە هەروەها ابن خلکان نوسیویەتی ساڵی (٦١٨) ملك الاشرف خەلاتی دایە برای خۆی شهاب الدین غازی بە وەکالەت بەڵام کـەلێی یاخی بوو لە ١٢ جمادی الاخـرە ڕۆژی دوو شـەممە ٦٢١ لـە شـهاب الـدین سـاند تەماشـای (لا ٣٣١) بکـە. لـە بـارەی الملـك الاوحـدیش نوسـیوە کـە لـە (٦٠٤)دا خەلاتی گرت لە (٦٠٩) دا وەفات بوو.

بە گوێرەی ئەم زانیاریانەی سەرەوە خاوەنی کتێبی(روضة الـصفا) بـە هەڵـە چوە ئەگەر ملـك الاشـرفی ئـەیوبی کردبێتـە مـیری بـدلیس و مـیرەك لـە میرانـی روشکی و شەرەفخانیش ئەو زانیاریانەی خۆی لەم کتێبەی وەرگرتوە.

بـەپێی بۆچـوون ئـەو کاتـە میرنـشینی روشـکی پەیـدا نـەبووبو و ئـەو عەشیرەتانەی سۆران ئـاوارە نـەبوبون بـۆ ناوچـەی بـدلیس و لەوانەیـە لـە کـاتی شاڵاوی مـەغۆل لـە کـاتی هولاکـودا ئـاوارەبوبن وەك چـۆن چـەندین عەشـیرەتی دیکەی کورد لـەو کاتـەدا ئـاواربون بـۆ وڵاتـی شـام و میـسر و هـەروەها هـەردوو عەشیرەتی (بنوبابیر) و (بنولـوبین)یـش هـەر لـەو کاتـە ئـاواربوون تـا گەیـشتنە باکوری ئیفریقیا.

ئـەو عەشـیرەتانەی ئـاوارەبون بـۆ ناوچـەی بـدلیس وەك شـەرەفخان ناویـان هێناوە لە (لا ٤٧٤) لە شەرەفنامەی فارسی چاپی قاهرە ئەمانە بوون لە بلبـاس و قوالیسی: کلە چیری، خربیلی و بالکی و خیـارگی و کـوری و بریـشی و سـکری کارسی و بیدوری و بلاکردی، و ئەمانـە هـەموویان بلباسـن هـەروەها عەشـیرەتی

زردوزی و انـداکی و پرتـافی و کـردی کـی و سـهرودی و کاشـاغی و خالـدی و واستودکی و عزیزان وتویەتی ئەمانە هەمووی لە عەشیرەتی (قوالیسی)یە.

لە شەرەفنامەی دەستخەتی شەرەفخان لە کتێبخانـەی بودلییـان لـە زانکـۆی ئۆکسفۆرد کەدانەی وێنەکراوی لە لامە لە پەڕەی (١٢٣)دا لە پاش سکری وشەی (بلبـاس)ی هـاتووە و(کاریـسی) لـە بـاتی(کارسـی) هـاتووە و پـاش (انـداکی) (قوالیسی) هاتووە و (کورکی) هاتووە لە باتی(کردی کی)و (سهروی) هاتووە لـە باتی(سهرودی) و (کاشاخی) هاتووە لە باتی (کاشاغی) و(استورکی) هـاتووە لـە باتی (استودکی) هەروەها (مالکی) بـە مـیم هـاتووە لـە بـاتی (بـالکی) بـە(بـێ). شـایانی باسـە شـەهید مـەلا جـەمیلی ڕۆژبـەیانی لـە چـاپی دووەمـی تەرجەمـە عەرەبیەکەی خۆی بۆ شەرەفنامە(لا ٦٠٣) بە (مالکی) بە میمی نوسیوە و گومان نیە ئەمە وەرگرتوە لە شەرەفنامەی دەستخەتی شەرەفخان کە داوای لە من کرد دانەیـەکی بـۆی کـۆپی بکـەم لەبـەر دانـەی خـۆم تـا ئـەمجارە دانـەی ئەسـڵی شەرفنامەی تەرجەمە بکات و دانەم بۆی کۆپی کردو بۆم نارد لەگەڵ ئـەو بیـست تابلوەی نێو نوسـخەی ئەسـڵی شـەرەفنامەدا بـەڵام بـە ڕەشوسـپی چـونکە هـەر بەڕەش سپی بۆم هاتبوون لە کتێبخانەی بودلییانەوە.

لەگەڵ ئەمەش گومان دەکەم شەرەفخان ناوی(مالکی) بـە هەڵـەی نوسـیبێ و ڕاستەکەی (بالکی–بالەکی) بێ چـونکە عەشـیرەتێکی کـورد بـە نـاوی(مـالکی)م نەبیستوە.

لە بارەی (بلاکردی) مەلاجەمیل و هـەروەها هـەژار موکریـانیش لـە وەرگێـڕە کوردیەی شەرەفنامە (لا ٦٧٩) بـە پیتـی (گ) یـانی (بلاگـەردی)یـان نوسـیوە و هەژار وشەی (بلا) بە (بەلا)ی نوسیوە. شایانی باسە تا ئیمڕۆ گەردیەکان دبێـژن عەشیرەتی گەردی لە ناوچەی هەکارییـەوە هـاتون بـۆ ناوچـەی هـەولێر. جـا نـە

دوره لە بدلیسەوە یەکەمجار گەڕابن بۆ هەکاری و ماوەیەك لەوێ مابن و پاشتر هاتبنە ناوچەی هەولێر.

لە بارەی (کارسی) یان (کاریسی)یەوە ئەگەر وشەکە(گارسی) بێ بەپیتی (گ) وەك هەژار نوسیویەتی ئەوا عەشیرەتی (گارسی)یە کە عەشیرەتەکی گەورەیە لە بۆتان و بەناوبانگە و هەندێکی لە باشوری دەریاچەی (وان)یش لە (گوران دەشت)ی هەیە کە من لێیان لە گۆران دەشتی بیستوە و دەیان ووت ئێمە کۆچەر بوین و لە بۆتان دەهاتنە بۆ زوزانی ئەم ناوچەیە و ساڵەك گایەکانمان وەستابون و بوبار هەڵگرتن لاوازبون و ئێمە لێرە ماوین و بە ئێمە دبێژن (گارسێی گاوەستایی) لە باسی میرنشینی بۆتاندا لە شەرەفنامە ناوی عەشیرەتی گارسی و هەروەها (أستوری) هاتووە لە عەشیرەتەکانی بۆتان.

لە بارەی عەشیرەتی (سهروی) ڕەنگە عەشیرەتی (سوران) بێ چونکە لە کوردستانی باکور بە(سوران) دبێژن(صوهران–سوهران) و عەشیرەتی (صوهران) لە بۆتان کۆچەر بوون و تا ئێستاش هەندێکیان کۆچەرن و لە کوردستانی باشورەوە هاتوون. نەدورە لەگەڵ بلباس و قەوالیسی هاتبن و پاشتر لە وەختەکدا هاتبن بۆتان و لە بۆتان بۆیان دبێژن(صوهرکی) و هەندێکیان لە جزیرا بوتان و لە شوێنەکانی دیکەی بۆتان ئێستا جێنشینینن. بلباس و یان بلباس و صوهرکیان حیکایەتی (شێخ فەرخ وستی) کە وێنەی قەبرەکانیانم گرتوە لە گوندی (داودیان) لە نیزیك شاری ئێستای قەلادزێ لەگەڵ خۆیان هێناوەتە کوردستانی باکور و بلباس لە گەڕانەوەیدا حیکایەتی (خەج و سیامەند)ی لە کوردستانی باکورەوە هێناوەتە ناوچەی سۆران. خوالێخۆشبو شاگردەکەم مەلا خەلالەفێ بافەیی کە لە جەزیرەی بۆتا حیکایەتا(فەرخ وستی) کۆکردەوە بە دورو درێژی لە سێ دەفتەردا و ئێستا دەفتەرەکانی هەموویان لە لامە کە پترە

لە(٤٠٠٠) لاپەرە نوسیویەتی هندەك لە صوهرکیان دبێژن سەرهاتیا (فەرخ وستی) لە باژارێ (بنباسا) رووداوە،جا گومان نیە ئەوە (بلباس)یەو لە کوندا تا ئیمرۆ هەندێ عەشیرەتی بلباس لە ناوچەی قەلادزێ هەیە وەك ناوچەکانی سەردەشت و لاجان و رانیە و کویسنجەق و هەولێر.

لە شەرەفنامەی دەستخەتی شەرەفخان ناوی (بلاکردی) و (خالدی) نەهاتووە، خالدی–خالتی یەکێکە لە عەشیرەتە کۆنەکانی کوردستانی باکور، عەشیرەتەکی گەورەو شەرکەر بووە و هەروەك عەشیرەتی پازوکی و سیپکی ئێزیدی بووەو ئێستا لە شنگال و دهۆك و شێخان ئێزید خالدی–خالەتی هەنە و هەموشیان لە زولم و زۆرداری و کوشتارەکانی دەولەتی عوسمانی راکردون بۆ کوردستانی باشور و هەندێکیان راکردون بۆ ئەرمەنستان، عەشیرەتی (سەکر) ئێستا لە قەلادزێ لە پشدەر هەیە بلباس نین هەندێ لە تەمەندارەکانی پشدەر دبێژن سەکر لەگەل بلباس هاوکاربون کاتێ چون لەگەل (دەولەتی ئێران؟) بۆ سەر (محەمەد بەگی) بوداق خانی حاکمی سنجاغی(کەستانە) لە پشدەر لە میرە بابانیەکانی ئەو کاتەو کوشتنی لە نیوەی دووەمی سەدەی شازدەیەمدا و ئیبراهیم ئاغای (محەمەد ئاغای گەورە) لە میر ئاودەلی شەری سەکری کردو لە پشدەری دەربەدەرکرد تەنیا شتێکی کەمی لێماوە ئەوەشی لە سەدەی نۆزدەیەمدا چونکە لەگەل بلباس دژی عەشیرەتی (میرئاودەلی) بووە و هەندێ لەو تەمەندارانە کە ئیسماعیل ئاغای مەحمود ئاغای ئالاوەیە دبێژی محەمەد بەگ باپیری فەقێ ئەحمەدی دارشمانەیە.

(شاخی سەکرا) کە یەکێکە لە هەرە شاخە بەرزەکانی کوردستانی باشور لە بالەکایەتی بە ناوی عەشیرەتی(سەکر)ەوەیە چونکە ئێستا دەوری یازدە گوندی

سەکر لە بناری ئەم شاخە هەیە کە بەرزیی (٣٤٦١م) بە قەد بەرزی شاخی قەندیل.

بێگومان هەندێ لەو نۆزدە عەشیرەتەی شەرەفخانی وتوە بلباس و قەوالیسییە هەندێکیان نە بە ئەسڵ بلباسە و نە قەوالیسییە بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم دوو عەشیرەتە گەورە بوون عەشیرەت گچکەکان خۆیان داوەتە پاڵیان و ناوی بلباس و قەوالیسی بەسەریاندا زاڵ بوە وەك سەکرو باڵەکان و هەردوو عەشیرەتەکە سەرکردایەتیانی کردوە وەك چۆن ئێستا هەر عەشیرەتەکی کوردی بگری لە چەند عەشیرەتەك پێکهاتووە تاك تاك نەبێ، تا تەواوبونی شەرەفنامەی (١٦٠٥) هەر بەشێك لە هەریەك و یان لە هەندێ لە عەشیرەتانە لەوانە بلباسیش لە بدلیس مابون.

## بلباس

رۆژی ٢٠٠٣/٣/٢١ چاوپێکەوتنم تۆمارکرد لەگەڵ بەڕێز حەسەن کانەبی لە ڕانیە کە پارێزەرەو لە گەورەکانی بلباسە و لە موالیدی (١٩٢٠)ە باسی فەقێ وەیسی کرد کە چۆن چوەتە ناوچەی مەخمور حەسەن وەها ڕەچەڵەی خۆی بۆ منی ووت: حەسەن کوڕی کانەبی کوڕی خدر کوڕی کانەبی کوڕی خدر کوڕی کانەبی کوڕێ خدر کوڕی حمەئاغا کوڕێ کاك خدر کوڕی مراد کوڕێ خدر کوڕی فەقێ وەیسی.

پێنج (خدر) لە ڕەچەڵەکەکەدا هەیە یانی بە خۆیەوە دەبنە سێزدە پشت کاك حەسەن وتی: فەقێ وەیسی کوڕێکی دیکە هەبوە بەناوی کانەبی کە سەرۆکی هەموو بلباس بووەو منالی نەبوە وتی فەقێ وەیسی سەرۆکی بلباس شەڕی لەگەڵ خان ئەحمەد خانی ئەردەلانی کردوە یانی لە نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەیەمدا، هەروەها وتی بلباس کە (٢٤) تیرە بووە دوازدە تیرەی لە موکریان

چوەتە بدلیس و پاش شەڕی چالدێران و لەکاتی سولتان سلیمانی قانونیدا گەڕاون.

کاک حەسەن وتی فەقێ وەیسی نزیکەی (٤٠٠) ساڵ لەمەوبەر بووە و ئێستا شوێنەواری خانوی لەسەر شاخی قەرەچوغ ماوە کە دەوڵەتی عوسمانی داوای لێکرد بچێتە دەشتی هەولێر و مەخمور بۆ بەرهەڵستی هەندێ تاقمی خراپ کە لە ناوچەی موسڵەوە شالاویان دەهێنا بۆ سەر خەڵکی ئەم ناوچەیە و توانی بەسەریاندا زاڵ ببێ.

هەروەها وتی ئێستا بلباس شەش تیرەی سەرەکین: سن، رەمك، ئوجاغ، پیران، مەنگوڕ و مامەش و ئەمانە لە بدلیس گەڕاون بۆ نێوان شاخی هەیبت سوڵتانی کۆیەو چۆمی ئالاوە کە دێی مەلا خەلیلی مەنگوڕییە و بلباسەکان بە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە سەرۆکی خۆیان دەستنیشان دەکرد، مخابن کاک حەسەن لە (٢٠١٢/١٠/٢٤) لە ڕانیە کۆچی دوایی کرد. شایانی باسە مامەش دبێژن ئەم لە زوریەتی مەلا ئیدریسی بدلیسین.

## میرانی بدلیس لە عەشیرەتی بلباسە

لە بدلیس هەندێ لە بلباس گەڕاوەتەوە جێگەی ئەسڵی خۆی لەگەڵ (غرس بالو)ی برای میری بدلیس ضیاءالدین ابوالفوارس الروشکی ئەوەشی لە نیوەی یەکەم و یان لە ناوەڕاستەکانی سەدەی چواردەیەمدا (ابن ناظرالجیش عبدالرحمن کوڕی محمد التیمي) کە لە پێش ساڵی ٧٧٩ك کتیبی(التثقیف)ی تەواو کردوەو ئاخرین زانیاریەکانی ساڵی (٧٧٨ك/١٣٧٦ز) نوسیوە غرس بالوی برای ضیاءالدین الفوارس الروشکی و (جملوك) و بهاوالدین کوڕی غرس بالو یاخی بوون لە ڕێگای خوراسان و (دەربەندی قەرابولی) کە ڕێگای بازرگانی میسرە(بۆ

وڵاتانی ڕۆژهەڵات) بەڵام لەگەڵ ئەمەشی لە میسرەوە یانی لە لای حکومەتی میسرەوە نامە بۆیان دەنوسرێ بە زاراوەی (السامی) و دیاری بۆیان دەنێرین بۆ ڕازیکردنیان تەمیمی ئەمەی نوسیوە لە (لا ٨١)دا چاپی قاهرە ١٩٨٧ تەمیمی لە (٧٨٦ك/١٣٨٤ز) وەفات بوە وەك بەڕێز دكتۆر زرار صدیق لە مێژووی وەفاتی ئاگادارکردم و هەروەك إبن فضل الله العمري لە (دیوان الانشاء) یانی دائیرەی نوسینی نامەکانی سوڵتانەکانی میسردا کارکردوە و نامەکانی نێوان سوڵتانەکان و میرانی کوردیان دیوەو زانیاریەکانیان لەو نامانە وەرگرتووە، لەبەر ئەوەی بەشێك لە بلباسەکان لە بدلیس گەڕانەوە بۆ شوێنەکانی پێشتریان و باسی گەڕانەوەی (قەوالیسی) هەر نیە بەپێی بۆچونم دەبێ(غرس بالو) سەرۆکی ئەو بلباسانە بێ کە لەگەڵدا گەڕاون و لەوانەیە پاشتر بەشێکی دیکەشی گەڕابن یانی بەدوو قۆناغ و بە دووجار گەڕابن، لەبەر ئەوەی برای میری بدلیس ضیاءالدین روشکی بوە دەبێ میرانی بدلیس لە عەشیرەتی بلباسبن کە لەو عەشیرەتانەی دیکە بەهێزتر بووەو میریش دەبێ لە لایەنی بەهێز بێ نەك لە لایەنی لاواز و ئەوەی لە شەرەفنامەدا هاتوە لە بارەی ئەسڵی میرانی بدلیس کە لە زوریەتی پادشا ساسانیەکانن دورە لە ڕاستی، بێگومان عەشیرەتە هەرە گەورەو بەهێزە میرنشین دادەمەزرێنێ و میرەکان لەو عەشیرەتە دەبن و بلباسیش لە هەموان بەهێزتر بووە.

قلقشندی لە صبح الأعشی دا ب٧ ل٢٨٨ زانیاریەکانی (التثقیف) وەرگرتوە لەبارەی (غرس بالو)یەوە لە پێش تەمیمی العمری لە (التعریف بالمصطلح الشریف) ل٦٠ چاپی ١٩٨٨ باسی غرس بالو و جملوکی نوسیوە تەنیا نەی وتوە غرس بالو برای ضیاءالدین الروشکییە.

## میرانی بدلیس

١- عزالدین: شەرەفخان لە شەرەفنامەدا نوسیویەتی یەکەم کەس بووە بوەتە میری بدلیس و پاشتر بوەتە میر حەزو(حظو) و میرانی حەزو لە زوریەتی ئەون.

٢- ضیاءالدین: شەرەفخان نوسیویەتی پاش عزالدین برای بوەتە میری بدلیس و میرانی بدلیس لە زوریەتی ئەون و کاتی ئەو عزالدین دیاری نەکردوە.

٣- الملك أشرف: شەرەفخان نوسیویەتی لە سالّی (٦٢٥ك/١٢٢٧ز)دا زیندوبوە و هاوکاتی الملك الأشرفی ئەیوبی بوە.

لە پێشدا ڕەخنەم لە شەرەفخان گرت و نوسیم میرێکی بدلیس بەم ناوەوە نەبوە و ئەو ملك الاشرفەی باسی کردووە کە خاوەنی شاری خەلات (خلاط) بوو و ڕووداوەکانی لەگەڵ جلال الدین خوارزم شاە ملك ئەشرفی ئەیوبی بوە نەك میرێکی بدلیس بوە بەم ناوەوە و میرانی بدلیس نازناوی (مەلیك)یان نەبوە.

٤- مجدالدین: شەرەفخان نوسیویەتی برای ملك أشرف بوە و وەکیلی بوە لەخەلات و شەڕی لەگەڵ جلال الدینی کردوە و پاش کۆچی دوایی ملك ئەشرەف بوەتە میر.

٥- عزالدین.

٦- ئەبوبەکر.

٧- شێخ شەرەف.

٨- ضیاءالدین (أبوالفوارس الروشکي).

٩- حاجی شەرەف کوڕی ضیاءالدین.

شەرەفخان نوسیویەتی پاش ملك مجدالدین عزالدین بوەتە میر و پاش ئەو ئەبوبەکر و پاش ئەو شێخ شەرەف و پاش ئەو چیاوالدین یانی(ضیاءالدین

الروشکی) هاوکاتی تەیمورلەنگ و پاش ئەو حاجی شەرەفی کوڕی ضیاءالدین بوە کە ملکەچی تەیمور بوە لە (٧٩٦ك/١٣٩٤ز).

شەرەفخان حاجی شەرەف نەبێ ئەوانەی دیکە تەنیا ناوی روتیان هێناوە کە عزالدین و ئەبوبەکرو شێخ شەرەف و ضیاءالدینە کە دەبێ ئەم چوارانە لەگەڵ مجدالدین و ملك ئەشرەف و لەگەڵ حاجی شەرەف لە ساڵی (١٢٢٧-١٣٩٤) فەرمانڕەوایی کردبن لە ماوەی (١٦٧)ساڵدا و ئەمەش جێگەی بڕوا پێکردن نیە بە ئاسانی بە دور دەزانم حەوت کەس (١٦٧)ساڵ حوکمڕانی کردبێ.

بەپێی بۆچونم ئەبوبەکر و شێخ شەرەف هەردوو یەك کەسن کە (شرف الدین ابوبکر)ە وابن فضل الله العمري ناوی (شرف الدين ابوبكر)ی هێناوە لە (التعريف بالمصطلح الشريف) و نوسیوەتی تۆمەتبار دەکرێ کە شیعەیەو لەسەر مەزهەبی (نصيريه)، عومەریش لە ساڵی (٧٤٩ك/١٣٤٩ز)دا وەفات بووەو دەویەری ساڵی(٧٤٢ك) دەست بە تەئلیف کردنی (التعريف)ی کردوە و لە کاتی تەئلیف کردنیدا شرف الدين أبوبكر میری بدلیس بووە.

لە بارەی (ضياء الدين ابوالفوارس الروشكی)یەوە (ابن ناظر الجيش عبدالرحمن بن محمد التميمي) بەم ناوەی سەرەوە ناوی هێناوە لە کتێبی (التثقيف)دا کە پاش العمري بوەتە کاتبی دیوانی نامەنوسی لە میسر. لە بەڕێز دکتور زرار صدیقم پرسی کە دانەی کتێبەکە لایەتی وتی تا ساڵی (٧٧٨ك/١٣٧٤ز) زانیاری تێدایە و لە ساڵی (٧٨٦) تەمیمی کۆچی دوایی کردووە، لە (التثقيف)دا (لا٧٥) ناوی چیاوالدین الروشکی هاتووە کە میری بدلیس بووە و نامەی بۆی دەنوسرا لە لای سوڵتانی میسرەوە و کاتی باسی کوڕی دەکات (امیر حاج) هەست دەکرێ ضیاءالدین لە ساڵی (٧٥٣ك/١٣٥٢ز) وەفات بوبێ چونکە نوسیوەیەتی (امیرحاج) لە شوینەکەی جێگیربوە و لەو

ساڵەدا نامە بۆی نو ـ لە میسرەوە یانی لە لای سوڵتانی میسر (صالح صلاح الدین صالح لە مەمالیکی تورك). هەروەها نوسیوەتی چیاوالدین أبوالفوارس الروشکی برای (غرس بالو) ئەوەشی لە (لا٨١)دا کاتی نوسیویەتی غرس بالو و جملوك و هەروەها بهاوالدین کوڕی غرس بالو ڕێگری دەکەن لە نیزیك شارەزوور لە ڕێگای خۆراسان و ڕێگای (دەربە قەرابولی) کە ڕێگاکانی کاروانەکانی میسرە بۆ ڕۆژهەڵات بەڵام بۆ ڕازی کردنیان نامە بۆیان دەنوسرێ لە میسرەوە و دیاری بۆیان دەنێرین.

قلقشندی لە صبح الأعشی ب٧ ل٢٧٩ زانیاریەکانی لە بارەی چیاوالدولە کوڕی لە (التثقیف)ی وەرگرتووە و ناوی (امیرحاج)ی تێدا بە هەڵە (الرحاح)ی هاتووە.

بەم زانیاریانەی سەرەوە تێیەزانین کە چیاوالدین روشکی بە (٤٣)ساڵ لە پێش ساڵی هاتنی تەیمور بووە، نە دورە کوڕی (شرف الدین ابوبکر) بێ، لە بارەی أمیر حاج کوڕی چیاو الدین روشکی دەبێ ئەمە (میر حاجی شەرەف) بێ کە شەرەفخان نسیویەتی کوڕی چیاو الدین بوەو ملکەچی تەیمور بوە کاتێ هاتوەتە ناوچەی بدلیس.

١٠- شمس الدین بن ضیاءالدین الروشکی:

تا ساڵی ٨٢٤ك زیندو بوە و پاشتر لە لای ئەسکەندەری کوڕی قەرایوسفی قەرەقوینلویەوە کوژراوە و پێ دەچێ لە ساڵی (٨٣٠ك/١٤٢٦ز)دا بێت چونکە لە (تاریخ الغیاثي) لە ٢٥٦دا هاتووە ئەسکەندەر لەو ساڵەدا ئابلۆقەی بدلیسیداو پارچەیەك لە پارەی ئەویش لە لامە و موری نوسراوە (شمس الدین بن ضیاءالدین الروشکی) لەسەر دەستنوسی (منافع الحیوان)ی عبیدالله بن بەختیشوع. تەماشای (لا ٢٤٩-٢٥٠) بکە لە کتێبەکەمان (تابلۆکانی شەرەفنامە) چاپی

سێیەم. ئەوەی لە (لا ٤٨٩)دا هاوە لە شەرەفنامە کە کوڕی حاجی شەرەفە هەڵەیە بەڵام پاشتر لە (لا ٤٩٦)دا نوسیوە (شمس بن ضیاء الدین الروشکی). و ها ئاشکرابو کە شمس الدین برای حاجی شەرەفە.

سەیر نیە ئەگەر مێژوونوسی مەزن شەرەفخان ناوی هەندێ لە باپیرانی لە میرانی بدیس نەزانیبی و یان تووشی هەڵە بوبێ لە بارەیانەوە کە پێش ئەوبون بە ماوەکی زۆر و سەرچاوەکانی مێژووی ئەو کاتە کەم بەدەست دەکەوت بەڵێ سەیر نیە چوم من خۆم تەنیا ناوی سێ کەس لە باپیرانم دەزانم بە شێوەیەکی ڕاست و دروست و زۆریشم هەوڵداوە ناوی حەوت هەشتێکیان بزانم بەڵام سودی نەبوە.

ئەو کارە گەورەی شەرەفخان کردوە لە هێنانەوەی ناو و ڕەچەڵەی ئەو هەمو میرە کوردانە لە سەرانسەری کوردستان لەو کاتەدا کە نە ئوتومبیل هەبوە بۆ هاتوچۆکردن و نە تەلەفۆن و بروسکەو نە مۆبایل... لە تاقەتی هیچ کەسێکدا نەبوە، بەڕاستی کارەکی مەزن و سەیری کردوە.

١١- محمد بن شرف: پارەی هەیە لە مۆزەخانەی بریتانی وێنەی لە لامە.

١٢- شرف بن محمد: پارەی لە مۆزەخانەی بریتانی هەیە و وێنەی لە لامە، لەبەر ئەوەی مێژوو لەسەر پارەی ئەو و باوکی نیە کاتیان نەهاتوە زانین. شەرفخان لە شەرەفنامەدا (لا ٤٩٦) نوسیوە ئەم دوانە پارەیان هەبوە وەك شمس الدین بەڵام کاتیان نەزانیوە.

١٣- شرف بن شمس الدین بن ضیاءالدین الروشکی.

١٤- شمس الدين بن شرف بن شمس الدين، له شەرەفنامە (لا ٥٠٤)دا هاوه كه هاوكاتی میر أبدالی میری بۆتان بوه یانی باوکی (زین)ی دلّداری(مه‌م). میر شمس الدين دەوروبەری سالّی (٨٤٧ك/١٤٤٣ز) وەفات بوه.

١٥- میر ابراهیم بن شمس الدين: له بارەی میر ئیبراهیم تەماشای كتێبەكەمان بكەن (تابلۆكانی شەرەفنامە) لا ١٧٨-١٨٣.

١٦- میر حاجی محەمەد كوڕی میر ئیبراهیم: له (٨٦٥ك/١٤٦١ز)دا وەفاتی كردوه وەك له شەرەفنامە (لا ٥٠٤)دا هاتووه.

١٧- ابراهیم كوڕی حاجی محەمەد: پاش كۆچی دوایی باوكی له(٨٥٦ك) بوەته میر.

١٨- شاة محمد بن ابراهيم بن حاجی محمد: قدم من مدينة قم إلى بدليس سنة (٩٠٠ه) وتولى امارتها الشاغرة توفي سنة (٩٠٣هـ) في متحف استنبول تقول باسم دفن في طوك ميدان بجانب شمس الدين بن ضياء الدوسكي، ص٥١٨.

١٩- ابراهيم بن شاه محمد: حكم سنتين وكان صغيراً.

٢٠- شرف بك بن شمس الدين بن حاجي محمد: اخذ الامارة بعد قدوم من أروخ من ابراهيم بن شاة محمد قتل في معركة ضد القوات العثمانية يقودها اولا من سنة ٩٣٩هـ هو جد شرفخان المؤرخ.

٢١- شمس الدين بن شرف بك بن شمس الدين.

٢٢- شرفخان بن شمس الدين(المؤرخ): ولد في كرهرود من اعمال قم ٩٤٩هـ تولى الامارة ٩٨٦هـ ورجع من ايران إلى كردستان توفي ١٠١٢هـ/١٦٠٤م.

أمراء بدليس بعد عهد شرفخان المؤرخ:

جاءتني القائمة من السيد عادل بن شرفخان من بدليس نقلها من شواهد قبور الأمراء: الأسماء والتواريخ كما جاء في رسالة ملا عمادالدين الذي استلم القائمة وكانت الرسالة بتاريخ (١٠/٥/١٩٧٩) كتبت تواريخ الوفيات امام أسمائهم، وكانت الرسالة بالعربية ولا أعلم هل ان تلك التواريخ كلها صحيح أم لا؟

١- شمس الدين بن شرفخان (المؤرخ).

٢- ضياءالدين بن شرفخان.

٣- عبدالخان بن شمس الدين الملقب بـ(عادل) و(كژخان) بسبب بقائد في الجبال ثائرا على العثمانية أعدم في استنبول سنة ١٠٦٧ وعمره تسوية سنة كما قاله لي عادل شرفخان عندما زرته في بدليس سنة ١٩٧٧.

٤- ضياءالدين بن عبدالخان.

٥- جلال الدين شرفخان بن ضياءالدين بن عبدالخان توفي ١٠٨٦هـ.

٦- محمد خان ت ١١٠٢.

٧- سلطان احمد ت ١١٠٨.

٨- سلطان مصطفى ت ١١٠٩.

٩- محمد شرفخان السابع ت ١١١١.

١٠- نوح خان ت ١١١٢.

١١- احمد فائق خان ت ١١١٥.

١٢- حسن خان الاول ت ١١٢٩.

١٣- مرادخان ت ١١٣٢.

١٤- محمد سعيد خان الاول ت ١١٣٦.

١٥- عادل خان ت ١١٤٠.

١٦- صالح خان الاول ت ١١٤٣.

١٧- عادل خان الثاني ت ١١٥٠.

١٨- محمودخان ت ١١٥٢.

١٩- قاسم خان ت ١١٥٢.

٢٠- محمد شرفخان الثامن توفى ١١٦٢.

٢١- كل آب خان ت ١١٦٤.

٢٢- محمد سعيد خان الثاني ت ١١٧٠.

٢٣- مظفرالدين خان ت ١١٧٧.

٢٤- حسن خان الثاني ت ١١٨٧.

٢٥- سعيد خان الثالث ت ١١٩٠.

٢٦- سليم خان ت ١١٩٤.

٢٧- محمد عادل خان الثالث ت ١١٩٩.

٢٨- بكرخان ت ١٢٠٢.

٢٩- محمد شرفخان التاسع ت ١٢١١.

٣٠- بى جان خان ت ١٢١٧.

٣١- محمد قوجان خان ت ١٢٢٠.

٣٢- محمد عادل خان الرابع ت ١٢٢٢.

٣٣- محمد علاءالدين خان ت ١٢٢٥.

٣٤- محمد كمال خان ت ١٢٢٦.

٣٥- هاشم خان ت ١٢٢٨.

٣٦- ابراهيم خان الرابع ت ١٢٣٠.

٣٧- سليمان خان ت ١٢٣٤.

٣٨- حيدر خان ت ١٢٣٥.

٣٩- صالح خان الثاني ت ١٢٣٦.

٤٠- محمد فائق خان الثاني ت ١٢٣٨.

٤١- محمد فتاح خان بن الامير الكبير يوسف بك لم يتوفى الامارة ت ١٢٤٢، وهو الجد الثالث لعادل شرفخان بدليسي اسكي بلدية رايسى.

٤٢- بولاط شرفخان العاشر ت ١٢٤٥ هو الخاتمة للأمراء الذين جاءوا يعد شرفخان الخامس المؤرخ(١٢٤٥ك/١٨٢٩ز).

٤٣- شرف بن شرفخان لم يعلم تاريخ ميلادهم.

مەلا عمادالدين مەلا محەمەد هێرڤسی مەلایەکی بەتوانایە لە چەند شارەك بوەتە موفتی وەك شاری بازید لە مانگی ئابی ١٩٧٧ کە چومە بدلیس لەگەڵ من لە نێو شار گەڕا و شوێنەوار و بینا تاریخیەکان لەگەڵ ڕەحمەتی مەلانورالدین پێشانی منیاندا و پێکەوە چوینە نێو ئاڤدز (تونێل) اکەلها بدلیسی وەك بە

درێژیم نوسیوەتە لە کتێبەکەمدا (گەشتەکی شوێنەواری دکوردستانا باکوردا).

ئەو کاتە موفتی بدلیسی بوو.

ڕۆژی ٢٠٠٨/٦/٢٦ مەلا عیمادالدین هاتە ماڵمان لە سلیمانی لە ڕۆژی پاشتر چوین بۆ سەر قەبری شەهیدانی هەڵەبجە و چوین بۆ تەوێڵە و بوو تاڤگەی زەڵم و لە ٢٩دا گەڕا بۆ زاخۆ، دیدارێکی فراوانم لەگەڵدا تۆمارکرد بە کامێرای ڤیدیۆ و شریتی کاسێت و مەلایەکی زۆر بە مەعلوماتە و چەند تەڤلیفەکیش هەیە.

عادل بەگ کە پێشتر سەرۆکی شارەوانی بدلیسی بو بە منی وت کتێبەکم تەئلیف کردوە لە مێژووی بدلیس دا و چاپم نەکردوە بەڵام پاشتر بیستم چاپی کردوە مرۆڤەکی شارەزابو وەك لەو کتێبەمدا نوسیوە.

لێرەدا نامەی مەلا عمادالدین دەهێنین:

# کورتە باسێکی شۆڕشی ساڵی ١٩٢٠ لە عێراق

نوسینی: کاروان عبدالکریم سمایل

لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٠ زنجیرەیەك رووداو پێشهات سەریان هەڵدا وایكرد بارودۆخی سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتی بەشی زۆری ناوچەکانی عێراق بەرەو دۆخێکی ناهەموار ببات بە جۆرێك ولات کەوتە ناو گێژەلوکەی ناسەقامگیریەوە،دوای ئەوەی خەڵکی عێراق بێ ئومێد بوون لە جێ بەجێ کردنی بەڵێنەکانی دەسەلاتدارانی بەریتانی و پشتگوێ خستنی داهاتووی ولات ببوە هۆی بێزاری سەرکردەکانی بزوتنەوەی نیشتمانی ترس و دڵە راوکێیان هەبوو لە داهاتووی ولاتەکەیان،سەرهەڵدانی ئەم رووداوانە دواتر بە شۆرشی بیست ناوی دەرکرد ئەمەش چەند هۆکاریك بوونی هەبوو کە رێگە خۆشکەر بوو لەبەردەم سەرهەڵدانی نارەزاییەکی سەرتاسەری لە ولات بەرامبەر بە هێزی داگیرکەر سەرەرای ئەوەش بەریتانیەکان سیاسەتێکی خراپیان بەکار دەهێنا بەرامبەر بە گەلی عێراق ، سەر ئەنجام خەڵك بەرامبەر بەم هەلوێستانە بێ دەنگ نەبوون بریاریان دا هەرچۆنێك بێت دەبێت بەریتانیەکان دەربکرێت و گۆرانکاری لە ولاتەکەیان بکرێت ، باشترین رێگەش بەلایەنەوە بریتی بوو لە بەرپاکردنی شۆرشێکی جەماوەری کە زۆربەی ناوچە و شارەکانی عێراق بگرێتەوە .بەشێك لە سەرچاوە مێژووییەکان ئەم رووداوانە بە شۆرشی ساڵی ١٩٢٠ ناوزەند دەکەن،هۆکار گەلێك دەخەنە روو کە پاڵنەری ئەم شۆرشە بوو :

**هۆكاری سەرهەڵدانی شۆرش:**

**یەكەم / هۆكارە ناوخۆییەكان :**

١ – جیاوازی نێوان حوكم كردنی سیاسەتی بەریتانیا و سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی لە بەرێوەبردنی كارەكانیان لە عێراق،بە جۆرێك سیاسەتی رژێمی بەریتانیا لەگەڵ سەركردەی خێڵەكان یەكی نەدەگرتەوە بەشێكی زۆری خەڵك لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی راهاتبوون بۆیە ئەو سیتسەمەیان پێ پەسەند نەبوو،چونكە بەریتانیاكان زۆر بە شێوەیەكی نادروست مامەڵەیان لەگەڵ خەڵك دەكرد بە چاوێكی سوك سەیری سەرۆك خێڵەكانی ئەكرد، ئەمەش بووە هۆی بێزار بوونی شێخی عەشیرەتەكانی ناوچەكانی فوراتی ناوەڕاست،چونكە ئەوان لەسەردەمی دەسەلآتداری عوسمانی خاوەن رێز و پلەو پایە بوون زەوی و زاری تایبەت بەخۆیان هەبوو، ناچار بوون راپەڕن بۆ ئازادی زەوی و زارەكانیان بە شێوەی سەردەمی عوسمانی كە راهاتبوون لەگەڵی .

٢ – زیاد كردنی باج بەسەر خەڵك،بەجۆرێك عەشیرەتەكانی بێزار كردبوو چونكە ئەو باجەی بەریتانیا وەری دەگرت سێ هەندەی دەوڵەتی عوسمانی زیاتر بوو كەسانێكیش هەبوون توانای پێدانی ئەم بڕە زۆرەیان نەبوو بیدەن بە حوكمرانەكانی بەریتانی سەرەڕای زیادكردنی باجی نوێ وەكو باجی ناشتنی مردوو،ئەمانە وای لە خەڵك كرد ناچار بوون پەنا بەرنە راپەرین دژی ئەم سیستەمە هەروەها خراپ دابەشكردنی ئاو لە دەروبەری ناوچەكانی فوراتی ناوەڕاست ببووە هۆی كەمبوونی داهاتی كشتوكاڵی و پێ شێل كردنی مافی خەڵك.

٣– ئەم شۆرشە دژی مانەوەی دەسەلآتداری بیانی بوو لە ولآت،دوای ئەوەی لە نیسانی ١٩٢٠ لە كۆنگرەی سان ریمۆ ئەوە بلآوكرایەوە دەبێت عێراق لە ژێر ئینتیدابی بەریتانی بمێنێتەوە.ئەمە جۆریك لە نارەزایی دروست كرد چونكە بەشێكی زۆری خەڵك بێزار بوون لە دەسەلآتی بەریتانیا دژی مانەوەی دەسەلآتی

داگیرکـەر بـوون دەیانویـست دەوڵـەتێکی یـەکگرتووی عـەرەبی پێـك بهێـنن لـە عێراق،بیرۆکەی ئینتیداب لەلایەن ژمارەیەکی زۆری خانەوەداکان وا تەماشا دەکرا کە سوکایەتی کردنە بە ئەزموونی ئیداری و سیاسی و رۆڵیان وەکو سەرکردە لـە کۆمەڵگاکانیاندا.

٤ – رۆڵــی پیــاوانی ئــاینی و مــەلاکان و وتاربێــژان و شــاعیران و نوســەران و مامۆستایان...هتد لەگەڵ هەموو ئەو روناکبیرانەی کاتی خۆی سوڵتانی عوسمانی لەخۆی نزیك کردبوونەوە.بەلأم دەسەلأتدارانی بەریتانی لەم کارەیان سەرکەوتوو نەبوون ئەمەش وایکرد بەشێکی زۆر لەم کەسایەتیانە بێ کار مابوونەوە.

٥ – هۆکاری ئاینی رۆلی مەلاکان و درێژە پێدان بە بزوتنـەوەی جیهـاد لـە کـاتی جەنگدا هاوکاری نێوان کۆمەڵگای سونی و شیعە لە بەغـدا هـەردوولا مزگـەوتیان کردە سەنگەرێك بۆ وتار خوێنـدەوە تێـدا دژی بەریتانیـەکان بـەکاریان هێنـا بـۆ ئەوەی خەڵك دژی کـافران و نەسرانیەکان جیهـاد بکـەن ولأت پـاك بکەنـەوە لـە کەسـانی موشـریك و بـێ بـاوەڕ.وتنــی سـروودی نیـشتمانی وایکـرد هەسـتی نەتەوایەتی بەهێزتر بکات لە نێو خەڵك،شۆرشگێران بە موجاهیدن ناوزەد کران.

٦ – مردنی سەید کازم یەزدی لـە نیـسانی ١٩١٩ کـە لەگـەڵ بزوتنـەوەی جیهـاد بوو،دژی تورکەکان بوو،یارمەتی بەریتانیەکانی ئەدا لەکاتی هاتنیان بۆ عێراق بە مردنی ئەم کەسایەتیە شیعەیە،میرزا تەقی شیرازی شـوێنی گرتـەوە لـە کەربـەلا نیشتەجێ بوو،خەڵکی هاندا دژی بەریتانیەکان تێبکۆشن.

٧ – جی بەجێ نەکردنی ئەو بەڵێنانەی کاتی خۆی بەریتانیا بە خـەڵکی عێراقـی دابوو سەبارەت بەسەربەخۆیی بە عەرەبەکان. بەریتانیەکان بۆ جێ بەجێ کردنی کارەکانیان گەلێك سیاسەتی توندو تیـژیان بـەکاردەهێنا بەرامبـەر بـە هاولأتیـان ئەمە وای دەکرد لە ناو عێراقیەکان هەستی دژایـەتی بـەریتانیا پـەرە بسەنێت ، ئەو رقەش رۆژ بە رۆژ لە زیاد بوون دابوو لەلایەن نیشتمان پەروەران لە بەغـدا ، چـونکە فـەرمان ڕەوایـانی بـەریتانی مامەلـەی خراپیـان بەرامبـەر خـەڵك دەکـرد

،ئەمەش بووە هۆی ئەوەی هەریەك لە پیاوانی ئاینی سونە و شیعە و شێخی عەشیرەتەکانی فوراتی ناوەراست یەك هەڵوێست بن ، بەرامبەر بەم سیاسەتە رق هەڵگرن کە مەبەسیان رزگاربون بو لە دەست بەریتانیەکان .

٨ – هاوکات لە ١٩١٩ چەندان کۆمەڵە دروست بوون بۆ ئەم مەبەستە کە داوای سەربەخۆیی ولاٌتیان دەکرد دەستیان کرد بە چالاکیەکانیان یەك لەو کۆمەڵە نهێنیانە بریتی بوو لە "پاسەوانی سەربەخۆیی" داوای دروستکردنی دەولەتێکیان دەکرد بەرسەرکردایەتی یەکێك لە کورەکانی شەریف حوسێن ، هەروەها کۆمەڵەی" عهد " کە ئەندامەکانی زۆربەی چین و توێژەکانی کۆمەڵگا بوون وە زۆربەی ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە لە ئەفسەرە عەرەبە سونەکان پێکهاتبوو .

**دووەم / هۆکاری دەرەکی:**

کاریگەری ئەم رووداوانەی کە لەناوچەکانی جیهان روویادا،وەکوشۆرشی گەورەی عەرەبی لە ١٩١٦ بە سەرکردایەتی شەریف حسێن و کورەکانی لە حیجاز دژی دەسەلاتی عوسمانی بە هاوکاری بەریتانیا،هەروەها بزوتنەوەی ناسۆنالیزمی رزگاریخوازی تورکی بە سەرۆکایەتی مستەفا کەمال لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٩١٩ بزوتنەوەیەکی دەست پێکرد لە پێناو سەربەخۆیی تورکیا،سەرهەڵدانی شۆرشی میسری ساڵی ١٩١٩ بەسەرکردایەتی سەعد زەغلول لە دژی دەسەلاتدارانی بەریتانیا کە رۆژانە رووداوەکانی میسر لە رێگای دەنگ و باس و رۆژنامە و گۆڤارەکان دەگەیشتە عێراق،شۆرشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ لە روسیا بەسەرکردایەتی لینین سەری هەڵدا.هەروەها لە سوریا حوکمەت دامەزرا بوو بەسەرۆکایەتی فەیسەڵی کوری شەریف حوسێن کە زۆربەی پۆستە بالاٌکان بە دەست عێراقیەکانەوە بوو،بەلاٌم ئەو عێراقیانە دەیانزانی مانەوەیان لە سوریا هیچ سودێکیان پێ ناگێنێ،چونکە سوریەکان دروشمی"سوریە بۆ

سوریەکانیان"بەرزکردبۆوە، ئەمانیش ناچار بوون بگەڕێننەوە بۆ عێراق و بیر لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی هاوشێوەی سوریا بکەن.

## سێ یەم / هۆکاری راستەوخۆ:

هۆکاری راستەخۆی شۆرشەکەش بریتی بوو لە دەستگیرکردنی یەك لە سەرۆك عەشیرەتەکانی "رومێتە" بەناوی "شێخ شەعلان ئەبولجون" ، کاتێك رازی نەبوو باج بدات وە ئەو قەرزە کشتوکاڵیە کۆنەی لەسەر بوو ، سەرەئەنجام زیندانی کرا لەلایەن بەریتانیەکانەوە بە بیانوی باج نەدان دواتریش بەیارمەتی کورە مامی بەناوی " غەسیس ئەلحەرجان" شێخ شەعلان لە بەندیخانە رادەکات هەر ئەمە بووە هۆی ئەوەی سەرۆك هۆزەکانی تر بەرامبەر بەم کارە نارەزایی دەربڕن و راپەڕن دژی ئەم سوکایەتی پێکردنە ، دواتریش کەسانی تریش هاتنە ریزیانەوە ئەوە بوو زەنگی شۆرش لێیدا لە حوزەیرانی ١٩٢٠ دەستی پێکرد بە زنجیرەیەك رووداوو سەری هەڵدا بەجۆرێك بارودۆخی سیاسی و ئابوری و کۆمەلآیەتی ولاتیان هەژاندا و ولآت کەوتە ناسەقامگیریەوە ئەم رووداوەش لە نێو نووسەران و شارەزایەنی عێراقی ناسراوە بە شۆرشی ١٩٢٠.

لەسەرەتای ئایاری ١٩٢٠ ژمارەیەك لە خەڵك کۆبونەوەیەکی بەکۆمەڵیان سازدا لە بەغدا بۆ ئیدانەکردنی دەسەلآتدارانی بەریتانی و ژمارەیەکی زۆریش لە مزگەوتەکانی سونی و شیعە کۆبونەوە لەم کۆبونەوەی ئایاردا ١٥ نوێنەر دەست نیشانکرا بۆ خستنە رووی پرسی سەربەخۆیی عێراق لەبەردەم دەسەلآتداران ، رێگەی ئاشتیانە بگرنە بەر ئەگەر هاتو هیچ ئەنجامێکیان دەست نەکەت پەنا بەرنە شێوازی توندو تیژی،بەریتانیەکان هەستیان دەکرد ئەم رووداوانە کێشەکە قوڵتر دەکەن بەتایبەتی رۆڵی پیاوانی ئاینی لە مزگەوتەکان و سەرۆك هۆزەکان و پیاو ماقولآن ، بەشداری ئەمانەیان بە مەترسی دەزانی بەرامبەر دەسەلآتەکەیان لە عێراق . سەرەتا ویسترا کێشەکان بە گفتوگۆ چارەسەر بکرێت دیار بوو

کۆبونەوەیەك کرا لە نێوان مەندوبی بەریتانی "ئارنۆڵد ویڵسۆن"و نوێنەرانی خەڵك ، بەڵام هیچ ئەنجامێکی نەبوو ، چونکە حکومەتی لەندەن سوور بوو لە فراوانکردنی سیاسەتی بەڕێوەبردنی وڵات لە لایەن خۆیانەوە. لە عێراقیش تا دەهات کۆمەڵەکان چالاکیەکانیان زیاتر دەبوو بە تایبەتی کۆمەڵەی پاسەوانی سەربەخۆیی گەیشتە ئەو رادەیەی نازناوی" نوسینگەی شۆرشی"لیێ بنرێ، هەروەها رێککەوتن دروست بوو لە نێوان بزوتنەوەی نیشتمانی و شارەکان و چەندین سەرۆك خێلی فوراتی ناوەڕاست کە تیایدا پیاوانی ئاینی بەشدار بوون لەگەڵ هەموو چین توێژەکانەوە بە لادێی و شاری و عەرەب و کورد و سونەو شیعە و فەرمانبەران کە دروشمی بژی نیشتمانیان بەرزکردبۆوە هەروەها بڵاوکردنەوە هەستی"جهاد" بەنێو خەڵکدا تاوەکو دژی•بەریتانیای نەصرانی و کافر بوەستن،لەم ماوانەش گەلێ رووداو روویاندا کە زیاتر هەستی خەڵك ورژێنرا،.هەروەها بێ کار مانەوەی ئەو ئەفسەر و فەرمانبەرانەی کە لە دەوڵەتی عوسمانی کاریان دەکرد هاتنە پاڵ بزاڤی نیشتمانی جگە لە مانەش بەریتانیا ئەو بەڵێنانەی کە بە گەلی عێراقی دابوو جێ بەجێی نە دەکرد ئەم هۆکارانە هەمووی یارمەتیدەر بوو بۆ ئەو رق و کینەیەی کە خەڵکی داماو لە دڵیان گیری خواردبوو بۆیە لەچاوەڕانی شۆرشێکی گەورە دابوون تا بەجارێك دەسەڵاتدارانی بەریتانیا رامالێ و ببنە خاوەن دەوڵەتی خۆیان وەك باقی میللەتانی تری ژێر دەوڵەتی عوسمانی .

دواتریش عەشیرەتەکانی فوراتی ناوەڕاست کەوتنە جوڵە تاوەکو ناوچەکانی باکور و خۆرهەلاتی بەغداشی گرتەوە . بۆماوەی سێ مانگ شۆرش بەردەوامبوو کاری کردە سەر خەڵکی لادێیەکان و وای کرد خەڵك بەجارێك راپەڕن ئەمەش لە توانای سوپای بەریتانیا دانەبوو بەئاسانی دایمرکێنێتەوە ، چونکە لە کۆنترۆڵی دەسەلاتیان دەرچوو بوو هەروەها عەشایرەکان چەکێکی زۆریان لابوو لە ئەنجامی جەنگی یەکەمی جیهانی بۆیان مابۆوە،لەگەڵ پارەیەکی زۆر،سەرباری

ئەوەش شارەزاییان هەبوو لە شەڕکردن و ناوچەکان دەیانتوانی بە ئاسانی خۆیان بشارنەوە چالاکیەکانی شۆڕشگێران لە دەرەوەی بەغدا پتەوتر بوو وەك ئەوەی لە ناو بەغدا بێت ئەویش بەهۆی گەورەیی هێزەکانی بەریتانیا و چالاکیەکانی هەوالگری بۆیە هەڵسان بەهێنانی هێز لە دەرەوەی وڵات و شاری کوفەیان بۆمبا باران کرد و پەلاماری نەجەف و کەربەلایان دا ، وە هەندێ جموجۆڵیش لە ناوچەکانی کەرکوك و کفری و کەربەلا و خانەقین هەبوو لە لایەن سەرکردەی عەشیرەتەکان بۆ دەربڕینی نارەزایی بەڵام ناوچەکانی تری وەك سلێمانی و هەولێر و دهۆك و موصل بە ئارامی مانەوە . شەڕی چەکداری سێ مانگی خایاند لە نێوان بەریتانیا و سەرکردە عەشایریە عەرەبەکان رووداوەکانی شۆڕش پڕ بوون لە توندو تیژی خوێناوی و زەبر و زەنگ کە بووە هۆی کوژرانی ٦هەزار عێراقی و نزیکەی ٥٠٠سەربازی بەریتانی و هیندی ، (بەریتانیەکان ژمارەی کوژراوان لە ریزی شۆڕشگێران بە"٨٤٥٠"کەس دەخەملێنن) بەشدار بوانی شۆڕش هەموویان خاوەن یەك بیر و ئامانج نەبوون راستە داواکاری گشتیان بۆ سەربەخۆبوونی وڵاتی عێراق بوو بەڵام لە هەندێ کاتدا بەرژەوەندیە تایبەتیەکان پێش بەرژەوەندیە گشتیەکان ئەکەون یەکێك لە نوسەرەکانی ئەو سەردەمە عەلی بازرگان کە خاوەنی زەوی و زارێکی زۆر بوو لە هەمان کاتدا ئەندامی رێکخراوی پاسەوانانی سەربەخۆیی بوو،چوار رەهەند دەخاتە روو کە بیرو رای جاواز هەبوو لە نێو شۆڕش بۆ وەك:

١ ـ رەهەندی هەستی ئاینی : خۆی لەوەدا ئە بینیەوە کەوا راستە شیعە و سوننە یەکیان گرتبوو بەڵام لەهەمان کاتدا شیعەکان سۆزێکی بەرچاویان دەر ئەبڕی بۆ ئێران.

٢ ـ هەنێك لە شۆڕشگێران دەیانویست سیستەمێکی سیاسی کۆماری بۆ عێراق بێنێتە کایەوە،

٣ ـ بەشێکی دیکەیان لەگەڵ بەریتانیا بوون بەتایبەتی لە شاری بەسرە زۆربەی زۆری کەسایەتیەکانی ئەم شارە لەگەڵ بارودۆخەکە خۆیان گونجاند ئەوانیش بازرگانەکان بون پەیوەندیان هەبوو لەگەڵ بەریتانیا بۆیە ئەمانە ئەم هەستەیان لا دروست نەبوو کە بەریتانیا داگیر کەرە ئەوەی بەلایانە گرینگە بەرژەوەندیەکانیان بمینێ.

٤ ـ بەشێکی دیکەیان کەوتوبونە ژێر کاریگەری هەستی ناسیۆنالیزمی عەرەبی دەیانویست دەوڵەتێکی نەتەوەی بۆ عێراق دابمەزرێنێ لە ژێر سەرکردایەتی پاشایەکی عەرەبی وەك فەیسەلی یەکەمیان دەویست.

## هۆکارەکانی رووخانی شۆرش :

١ ـ ئەوەی لە شۆرشەکە ئەیبین شۆرشێکی بێ سەرکردە بوو سەرەڕای ئەوەش سەرۆك هۆزەکان لە ململانێ دابوون بۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندیەکانیان لە یەککتریان قبوڵ نەدەکرد.

٢ ـ نەبوونی سەرچاوەیەکی دارایی،چونکە ئەو پارەو پولەی لەلای سەرۆك هۆزەکان بوو رۆژ لە دوای رۆژ کەم دەبۆوە ئەویش بۆ تێچوونی پارەی جەنگ بوو.

٣ ـ نابەرامبەری چەك و ئامێرەکانی شەری هەر دوولا چونکە شۆرشگێران چەك و تەقەمەنیان تەواو بوو،بەهێز بوونی سوپای بەریتانیا.

٤ ـ هەبوونی کاری سیخوری لە نێو بەرەی شۆرشگێران کە زانیاریان ئەدا بە سوپای بەریتانی ئەمە وای کرد ورەی شۆرشگێران دابەزێت لە هەر پیلانێکی سەربازی کە دایان ئەنا.

٥ ـ گۆرینی هەڵوێستی هەندێك لە سەرۆك هۆزەکان کە بە ویستی خۆیان نەهاتبونە نێو شۆرش،بۆیە هەر کاتێك زانیان شۆرش بەرە و لاوازی و رووخان دەچێت هەڵویستیان گۆری و هاتنە دەرەوە لە نێو شۆرشگێران.

## ئەنجامەکانی شۆڕشی ١٩٢٠ :

دەتوانین بلێین : شۆڕشی ١٩٢٠ بیروبۆچون و ئامانجی جۆرا و جۆری لە دەور کۆببۆوە سەرۆك عەشیرەتەکان زیاتر لە خەمی وەرگرتنەوەی زەوی و زارەکانیان بوون هەروەها کۆمەڵێکی تر لە هەوڵی پێکهێنانی حکومەتێکی کۆماری دابوون دوور لە هەستی نەتەوەیی هەندێکی تریش هەستی نیشتمان پەروەری بەهێزیان هەبوو هەوڵیان ئەدا بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی مەلەکی عەرەبی ئەمە وای کرد بە دەست هێنانی ئامانجەکان شۆڕش کارێکی سەخت بێت بێت چونکە خەڵکی عێراق راستە بیزار ببون لە دەسەڵاتدارانی بەریتانیا ، بەڵام لەنێو هەندێك خەڵك دا پشتگیریان لە سیاسەتی بەریتانیا دەکرد ئەمە وای کرد لێك ترازان دورست بێت لە نێو بەرەکانی شۆڕش وای لێهات هەر کەسێك بۆ بە دەست هێنانی ئامانجە تایبەتیەکان خۆی هەوڵبدات هەر بۆیەش ئەم دیاردانە رێگە خۆشکەر بوون لەبەردەم بەریتانیا تاوەکو بتوانێ بە لێزانی شکست بە شۆڕشەکە بێنێت لە فوراتی ناوەراست کۆتایی پێهات ، هەروەها شۆڕشگێران قوربانی زۆریان دا کە هۆکار گەلێك دروست بوو وای کرد ببێتە هۆی لەناوچوونی شۆڕش.

لە راستیدا ئەم شۆڕشە گەلێ دەرئەنجامی گرینگی هەبوو سەبارەت بە عێراقیەکان، چونکە شۆڕش بووە بەشێك لە ئەفسانەی دامەزراندنی نەتەوەی عێراقی ، وە بەریتانیای ناچار کرد بۆ گۆڕانکاری کردنی سیاسەتی خۆی تا نەرمی بنوێنێ بەرامبەر خەڵك،سیاسەتی سەربازی خۆی سوکتر کرد لە ئەنجامدا "ئارنۆلد ویڵسونی" گۆڕی یەکێکی تری لە شوێنی دانا ، هەروەها ئەم شۆڕشە نیشتمانیە بووە هۆی دامەزراندنی یەکەم حکومەتی عێراقی لە ژێر سیستەمی مەلەکیەت بەفەرمانرەوایی مەلیك فەیصەڵی کوڕی مەلیك حوسێن جگە لەوەش سیاسەتی بەریتانیە لە داگیرکاریەوە "احتلال" بگۆردرێت بۆ قۆناغی:سەرپەرشتیار "الانتداب"هەروەها بەریتاینا خۆی بوە خاوەنی عێراق ئیتر وڵاتانی تر هیچ مافێکیان بەسەر عێراقەوە نەما،دەتوانین بلێین ئەم شۆڕشە

زۆرێك لە کێشە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئاینی و ...هتد چارەسەر نەکرد و وەك خۆی مایەوە.بەڵام ئەمە وای کرد گەلی کوردیش داوای مافی خۆی بکات بۆ پیکهێنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆ وەك میللەتانی تری ناوچەکە، چونکە بەشێك بوو لە بەشداربوەکانی شۆرش.

## لیستی سەرچاوەکان :


١ ـ سەرچاوە کوردییەکان:

١. ئەحمەد حەمەد ئەمین : چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی نویێ و هاوچەرخی عێراق،هەولێر،چاپی یەکەم،٢٠١٠.

٢. ئەلبێرت عیسا : ناسیۆنالیزمی لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە بۆ عێراقی سەردەمی فاشیزم،سلێمانی،چاپی یەکەم،٢٠٠٨.

٣. باقر یاسین : مێژووی خوێناوی عێراق(ڕووداوەکان–هۆکارەکان–چارەسەرەکان)، سلێمانی،چاپی یەکەم،٢٠٠٤.

٤. تشارلز تریب : چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی عێراق،و:مەحەمەد حوسێن و عەبدولقادر کەلهور،هەولێر،چاپی یەکەم،٢٠١٠.

٥. سێر ئارنۆڵد ویڵسن:شۆرشەکەی عێراق لەماوەی داگیرکاری بەریتانیا بۆ عێراق،و: سەرمەد ئەحمەد،هەولێر،چاپی یەکەم،٢٠١٢.

٦. عەلی کەنەدی : فەرهەنگی ڕووداوەکانی کوردستان و وڵاتانی جیهان،هەولێر،چاپی یەکەم،٢٠٠٥.

٧. فیبی مار : مێژووی نوێی عێراق،و:حەمە شەریف حەمە غەریب و شێرکۆ ئەحمەد حەوێز،هەولێر،چاپی یەکەم،٢٠١١.

٨. کریس کۆچێرا : کورد لە سەدەی نۆزدە و بیستدا،و:حەمە کەریم عارف،سلێمانی،چاپی دووەم،٢٠٠٤.

٢– سەرچاوە عەرەبییەکان:–

١. ابراهیم خلیل و جعفر عباس : تاریخ العراق المعاصر،دار الکتب و النشر،الموصل،١٩٨٩.

٢. عبدالرحمن منیف : العراق هوامش من التاریخ المقاومة،ط١،بیروت،٢٠٠٣.

٣. عبدالعزیز نوار:تاریخ العرب المعاصر مصر و العراق،دار النهضة العربیة،القاهرة.

٤. محمد عبدالرحمن بروج:دراسة في التاریخ العربي الحدیث و المعاصر،مکتبة الانجلو المصریة،١٩٧٤.

# ناوی کوردو کوردستان لە کتێبی گەڕیدەو گەشتەوەری ناودار ئیتاڵی ( پیێترۆ دیلاڤالیٚ )

ناوی کتێب: سفرنامە دلاواله، نوسەر: پیترۆ دلاواله، وەرگێڕانی بۆ فارسی: شجاع الدین شفا.

دلۆزار صالح

## پێشەکی
## کوردناسی لای ئیتاڵییەکان

بە شێوەیەکی گشتی زۆربەی مێژوونوسان رایان وایە کەوا سەرەتای دەرکەوتنی کوردناسی لای ڕۆژئاواییەکان دەگەڕێتەوە بۆ دوای جەنگی خاچ دروشمەکانەوە(الحروب الصليبية)، ڕۆژئاواییەکان هەوڵیاندا بۆ ئەوەی زیاتر شارەزایی لە بارەی داب و نەریت و ئایین و لایەنی کۆمەڵایەتی ڕۆژهەڵات شارەزابن، دەستیانکرد بە گەشتکردن بە ناو جیهانی ئیسلام واتە جیهانی ڕۆژهەلات، کە لە چەندین نەتەوەو کەلتورو ئایین و مەزهەب و زمانی جیا پێکهاتبو، لە نێوانیاندا کوردیش بە بەشێکی دانەبڕاو و هاوبەشی کلتوری ڕۆژهەڵاتی پێکدەهێنا.

بۆ ئەم مەبەستە دەبینین ژمارەیەکی زۆر لە گەڕیدەو ڕۆژهەڵاتناسە ڕۆژئاواییەکان، لەژێر ناوی جیاجیاو بۆ مەبەستی جیاجیا(ئایینی، سیاسی، ئابوری، زانستی...) لە پێناو بەرژەوەندی وڵاتەکانیانەوە ڕوویان لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵات دەکرد، پیایدا تێدەپەڕین و یاخود هەندێك جاریش دەمانەوە.

دەکرێت بڵێین سەرەتای ناسینی کوردو کوردناسی لای ئیتاڵییەکان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٢٠٠ز کە تا ١٨٠٠ز) بەردەوام بوو، مارکۆپۆلۆ بە یەکەم

گەڕیدەو جوگرافیناسی ئیتالی دادەنرێت، لە سەدەی (٧ك/١٣ز) واتە لە سالی (١٢٧٠تا ١٢٩٠) گەشتێکی دوورودرێژی بە ناوچەکانی ڕۆژهەلات ئەنجامداوە کە نزیکەی چارەکە سەدەیەکی خایاندووە، لە نێوانیشیان دا سەردانی ولاتی کوردان کوردستانی کردووەو باسی لە چەندین لایەنی کۆمەلگای ئەو کاتی کوردەواری کردووە لە شێوازی هەلسوکەوت و داب و نەریتی کۆمەلایەتیان و هۆزەکانی کوردی کردووە، کە نوسینەکانی جێگەی بایەخ پێدانە.

## ژیانی پیترۆدێلاڤالێی (١٥٦٨-١٦٥٢):

هەرچەندە لەسەر ژیانی مندالی دێلاڤالێ زانیارییەکی ئەوتۆ لەبەردەستدا نییە، بەلام ئەوە زانراوە کە لە سالی ١٥٨٦ز، لە بنەمالەیەکی دەولەمەندی شاری ڕۆما لە دایکبووە، وا دیارە هەروەك مندالە خانەدانەکانی تر وا باوبووە خەریکی خوێندنی ئایینی و مۆسیقاو نەقاشی و سوارچاکی بووە، لە سالی ١٦١٤ز گەشتێك بۆ ڕۆژهەلات ئەنجام دەدات کە ١٢سالّ دەخایەنێت تیایدا سەردانی زۆربەی ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی سەر بە هەردوو دەولەتی عوسمانی و سەفەوی سەردانی هیندستانیشی کردووە. دیارە شارەزاییشی لە زمانەکانی (تورکی و فارس و عربی و کەمێکیش قبتی و کلدانی پەیداکردووە). لە ڕاستیدا دیلاڤالێ، یاداشت و بەسەرهاتی گەشتەکەی لە شێوەی(نامە) بۆ دۆستێکی نزیکی خۆی نوسیوە لە ڕۆما بە ناوی (ماریۆ ئیسکیپانۆ) کە خۆی لە (١٨) نامە دەدات دوویان پەیوەندی بە ئێران هەیە بەشێکی لە سەردەمی ژیانی بلاوکرایەوە دوو بەشەکەی تریشی لە پاش مردنی...

لە سالی ١٦١٤ز ڕوودەکاتە ئەستەمبۆلّ و ماوەیەکیش لەوێ دەمێنێتەوەو فێری زمانی تورکیش بووە، دواتریش ڕوودەکاتە ولاتی شام و حلب و ئینجا میصرو دواتریش شاری بەغدا، لەوێوە لەگەلّ ئافرەتێکی بە ڕەگەز ئەرمەنی ژیانی هاوسەری پێکدێنێ بە ناوی (معانی) کە بە ئەسلّ خەلکی شاری ماردینە لە

تەمەنی منداڵی لە ئەنجامی هێرشی کوردەکان بۆ سەریان ناوچەی خۆیان جێهێشتووەو ڕوویان کردۆتە بەغدا.

دێلافالێ لە ساڵی ١٦١٧ز بڕیاردەدات گەشتەك ئەنجام بدات لەگەڵ هاوسەرەکەی کە تیایدا بە ناو خاکی کوردانیش داڕۆیشتون، بەڵام بەهۆی نەخۆشی معانی لە ساڵی ١٦٢٢ز، دەمرێت بۆیە دێلافالێ لەبەر خۆشەویستی هاوسەرەکەی لەگۆڕ نایننێژێت بۆ ماوەی (٥)ساڵ لەگەڵ خۆیدا گەشتی پێدەکات تاکو لە ساڵی (١٦٥٦) دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆما لە گۆڕستانی بنەماڵەکەیان دەینێژێت.

دەکرێت بڵێین گرنگی ئەم گەشتە لەوەدایە، کە تاکە گەشتەوەرو گەڕیدەی ڕۆژئاواییە کە سەردانی کوردستان و وڵاتی ئێرانی کردووە هاوچەرخ بووە لەگەڵ سەردەمی شا عەباسی گەورە، بۆیە لێرەدا باسکردن و لێکۆڵینەوە لە مێژووی کوردستان و ئێرانیش لە سەردەمی شا عەباسی دا بێ گەڕانەوە بۆ ئەم کتێبە ئامانجی زانستی خۆی ناپێکێت.

## گەشتی دێلاڤالێ بۆ وڵاتی ئێران و تێپەڕبوونی بەناو خاکی کوردستاندا :

دێلاڤالێ دوای ئەوەی ماوەیەك لە شاری(بەغدا) دەمێنێتەوەو خۆی وەك بازرگانێك ناساندووە لە ساڵی (١٦١٧ز)، لەگەڵ هاوسەرەکەی بڕیار دەدات گەشتێك بۆ وڵاتی ئێران ئەنجام بدات کە گەشتەکەی هاوسەردەمی (شا عەباسی گەورە ١٥٨٨-١٦٢٩ز)یە، وەك خۆی ئاماژەی پێکردووە ئەو گەشتەی بەدوو مەبەست ئەنجام داوە، یەکەم: بۆ بەشداریکردن لەشەڕێك دژی عوسمانیەکان لەگەڵ سەفەوییەکان، بۆ تۆڵەسەندنەوە لە عوسمانیەکان بەهۆی ئەو کوشتارانەی لە مەسیحیەکانیان کردووە، دووەمیش: بۆ هاندانی ئەو مەسیحیانەی کە لەدەوڵەتی عوسمانی نیشتەجێ بون تاکو کۆچ بکەن و لە دەوڵەتی سەفەوی نیشتەجێ بن.

دێلاڤالێ دەڵێ دوای ئەوەی بە نهێنی شاری بەغدامان جێهێشت ڕۆژێك دواتر گەیشتینە سەر ڕووبارێك بە ناوی (جیالە) دەڵێ گومانم هەیە ئەو ڕووبارە لە کۆندا ناوی دیالە بوبێ کە پێم وایە دیالە هەمان ڕووباری (گیندس)بێت کە (هیرۆدۆت) باسیکردووە لە کاتی هێرشی (کۆرشی گەورە) بۆ سەر بابل ئەسپەکەی تیایدا خنکاوە، وە لە ڕۆژی ٦م گەیشتینە گوندێك بە ناوی (تەکیە) بەڵام لەبەر گەورەیی پێیان دەگووت شار وە پێشیان دەگوت(شهروان–شارەبان).

وە لەڕۆژی ٧م گەیشتینە شوێنێك بە ناوی (قزل ربات)، کە سەرکردەی کورد بو ناوی(أحمدبگ) بوو سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بووەو بە شێوەی پشتاوپشت فەرمانڕەوایی ئەو ناوچەیەی پێداوە...

لێرەدا باسکردنی لە کوردستانی دەست پێدەکات:

## ناوی کوردستان لای دیلاڤالێ:

دەڵێت کوردستان واتە سەرزەمینی کوردەکان ئەو شوێنەش دەکەوێتە نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و سەفەوی، دیلاڤالێ تاکە گەڕیدەی ئەوروپاییە کە بە شێوەیەکی ورد باسی لە سنوری کوردستان کردووەو دەست نیشانی کردووە، کە دەڵێت:

سنوری کوردستان لە ڕووی جوگرافیەوە ئەگەر بێتوو سەیری بکەین لە ڕۆژهەڵات بۆ ڕۆژئاوا ماوەکەی (١٠تا ١٢) ڕۆژ دەبێت وە لە هەندێ شوێن کەمترو لە هەندێ شوێن زیاتر، بەڵام سنورەکەی لە باکور بۆ باشور یەکجار درێژە، کە لە سنوری (بابل و شۆش تا کەنداوی فارس، لەوێشەوە بۆ باکوری موسڵ تا ئەرمەنستان و ئازربایجان و نزیك دەریای ڕەش درێژبۆتەوە).

کوردسان ناوچەیەکی شاخاوی سەختە لە کۆمەڵێك زنجیرە چیای سروشتی پێکهاتوەو بۆتە سنورێکی سروشتی لە نێوان (هەردوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و سەفەوی)، وە لە کۆنیشدا لە نێوان (پارس و ڕۆمەکان).

هەرچەندە نازانم ئەو ناوچەیە لە کۆندا چ ناوێکی هەبووە بەڵام گومانم هەیە وەکو ئێستا ناوێکی یەکگرتووی هەبووبێت، بەهۆی زۆری و جۆراوجۆری ئەو نەتەوانەی کە لە ناویدا ژیاون، بۆ نمونە ئەو بەشەی باکوری هەروەك لە کتابی گزنفۆن ئاماژەی پێکردووە بە کاردۆخ یا کاردۆك ناویان هاتووە.

## باسکردنی لە زمانی کوردی:

دیلاڤالیێ پێی وابوو، لە رووی زمانەوە کوردەکان زمانێکی تایبەت بە خۆیان هەیە کە بەتەواوی لە زمانی هاوسێکانیان کە عەرەب و تورك و فارسن جیاوازە، زیاتر لە زمانی(پەهلی-فارسی دەشتەکی یان پێش ئیسلام نزیکە). تەنانەت لە شوێنێکی کتابەکەیدا کاتێك کە باس لە زمانی فارسی دەکات دەڵێت زمانی فارسی وەکو معجونێکی تێکەڵ وایە ئەگەر بیکەیتە دوو بەش نیوەی لەزمانی کوردی پێکهاتوەو نیوەکەی تریشی لە عربی و مغۆلی و تورکی ...پێکهاتووە.

## لە رووی ژیانیانەوە:

دەڵێ بەشی هەرەزۆری کوردەکان کۆچەرن و خەریکی بەخێوکردنی مەڕو ماڵاتن و بەردەوام لە ناوچەیەکەوە کۆچ دەکەن بۆ ناوچەیەکی تر بە دوای لەوەڕگادا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەشێکیان لە شارەکان نیشتەجێن بە شێوەیەکی دائیمی.

## ئایینی کوردەکان:

زۆربەی کوردەکان موسڵمانن، وە بە گوێرەی هەڵکەوتەی جوگرافی و سیاسیانەوە واتە ئەوانەی لەژێر دەستی سەفەویەکانن لەسەر مەزەبی شیعەن ئەوانەش لەژێر دەستی عوسمانییەکانن لەسەر مەزەبی سوننەن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی زۆر لە مەسیحی و ئەرمەنی و کلدان لەگەڵ کوردەکان بە

شێوەیەکی ئاشتیـ ـەژین، بەتایبەت لە ناوچەی جزیرە، کە هەندێك لە سەردارە کوردەکان بەشێکی زۆری سوپاکەیان مەسیحین.

## ئافرەتی کورد لای دیلاڤالیێ:

دیلاڤالیێ دەڵێ ئەوی تێبینیم کرد ئەوەبوو ئافرەتی کورد بە پێچەوانەی ئافرەتانی موسڵمانی ناوچەکانی تر ڕوویان داپۆشراو نیەو بە ئازادی لەگەڵ خەڵکی خۆیی و بیانی هەڵسوکەوت دەکەن کەچی هی نەتەوەکانی تر ئاوا بە ئازادانە گفتوگۆ لەگەڵ پیاوی بێگانە ناکەن.

## میوانداری لای کورد:

دیلاڤالیێ سەبارەت بە میوانداری لای کوردەکان ئاماژە بەوە دەکات کە کورد میللەتێکی ڕوخۆش و گەرمو گوڕو میوان نەوازن (میوان دۆستن).

هەروەك خۆی دەگێڕیتەوە دەڵێ لە کاتی گەشتەکەماندا بە ناو وڵاتی کوردان گەیشتینە ناوچەیەك لە نزیك کرماشان، بەناوی(کەرەند) وە بۆ ئەوەی شەومان بەسەردانێت بڕیارماندا بۆ شەو خێمە لەو شوێنە هەڵبدەین، وا دیارە لەو کاتەشدا وەرزی زستان بووەو بەفرێکی زۆریش باریوە، هەربۆیە دەڵێ کاتێك خەڵکی ناوچەکە کە کوردن زانیان ئێمە لە نزیك دێیەکەیاندا هەڵمانداوە بۆیە هاوسەری سەرداری ناوچەکە کە کورد بوو پیاوەکانی نارد بۆ لامان و داوای لێکردین شەو میوانی ئەوان بین و لای ئەوان بمێنینەوە، ئەو ئافرەتەش ناوی (سوڵتان خانم)بوو وە هاوسەرەکەی چوبوو بۆ خزمەت شای سەفەوی، وە زۆر بە گەرمی پێشوازیان لێکردین وە دەڵێت سوڵتان خانم بەهۆی ئەوەی کە زمانی تورکی نەدەزانی ئەو بە زمانی کوردی بەخێرهاتنی ئێمەی دەکرد لە لایەن براکەیەوە بۆمانی وەردەگێڕایە سەر زمانی تورکی. وە دەڵێ دوای ئەوەی شەومان لەوێ بەسەربرد بڕیارماندا بەیانیەکەی درێژە بە گەشتەکەمان بدەین هەرچەندە سوڵتان خانم زۆر داوای لێکردین کە چەند ڕۆژێکی تر لایان بمێنینەوە، بەڵام ئێمە

سوربوین لەسەر ڕۆیشتن، کە خانم سوڵتان چەند دیاریەکی تایبەت بە ئافرەتان بو بە دیاریدا بە خاتوو مەعانی، وەك نەریتە لای ئێرانییەکان بە گشتی و کوردیش بەتایبەتی لە کاتی پێدانی دیاری دەبوو تۆش دیاریت پێدابایەوە، وە دەڵێ بۆیە من هەندێ جلی ئەورووپیم وەك دیاریدا پێی.

## داب و نەریتی کوردەکان:

سەبارەت بە داب و نەریتی کوردان دیلاڤالێ باسی زۆر لایەنی شارستانی و داب و نەریتی کوردی کردووە، باسی جلوبەرگی کوردی کردوە کە دەڵێ جلی کوردی شتێکە لە نێوان جلوبەرگی ئێرانی و عوسمانی بەڵام شێوازێکی تایبەت بە خۆیان هەیەو زیاتر جلی کوردی زبرە(دڕە). هەروەها باسی لە خۆراك و تەنانەت باسی نانی کوردی کردووە کە دەڵێ بە پێچەوانەی ناوچەکانی تر نانی کوردی خڕو تەنکە.

هەروەها باسی لەوە کردووە کە دەڵێ ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام لە ناوچەکانی ئێران و بەگشتی و لە کوردستان بەتایبەتی شتێك هەیە کە خۆیانی پێ گەرم دەکەنەوە پێی دەڵێن(تەنور) وە تەنور شتێکە قولیەکەی بستێك دووبست دەبێت لە ناوەڕاستی ژوری دانیشتن لێدراوە بۆ خۆ گەرمکردنەوە بەکاردێنن کە لای ئێمە لە ڕۆما نیەو زۆر جیاوازە لەو سۆبایەی ئێمە لە ڕۆما خۆمانی پێ گەرم دەکەینەوە، ئینجا مێزێکیان لەسەر داناوە کە ناوی تەنورەکە پڕە لە خەڵوز(ڕەژوو) ئینجا لێفەیەکی بەسەر دا دەدەن کەسەکان لە دەوری تەنورەکە نیوەی لەشیان بە لیفەکە دادەپۆشن. ئەگەر بگەڕێمەوە بۆ ڕۆما شتەکی ئاوا دروست دەکەن.

## دەسەڵاتی میرە کوردەکان:

دیلاڤالێ کاتێ باسی میرە کوردەکان دەکات دەڵێ زۆربەی میرە کوردەکان بەشێوەیەکی نیمچە سەربەخۆ فەرمانڕەوایی ناوچەکانی خۆیان دەکرد کە

هەندێك لەو میرانە سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بوون وە هەندێکیشیان سەر بە دەوڵەتی سەفەوی بوون بە پێی هەڵکەوتەی شوێنی جوگرافیان و بەرژەوەندیشیانەوە، شێوازی دەسەلاتیشیان پشتاو پشتە واتە لە باوك بۆ كورو نەوەکانی...

وە هەندێك لە میرە کوردەکان ئاوا بەهێزبوون کە توانای ئامادەکردنی (١٠ تا ١٢)هەزار سەربازیان هەبوو، بەتایبەتیش میری بدلیس کە لە لای سولتانی عوسمانی ڕێزێکی زۆری هەبوو ئەگەر داوای بکردبایە لە سولتان هەر وەزیرێك لەسەر کار لادات ئەوە داواکەی لە لایەن سولتان ڕەت نەدەکرایەوە بەهۆی ئەو ڕێزە زۆرەی لای سولتانی عوسمانی هەیبوو. کە بە تەواوی سەربەخۆبوو تەنها بە ناو سەر بەدەوڵەتی عوسمانی بو.

وە هەندێ میری تری کوردی هەبوون کە لاوازبوون توانای ئامادەکردنی ٢ تا ٣ هەزار سەربازیان هەبوو.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی دیلافالێ لە کاتی گەشتەکەی بە کوردستاندا ناوی زۆر گوندو شارو ناوچەی کوردستانی هێناوەو باسی کردوە، وەك: مەندەلی و قەسری شیرین و کەنگاوەر و سەحنەکە دانیشتوانەکەی کوردن دەینەوەرو جزیرەو بدلیس و ...

# نادر شای ئەفشار

( ١٦٨٨-١٧٤٧ ) زاینی (١٠٦٦-١١٢٦) شەمسی (١١٠٠-١١٦٠) ی قەمەری

**ئامادە کردنی: قارەمان مستەفا**

نادر قولی ئەفشار ناسراو بە نادرشاە سەرۆکی هۆزی ئەفشار بووە پاشای ئێران و دانەری (دودمانی ئەفشاری ) یە ئەو لە دوازدە ساڵی لە (١١١٤ تا ١١٢٦) حوکمرانی کردووە لە ئێران.

پایتەختی شاری مەشهد بووە, ئەو لە ناسراوترین پاشایانی ئێران بووە لە دوای ئیسلام و لە مێژوو بە ئەسکەندەری دووەم و بە ناپلیۆنی ئێران ناسراوە.

پێش پاشایەتی:

نادر قولی لە نزیکەی ساڵی (١٠٦٦) هەتاوی (١٦٨٨) ی زاینی (١١٠٠) ی قەمەری (٢٨) ی موحەرەم لە هۆزی ئەفشار لە ولایەتی کرمانج لە دەرگزی باکوری خوراسان لە دایك بووە, ئەو هۆزە دەبێتە دوو بەشی گەورە, یەکێکیان قاسملو و ئەوی تریان ئارخلو یان قرخلو, نادرشا لە هۆزی ئارخلو بوو, عەشیرەتی قرخلو شاسماعیلی لە ئازبایجان هێنایە خوراسان و لە باکور و لە ناوچەی ئەبیویرد و لە کەندی (گز) و (باخرز) تا مەرزی (مروە) جێ نشین کرد, تاکو ببنە بەربەستێك بەرامبەر ئۆزبەکەکان و تورکمانەکان, زۆر لەو هۆزانە لە سەردەمی شاە عەباسی یەکەم لە هۆزی شاهسۆن بوون. باوکی نادرشاە (ئمام قولی ) قەرەقلو بوو, ئمام قولی لە کەسایەتیە بێ ناونیشانەکانی ئەو هۆزە بووە و

دەڵێن دەباغ بووە و ژیانی بە تەنگدەستی بردووەتەسەر.

ناوی تەواوی (نادر قولی) بووە, و بەڵگەیەکی نەنووسراو هەیە, دەوترێت نادرشاە لەو کاتەی کە هێشتا تەمەنی نەگەیشتبووە (١٨)ساڵ لەگەڵ دایکی لە یەکێك لە هێرشەکانی ئۆزبەگی خوارزم بە دیل گیراوە,

دوای ماوەیەکی کورت لە بەند فیراری کردووە و گەراوەتەوە خوراسان و چویتە خزمەتی حوکمرانی ئەبیورد (بابا علی بەگ), ئەو گروپێکی بچووکی لە دەوری خۆی کۆ کردەوە و دوای دەست بەسەر داگرتنی چەند ناوچەیەکی خوراسانی ناوی نا (نادر قولی بەگ). لەو سەردەم ئەفغانەکان بە سەرکردایەتی (مەحمود) ئەفغان دەستیان بەسەر شاری (ئیصفەفان) داگرتبوو و شاە سولتان (حوسینی صەفەویان) کوشت, بە شکانی ئیصفەهان و کوشتنی شاە سولتان حوسین, کوری بە ناوی شا تەهماسبی دووەم کە لە ئیصفەهان هەڵاتبووە قەزوین خۆی کردە پاشای ئێران, ساڵی (١١٣٥) ی کوچی قەمەری, بەڵام دەسەڵاتدارانی ناوچە جیاجیاکانی وولات ئامادە نەبوون گوێ راگری بن.

مەحمود ئەفغانیش کە تەنیا فەرمانرو بوو لە ئیصفەهان و دەوروبەری, لە ساڵی (١١٣٧) ی کۆچی قەمەری بەدەست ئەشرەفی کورە مامی کوژرا, هەر لەگەڵ ئەو وەزعە نادر کە ئاگاداری دەسەڵاتی بنەماڵەی صەفەوی بوو پەیوەندی کرد بە شا تەهماسبی دووەم و بووە سەرلەشکری سوپا لە ساڵی (١١٣٩) ی کۆچی قەمەری, دوای شاری ئیصفەهانی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی.

(فئودالی گەورە) مەلیك مەحموودی سیستانی (دەسەڵاتداری سیستان) کەمێك رێگریبوو بۆ ئەوەی نادر قولی بەگ دەسەڵات بگرێتە دەست, بەڵام نادر لە ساڵی (١٧٢٦) ی کۆچی بە یارمەتی شا تەهماسبی صەفەوی و فەتحەلی خانی

قاجار (کوری شا قولی خان و باپیرە گەورەی ئاقا محمد خانی قاجار ) توانی بۆ لای خۆی رابکێشیت ودوای مەحموود بشکێنێت و بناغەی فەرمانروای شای ئێران لە خوراسان بگرێتە دەست. شا تەهماسبیش نادر قولی کردە والی خۆی لە خوراسان و لە دوای نادر ناوی خۆی کردە ( تەهماسب قولی)، دوای سالێك نادر پەیوەندی خۆی بری لەگەڵ شا تەهماسب و دوای تێك شکاندنی چەند هۆزێکی تورك توانی تەواوی خوراسان بگرێتە دەست. دوای بۆ ئەوەی شا تەهماسب بگەینێتە دەسەلات لە سالی (١٧٢٩) زاینی لەگەڵ ئەفغانەکان کەوتە شەر، سەرۆکی ئەفغانەکان واتا (ئەشرەفی ئەفغانی) لە مهماندوستی نزێك (دامغان ) ولە شەری دامغان و دوای لە مورچە خورتی ئیصفەهان و بۆ جاری سێیەم لە زەرقانی فارس شکاند، و دوای کەوتە دوایان و ئەفغانستانی داگیر کرد و هۆزەکانی ئەو ناوچەیەی خستە ژێر دەسەلاتی خۆی بەم جۆرە دوای حەفت سال لە سالی (١١٤٢) کۆچی قەمەری کۆتائی هێنا بە شۆرشی ئەفغانەکانی. دوای کەوتە شەر لە گەڵ دوژمنانی دەرەکی و روسەکانی لە باکوری ئێران دەرکرد، بەلام لەو کاتەی کە لە رۆژئاوا لەشەردا بوو لەگەڵ عوسمانیەکان تێ گەیشت کە راپەرینێك لە رۆژهەلاتی ئێران بووە و شەرەکەی بە نیوە تەواوی بە جێ هێشت و چووە لای راپەرینەکە. شا تەهماسبی صەفەوی بە بیانووی ئەوەی کە ئەویش هەیە دریژەی دا بە شەری نادر شا بەلام بە سەختی توشی هەلاتن هات.

لە سالی (١١٤٥) کۆچی قەمەری بە دوای پەیمانێك لە نێوان شا تەهماسبی دووەم و دەولەتی عوسمانی کە بەشێك لە ئازەربایجان بدات بە دەولەتی عوسمانی، نادر سەرکردەی هۆزەکانی کە لایەنگری صەفەوی بوون لە جێگایەك کۆکردەوە و بە یارمەتی ئەوان شاتەهماسبی لە پاشایەتی لادا و کورە

بچووکەکەی بە ناونیشانی (شاعەباسی سێیەم)ی کردە پاشا و خۆی کردە جێگری. بەڵام لە راستیدا دەسەڵات لە دەست نادر بوو, نادر لەماوەی دوو ساڵ هەموو ئازربایجان و گورجیستانی لە عوسمانیەکان وەرگرت و عوسمانیەکانی بە سەختی شکست دا.

پاشایەتی نادرشا:

لەساڵی (١١٤٨)ی قەمەری نادرشا هەموو دەسەڵاتداران و ئاغاکانی ئێرانی لە دەشتی مۆغان کۆکردەوە کە (٢٠ر٠٠٠) کەس بوو. نادر لە ئەنجوومەنی دەشتی مۆغان باسی کرد کە کارەکانی خۆی ئەنجام داوە و دەیەوێت ئیسراحەت بکات و خۆی لە ئیشەکان لابدات, گەورە پیاوانی دەولەت دەیان زانی کە نادر حەزی لە دەسەڵاتە, بۆیە نادریان هەڵبژارد بۆ ئەوەی دەسەڵات بگرێتە دەست, بەم شێوەیە شا عەباسی سێیەمی صەفەویان لادا و دەورانی حکومەتی ئەفشاری دەستی پێ کرد بەپاشایەتی نادرشا, نادر دوای ماوەیەکی کەم لە ساڵی (١١٤٨) ی قەمەری, تاجی لەسەری دانا, شاعیریك بە ناوی (قوام الدین), دانانی تاجی بۆ بە (خیر لە رووداني) کردە سروود کە لە سکەکانی سەردەمی ئەفشاری نەقشێنرا.

نادر بۆ ماوەی (١٢) ساڵ پاشایەتی کرد و لەو ماوەیە هەموو کات هێرشی دەکردە ناوچە جۆراو جۆرەکان, لەو ماوەیە توانی (بەحرین, قەندهار, خوارزم, بوخارا و زۆر ناوچەی تری کە ماوەیەکی زۆر لە ئێران جودا ببو گەراندیەوە بۆ ئێران, گرنگترین ئازاد کردن ئازاد کردنی هندستان بوو.

ئەفغانەکانی یاغی بوو دوای ئازاد بوونی قەندەهار بە دەست نادر, هەڵاتبوون دەهلی, نادرشا سێ جار هندستانی ئاگادار کردەوە کە ئەفسەرانی ئەشرەف

ئەفغان کە لەگەڵ تالان کەران بوون کە نزیکەی (٨٠٠) کەس بوون و دەستیان هەبوو لە قەتل و عام کردنی ئێران بگرێنەوە بۆ ئێران, ئەگەر نەگەرێنەوە ئەوان سوپای ئێران رەوانە دەکەن و لە رووباری سند تێ دەپەرێنن و لە دارستانی کەرنالی هندیەکان تێك دەشکێنن و دەست بەسەر دەهلی دادەگرن, دوای (٨٠٠) تالان کەرەکانی ئەفغانی لە بازاری دەهلی لە سیدارە دەدەن و دەگەرێنەوە بۆ ئێران, نادر بەهۆی ئەوەی کە سوپایەکی کەمی هەبوو توانی رووبەرووی لەشکری فیل سواری هیندی ببیتەوە بە بەکارهێنانی تەکنیکەکانی نوێ ی شەڕ، توانی لەشکرە گەورەکەی هیندستان لەناوببات. نادرشا بە هۆی فێرکاریەکانی قورسی شەر و ئامادە کردنی سوپای خۆی توانی لەشکرێکی شەرکەر و بە توانا دژ بە دوژمنی دروست بکات. لەو شەرەی کە رۆژێکی خایەند توانی بیست تاکو سی هەزار کەسی هیندی بکوژێت بە ناچار محەمەد شای گورگانی پاشای هیند داوای راوەستانی شەری لە نادرشا کرد کرد, نادریش لە بەرامبەر گەرانەوەی لەشکرەکەی لە شەر کلیلی خزینەی هیندی وەرگرت و بە تەورداس محەمەد شای کردە دووپارچە و بە تاجی پاشای لەسەر بەجێ هێشت, نادر بەو دەسەکەوتە زۆرەی کە لەشەری هیندستان بە دەستی کەوتبوو گەراوە بۆ ئێران, ئەو دەسکەوتەی کە نادرشا هینابویەوە بۆ ئێران (١٠) ئەوەندە و زیاتر لە زۆرترین دەسکەوتی سالانەی سەردەمی صەفەوی بوو, لە ناو ئەو دەسکەوتانە گەوهەری وەکو چیای پر نور و دەریای پر نور و تەختی پر نور و تاووسی بەناوبانگی تێدا بوو, تەرازوی دەسکەوتەکان لە سنورێك دابوو کە نادر بۆ سێ ساڵ باجی لەسەر ئێران لادا, هێرش کردنی نادر بۆ هیندوستان بووە رێگایەك بۆ لاواز بوون و بنەبر کردنی ئیمپراتۆری مەغۆلی هیند, و گورگانیەکان دوای ماوەیەکی کورت لەگەڵ

دەولەتی ئینگلیز لە رێگای کۆمپانیای هیندی رۆژهەلاتی هاتە هیند. نادرشا لە رۆژانی کۆتایی تەمەنی رەفتاری گۆری و کورەکەی خۆی (رضا قولی) کورە کرد, دوای لە ئیشەکەی خۆی پەشیمان بووەوە هەندێك لەوانەی دەوروبەری خۆی کە بە کەمترخەمی دەزانی کوشت, پیویستە باسی ئەوەی بکەین کە دکتۆرێکی فەرانسەوی هەبوو بە ناوی (بازن) لە کۆشکی نادرشا, بە گووتەیەك لەوانەیە پیلانێك بووبێت لە لایەن ئەو دکتۆرە بۆ کۆرە کردنی رضا قولی کوری نادرشا.

نادر ناچار بوو بۆ دابین کردنی پارەی شەر باجی زیاترلە خەڵك وەربگرێت, لەبەر ئەوەی راپەرینی جۆراو جۆر لە جێگا جیاجیاکانی وولات بەرپا دەبوو, کاتێك کە نادر بۆ لە ناوبردنی یەکێك لەو راپەرینانە چوو بووە خوراسان گروپێك لە کاربەدەستانی بە سەرکردایەتی (عەلی قولی خان ) شەو هێرشیان کردە سەر خێمەی نادرشا و نادر شایان کوشت. بە گووتەی (لارنس لاکهارت) مێژوو نوویسی ئینگلیزی (ر.ك.صادق رضازادە شفق , نووسەری کتێبی نادرشا) رووداوەکە بەو شێوەیە بووە کە نادر لە دوامانگەکانی کۆتایی ژیان بە ئەو پەری تورەی دەسەڵاتی دەگێرا و بە چەند هۆیەك گومانی لە تەواوی سەرکردەکانی ئێرانی هەبوو.

... نزیکەی چوار هەزار سەربازی ئەفغانی لە ئۆردووگا هەبوون کە هەموویان وەفاداری نادرشا بوون و دوژمنی تەواوی ئێرانیەکان بوون. نادر شەوێك سەرکردەکەی ئەفغانیەکانی بانگ کردن و گووتی: من لە حەرەسەکانی خۆم رازی نیم و ئاگاداری وەفاداری و ئازایەتی ئێوەم, فەرمان دەدەم بەیانی هەموویان دەستبەسەر بکەن و زنجیریان بکەن و ئەگەر یەکێکیان بەرگری کرد بی کوژن, ژیانی من لە مەترسیە و بۆ پاراستنی گیانی خۆم بەس پشت بە ئێوە

دەبەستم... ئەوان ڕۆیشتن تاکو خۆیان ئامادە بکەن ...بەڵام نوکەرێکی گورجی ئەو باسەی گەیاندە دەست کاربەدەستانی نادرشا و ئەوانیش سور بوون تاکو درانگ دانەهاتووە نادرشا لە ناو ببەن... تا ئەو کاتەی کە کەمێك لە شەو ڕۆیشت, ئەو شەو نادرشا لە خیمەی (چوکی) کچی محەمەد حوسێن خانی قاجار بوو سەرکردەکانی نادرشا هاتن و ترس ئەوەندە بە سەریاندا زاڵ ببوو کە بە زۆریان دەترسان بێنە ناو خیمەکە, بەس محەمەد خانی قاجار و صالح خان و کەسێکی شێواوی تر چوونە ناو خیمەکە, چوکی تاکو ئاگادار بەوە نادری لە خەو هەڵساند نادرشا هەراسان لە خەو هەڵساو شیرەکەی ڕاکێشا, پێی لە کندری خیمە گیری کرد و کەوتە سەر زەوی تاکو ویستی هەڵسێت صالح خان شیرێکی لێدا و دەستێکی نادری لە جەستەی جودا کردەوە, نادر ترسا و لە شوێنی خۆی ئەبلەق بوو, بەڵام محەمەد خانی قاجار غیرەتی خۆی پاراست و سەری نادری لە جەستەی جودا کرد, ( یەك شەممە یازدی جمادی الاخر ( ١١٦٠) بەرامبەر بە (٢٠)ی ژوئەنی (١٧٤٧) بەرامبەر بە (٣٠)ی خردادی (١١٢٦) هەتاوی ) ی. ئەو ووتەیە (لارنس لاکهارت) بە کەم وزۆری لە ووتەی (جیمز فریزر)ی ئینگلیزی کە نادر شای بە تەواوی دەناسی و چەند مانگێك لەگەڵ نادر دابوو, و دکتۆری فەرانسەوی نادر شا (بازن) یش ناوی هاتووە لە کتێبی (رضازادە شفق).

دوای مردنی نادرشا زۆر لە منالآنی نادر و برایەکانیشی کوژران. رضازادە شفق لە کتێبی نادرشا( لاپەرە ٢٢١ تا ٢٢٢ تەهران ١٣٣٩ چاپ کراوە شابك (٩٧٨٩٦٤٣٨٠٣٣٣٩) بە ووتەی لێکۆلەری ئینگلیزی (لارنس لاکهارت) کتێبی نادرشا (١٩٣٨) وا باس دەکات, دوای کوژرانی نادرشا برایەکانی و کورەکانی... عەلی قولی خان ئەوەندە کینەی لە ناو بردنی بنەماڵەی نادری لە دڵ دابوو هەتاکو

ئەو ئافرەتانەشی کوشت کە حەملیان هەبوو و لە تەواوی منداڵەکانی بەس ( شاهرخ) ماوە, ئەو ناوە بێ گومان هەڵەیە, (لێ کۆلیەری ئیمە لەو بارەیەوە بەردەوامە) شاهرخیان نەکوشت, لەبەر ئەوەی لە دایکەوە صەفەوی بووە و گووتیان مەبەست لە نەکوشتنی ئەوە بووە نەوەکو رۆژێك خەڵکی ئێران بیانەوێت پاشایەکیان هەبێت لە بنەماڵەی صەفەوی بێت, بە ووتەی چەند بەڵگەیەکی جیاواز لەوانەیە(فەرهەنگی مایری ئەلمانی چاپی (١٨٨٨) و کتێبی (تورکەکان لە هیند) لە نووسینی (هینری جورج کین) چاپی یەکەمی دەگەرێتەوە بۆ ساڵی (١٨٧٩) و چاپی نوێ لە لایەن زانکۆی هاوایی دەگەرێتەوە بۆ ساڵی (٢٠٠١), شابك (٠٨٩٨٧٥٥٣٤٤) لە لایەن هاوریانی نادرشا لە لایەن مەلیکەی نەمسا (ماریا ترزا. نەمسا) بردو و پیانی دا, ماریاترزیا ناوی ئەو کورە دەگۆری و ناوی لێ دەنێت (بارون فون سملین Baron van Semlin ) بە (سملینی ئەمرۆ زمون Zemun دەگوترێت و بەشێکە لە شاری بلگراد پایتەختی صربستان). ئەو کورە وەکو گەورە دەبێت پەیوەندی دەکات بە لەشکری روسیە و بەشداری دەکات لە شەری حەوت ساڵە و نیشانەی سەربەرزی وەردەگرێت, ئەو لە شاروچکەی (مودلینگ) لە ناوچەی (ڤینا) دەمرێت لەوانەیە هەر لەویش شاردرابێتەوە.

ئێران لە سەردەمی نادر شا:

لە یەکێك لە بەڵگە راستەکان گواستراوەتەوە کە ئەگەر سەرکردە خائینەکانی سوپاکەی نادریان نەکوشتبایە نادر دەیویست دەست بەسەر ئەلمانیش دابگرێت. ری و شوێنی پێ ی جاسوس و نێردراوەکانی رۆژئاوا لە هاندانی سەرکردەکانی نادرشا بۆ کوشتنی نادر بە بەر چاو دەکەوێت. لەو کاتەی کە صەفەویەکان بە

هێرش کردنە سەر ئەفغانەکان بلاو ببونەوە و وولاتیان لە سنور بەزاندنی دوژمنانی ناوخۆ و دەرەکی دا بوو, عوسمانیەکان لە رۆژئاوا و روسەکان لە باکور و عەرەبەکان لە باشور و تورکمانەکانیش لە رۆژهەلات مەشغولی قەتل و عام کردن بوون نادرشا وەزعیەتی حاکمیەتی ئێرانی چاك کرد.

لە سەردەمی نادرشا دوژمنان و داگیرکەران سەرکوب کران لە لایەن نادرشا , و دەولەت کەمێك لە هێزی رابردووی خۆی بەدەست هێنایەوە بۆ پاراستنی مەرز و قولأی هێزی دەولەتێکی بە توانای ناوەندی کە بتوانی تەواوی وولات بپارێزێت لە دەسکەوتەکانی لە دەست تورکمانەکان وئۆزبەکەکان کە بکشێنەو بۆ پشت رووباری ئەو سەردەم. ئەو بالّەخانانەی کە لەسەردەمی نادرشا لە خوراسان دروست کران وەکو (کلات و کۆشکی هەتاوی) لە شوێنەوارە دێرینەکانی ئەو سەردەمن). لەسەردەمی نادر زۆر گرنگی بە سوپا و دەستبەر کردن دەدرا. نادر هۆزەکانی ئێرانی یەکگرتوو و گونجاو کرد لە ژێر ئالای ئێران و جارێکی تر ئێران بووە بەهێزترین وولاتی ئاسیا, شارەکان یا هەریمەکانی ئێرانی لە دەورەی نادر بەو شێوەیەی خوارەوە بوون.

ئازربایجان, ئەفغانستان, بلوچستان,پاکستان, ترکمنستان, گرجستان, داغستان, بحرین, قطر, کشمیر و ئیتر.

نادرشا لەو فەرمانرەوایانە بوو کە بۆ دوایین جار ئێرانی گەیاندە سنوری سروشتی فلاتی خۆی. و هەولّی دا بۆ بەدەستهێنانی پاپۆری گەورەی شەر تا ماڤی مێژووی وولات بگەینێتە سەر لێواری رووبارەکانی باکور و باشور ( ئەو هەروها هەولّی دەدا بە یارمەتی ئینگلیزێك بە ناوی دالتۆن هێزی دەریایی دروست بکات بەلأم سەرنەکەوت) دەولّەتی نادر توانی زەوی گەورەی فلاتی ئێران بپارێت

و وا بکات بۆماوەیك لە ژێر یەك دەسەڵات و یەك رەنگی ئێران رابگرێت تا ئەوکاتەی کە کوژرا.

جێگرەکانی نادر شا:

لە دوای نادرشا، کریمخان(یەکێك بوو لە سەرکردەکانی نادر) کە لە عەشیرەتی زەندی گەیشتە دەسەڵات. ئەو دەوڵەتانەی کە لە دوای نادرشای ئەفشار سنوردار کران لە خوراسان، کریمخان لەبەر رێزگرتن لەنادر ئەو ناوچەیەی خستە ژێر دەستی نەوەکانی نادر، لەبەر ئەوەی نادری بە گەورەی خۆی دەزانی. بەڵام نادر ئەوەی تێدا نەهێشتبەوە کە جێگرێکی باش لە دوای خۆی بە جێ بهێلێت، ئەو زۆر لە دەوروبەرەکانی خۆی کوشت، دوای مردنی نادر سەرکردەکانیشی لە گۆشەو کنار ئاڵای سەربەخۆیان بەرزکردەوە. کریمخانی زەند بووە نوێنەر لە شیراز، ئەحمەد خانی ئابدالی لە ئەفغانستان، ئازاد خانی ئەفغانی لە ئازربایجان، حسن عەلی خان ئەردەلان لە کوردستان و هەتا محەمەد حسن خان قاجار لە مازندران دەستیان کرد بە فەرمانرەوای حکومەت، لە خوراسانیش عەلی قولی خانی ئەفشار (برازای نادرشا) زۆر لە منداڵان و بنەماڵی نادریان قەتل و عام کرد و ناوی خۆی نا (عادل شا) و دەستی کرد بە فەرمانرەوای کردنی حکومەت، ئەو کە پیاوێکی خوێنرێژ و سەرکەش بوو، محەمەد حسن خانی قاجاری شکست دا، کوری ئاقا محەمەد خانی قاجاری بە بنەماڵەوە لە ناوبرد، بەڵام لە کۆتایی لەلایەن برای خۆی ئیبراهیم خان کۆرە کرا و دوایی کوژرا. نەوەی نادر بە ناوی شاهرخ میرزایان گەیاندە دەسەڵات، دوای ساڵێك ئەویش هەموو شتێکیان لێ وەرگرتەوە و کۆرە کرا، بەڵام دیسان دەسەڵاتی گرتە دەست و لە لایەن شا سلیمانی دووەم(لەبنەماڵەی صەفەوی کە

جێگای ڕێزی مامی بوو) کوژرا, شاهرۆخی نابینا چل و هەشت ساڵ فەرمانرەوائی کرد, بەڵام تەنیا بەس لە خوراسان, لە دوای مردنی کەریم خان,ئاغا محەمەد خان گەیشتە دەسەڵات و هێرشی کردە سەر خوراسان و بە ئەشکەنجە شاهرخی کوشت, نادر میرزا کوری شاهرخ باوکی پیرو کۆرەی لە دەست خوێنرێژانی قاجاری دەرهێنا و فیراری کرد بۆ ئەفغانستان و لەسەردەمی فەتحەلی شا داوای دەسەڵاتی کرد دەسبەسەرکرا و کۆرە کرا زوبانیان بری و کوشتیان و دواین داواکاری دەسەڵات لە بنەماڵەی ئەفشاریان لە ناوبرد, وەزیری نادرشا محمودی مەیمەندی لە ناوچەی گوندی مەیمەند لە قەزای شاری بابەکی پارێزگای کرمان بوو.

شەری نادر شای ئەفشار لەگەڵ ئەشرەفی ئەفغانی لە مهماندۆستی دامغان:

سەرچاوە : کتێبی سیمای پارێزگای سمنان.

نادر قولی لە خوراسان نزیکەی هەشت هەزار کەسی ئامادە کرد و لایەنگری تەهماسب میرزای کرد بۆ لەناوبردنی ئەشرەف ئەفغان کەوتە ڕێ و لە لایەکی ترەوە کە ئەشرەف خان کە محموود ئەفغانی کوشتبوو و خۆی کرد بووە پاشا, وەکو ئاگادار بەوە بریاری دا پێش ئەوەی کە هێزی نادرشا بەهێزتر بێت بچێتە خوراسان ئەو دوو هێزە لە ناوچەی مهماندوستی دامغان لە مانگی ربیع الاولی ساڵی (١١٤٢) ی کۆچی قەمەری بەیەك گەیشتن, ژمارە سوپای نادر لە سوارە و پیادە نزیك سی هەزار کەس بوو, و ژمارەی سوپای ئەشرف ئەفغانیش نزیکەی ئەو ژمارە بوون. بەرەبەیانی رۆژی شەممە شەشەمی ربیع الاولی ساڵی (١١٤٢)ی کۆچی قەمەری سوپای ئێرانی ئەو سەردەم بە سێ ڕێز بەو شێوەی خوارەوە راوەستان:

١-لە لای راستی مەیدانی شەر بە سەرکردایەتی گورجی خان هێزی پیادە بوو.
٢-لەلای چەپی مەیدانی شەر بە سەرکردایەتی سەردار عەلی خان ئابدالی هێزی پیادە بوو.
٣-لە سەنتەری مەیدانی شەر بە سەرکردایەتی حاجی خان بەگ, و نادر خۆی سەرکردایەتی تۆپخانە و سوارە نیزامی لە دەست دابوو فەرمانی دا بە سوپای ئێران کە بە بێ فەرمانی من سەرکردایەتی سوپا لە جێگای خۆیان نەجوولێنەوە تاکو ئەوان دەست پێشخەر نەبن, دوای نیوەرۆی رۆژی شەشەمی ربیع الاول هێزی ئەفغانی هێرشی کرد و سوارە نیزامی ئەوان چووە لای رێزی پیادەی ئێران کە لە سەنتەری مەیدانی شەر بوو کەوتنە شەر و دەستیان کرد بە کوشتن. (دەبی بزانیت کە شوێنی شەر مهماندوستە کە ئێستاکە لەسەر رێگای دامغان و شاهرودە نییە) بەڵکو ماوەی نێووانی (٦) کیلومەترە بۆ لای باکوری کەندی (طرزە) کە کاول بووەکانی هێشتاکە ماوە و خەڵکی کۆنی مهماندوست دەڵێن.

نادرشا فەرمانی دا سوارچاکەکان لە شوێنی خۆیان دەرهاتن و کەوتنە گیانی ئەفغانەکان و هێرشی سوارچاکی ئەفغانەکانیان پەرت و بڵاو کرد. دیسان ئەفغانەکان بە سێ رێز راوەستان, سەخت هێرشیان کرد, زۆریان لێ کوژرا و لە کەندی (طرزە) ی کشتگان زۆر لە جێگایەکی کەم کۆبوونەوە, مەیدانی شەر زۆر ترسناک ببوو, زۆر لە سوار چاکەکانی ئەفغانی کوژران کە باشترین شەرکەرانی ئەفغانی بوون, ئەشرەف ئەفغان بۆ دواین جار بە هەموو سوارچاك و هێزی پیادەی هێرشێکی سەر شێتانەیان کرد, و تۆپخانەی نادری بە سەختی رێزەکانی کەوتە ژێرگوللە باران, بەو شێوەیە ئەفغانەکان هاتنە پێش, نادر لەسەر ئەسپ فەرمانی دا کە موسیقای هێرشی سوارچاك لێ بدرێت و سواران لە تەنیشتی

راستی دوژمن و لەسەر کەندی (طرزە) هێرشێکی ترسناکیان کرد, و لە سەرکردایەتی فەرمان درا بە تۆپخانە لەسەر گردەکانی مەیدانی شەر دوژمنیان هاوێشتە ژێر گوللە باران. تۆپخانەی ئەفغانەکان بە هۆی هێرشی سوارچاکەکانی سوپای نادر تێك شکا و کوژاوە, هێزی نادری لە هەموو لایەك فشاریان هێنا سەر دوژمن و نادر بەخۆی هاتە ناو ئاوەدانی مهماندۆستی دامغان و بە چوار گوللە تۆپ دیواری قەڵای مهماندۆستی خراپ کرد تاکو هێزی پیادە لە پشتەوە هێرش بکاتە سەر دوژمن. ئەشرەف ئەفغان لەسەر گردەکانی رۆژئاوای مەیدانی شەر تەماشای شەرەکەی دەکرد, لەبەر ئەوەی دیتی کە سوپاکەی وەزعیان باش نییە تۆپخانە وئۆردگای خۆی بە جێ هێشت و گەرایەوە دواوە تاکو ئێوارە هێزەکانی خۆی لە شەر کشاندەوە, وەکو هەوا تاریك بوو شەرەکە تەواو بوو, لە کۆتایی ئەشرەف ئەفغان توانی دە هەزار کەس لە سوپاکەی کە پەرت و بڵاو و پەریشان بوون کۆ بکاتەوە و فیرار بکەن بۆ تاران. کوژراوەکانی هەردوو لەشکر گەلێك زۆر بوون, بە جۆرێك کە لە زۆر شوێن چەندها جەستەی پیادە و سوارچاك لەسەریەك دانرا بوون و زیاتر لە نیوەی لاوەکانی ئەفغانی لەگەڵ گروپێك لە ئەفسەرانیان کوژران. ئەو سەرکەوتنە بۆ نادر زۆر گران تەواو بوو, بەڵام لە کۆتایی هەوڵی خۆی و گیان فیداکردنی لاوانی ئێرانی روویەکی تری بە خۆیەوە گرت, دوای نادر لەوی رۆیشت و رۆژی دووشەممە نۆیەمی ربیع الاول چووە شاری دامغان, دوو رۆژ راوەستا و دوای چووە شاری سمنان.

ووتە بە نرخەکانی نادرشای ئەفشار:

سەرچاوە: ژیانی نادرشا – لە نووسینی جونس هنوی , وەرگێرانی ئیسماعیل دەولتشاهی.

نادرشای ئەفشار, دانەری دودمانی ئەفشاریە کە دوازدە ساڵ فەرمانرەوای لە ئێران کرد.پایتەختی شاری مەشهد بوو. ئەو ناسراوترین پاشای ئێرانە لە دوای ئیسلام. ووتەکانی خوارەوە لە کتێبی نادرشایە لە نووسینی نووسەری ئینگلیزی (ئێران لە سەردەمی نادرشا).

– مەیدانی شەر دەتوانی ببێتە مەیدانی هاوڕیەتی ئەگەر هەردوو لا لە مەیدانی شەر بە مافی خۆیان رازی بن .

– بێ دەنگی شیرە کە من هەردەم سودم لێ وەرگرتووە.

– هەموو جەستەم بۆ سەرکەوتنی وولاتم بەخشی بۆ ئەوەی سەرفرازیەکی هەمیشەیی بۆ وولاتەکەم بەدەست بهێنم.

– دەبی رێگایەك بدۆزمەوە . لە تاریکی شەوە تووشەکانی وولاتم, هەموو کات بە دوای روناکیەك بووم, نورێك بۆ ئازاد بوونی وولاتەکەم لە دەست بیگانەکانە, چەند ترسناکە کە دەبینی ماڵ و ناموست کەوتووتە دەست بیگانە و دەستەکانت بەستراوە ناتوانی هیچ بکەی بەڵام هەموو جەستەت بۆ ئازادی تۆ ئامادەیە, تۆ دەتوانی ئەو تەنیا هێزە کە لە ناخی جەستەتەوە هاوار دەکات, تۆ دەتوانی ئێش و ئازار سارێژ بکەی و بەم جۆرە بوو کە سواری ئەسپەکەم بووم بە ئارەزوی سەرفرازی گەورە.

– نابی لە دوژمنی گەورە بترسی, بەڵام دەبی لە صەفەویەکان و لاوان ترست هەبێ, ئەو لاوەی کە لە ئارەزوە گەورەکانی دوور بەوە نە تەنیا یارمەتیدەری کۆمەڵگە نییە بەڵکو دەبێتە بارێك بۆسەر کۆمەڵگا.

– ئەگەر فیدایەکی لاوی ئیرانی نەبێت, هێزی دەیان نادریش ناگاتە هیچ جێگایەك.

– زانایان و بە هۆشەکانی وولاتم, ئازادی زەویەکانی وولات بە سوپای من و پەروەردەکردنی نەوەکانی دوارۆژیش بە ئێوە بەندە, ئەگەر ووتەکانی ئێوە خەڵك ئاگادار بکاتەوە, ئیتر پیویستی بە شیری نادریەکان نابێت.

– وەکو سواری ئەسپ دەبی, سواری سەر باڵی مێژووش دەبی و ئیشی تۆ زیندو دەمینێتەوە لەبەر ئەوەی هەزاران مناڵی بە دنیا نەهاتووی ئەو وولاتە ئازادیان لە هێزی بازو و بیرکردنەوەی ئێمە دەوێت, مادام بە ئیشی خۆمان فێریان دەکەین کە باوکەکانیان لە بۆ دوارۆژیان بێ لایەن نەبووینە و ئەوان فێر دەبن کە ئازادیەکەیان بە هیچ نرخێك نەفرۆشن.

– هەر سەربازیك کە دەکەوێتە سەر زەوی و روحی دەچێتە ئاسمان نادر دەمرێت و لەدەست دەچێت و نادر ناچێتە ئاسمان, نادر ئاسمانی بۆ سەربازەکانی دەوێت و بە خۆی بێ بەختی و نەهامەتی, ئەو هەموو فیشارانی بۆ پەیدا بوونی ئێرانی گەورە بە گیان دەکری, پێشکەوتن و توانای ئێران تەنیا هۆیە کە هاواری هێرش بەنە سەر دوژمن لە گەلوی پر غەمی من دەر دەکا و من رەوانە دەکات بۆ ناو جەرگەی دوژمن.

– شاهنامەی فردوسی زیرك, ڕێ نیشاندەرم بووە لە هەموو تەمەنم.

– ئازادکردنی هیند شانازی نەبوو, بۆ من گرتنی تاوانباران و خۆ بەدەستدانی ئەو تاوانبارانە بوو کە بیست ساڵ وولاتمی وێران کردە بوو و تاوان و تاڵانێکی زۆریان لە دەرحەقی خەڵکی وولاتەکەم کردە بوو, ئەگەر مەبەستم شانازی بایە سەرکردەکانی رۆژئاوام بە ئەسیر دەگرت, کە ئەوەش لە مردایەتی و رەوشتی ئێرانی من بە دوورە.

– پشتێنی دەسەلات,نیشانەی نۆکری یە بۆ وولاتەکەم, نادرەکان زۆر هاتن و

دیسان دێنەوە بەڵام ئێران و ئێرانی دەبێ هەردەم لە گەورەی و سەروەری بێت, ئەوە ئارەزوی تەواوی تەمەنم بووە.

– لەو کاتەی کە دەستەڵاتم گرتە دەست ئێران کاول کرابوو و زۆر لە خەڵکی ووڵاتەکەم کۆیلە بوون, سوپای من نیشانەی گەورەی و ئازایەتی ئێرانیان بووە لە درێژایی مێژوو, ئەو سوپایەی کەتەنیا بە دوای پاراستن وئاسایشی ووڵاتەی بووە.

– کاتی سەرکەوتن بۆ من لەو لایەنە شیرینە کە پیران, ئافرەتان و منالانی ووڵاتەکەم لە ئاسایش و خۆشی دا ببینم.

– بۆ زەوی ووڵاتەکەم هیچ کاتێك ووتووێژ ناکەم بەڵکو بە هێز و توانای منالانی ووڵاتەکەم بەدەستی دەهێنم.

– هەندێك جار بێ دەنگیم وادەکات کە دوژمنەکانم چەندەها فەرسەخ لە سنورەکانیان بکشێنەوە دواوە.

– کێ هەیە کە نەزانێت پیاوانی گەورە لە ناو کۆشکەکان زۆرن بە مەبەستی تۆڵە سەندنەوە دێنەدەرەوە, تۆڵەسەندنەوە لە خراپەکار و هەستێك لە ناخم دەیگووت هەڵسە ئێران تۆی هەڵبژاردووە و منیش هەڵسام.

چەند چیرۆکێك لە نادرشا:

–نادرشا لە کاتی مانەوەی لە قەزوین سوێندی خوارد کە وەکو یاسای پێشینەکان فەرمانڕوای دەکات و ئێران لە دست درێژی دوژمنان دەپارێزی.

– نادر فەرمانی دا بە سەفیری روسیا کە شارەکانی (دەربند, باکۆ, شروان, ئاران, ئایروان, رەشت, گەیلان و هەموو ناوچەکانی قەفقاز کە (پەتری) گەورە داگیری کردە بوو و هەروها تاتارەکانی شاخەکانی داغستان کە لە ژێر دەسەڵاتی

خۆی دانابوو گەراندیەوە بۆ ئێران, نادر بە هەموو لەخۆبایەوە ئەگەر روسەکان لە سنورەکانی ئێمە نەگەرێنەوە دواوە بەخۆی گێسکێك بە دەست دەگرێت و هەموویان بە گێسکەکە دەرێژێتە دەرەوە.

– نادر لە ئاهەنگی ئایینی بۆ خەڵك بەم جۆرە قسەی دەکرد: ئەی خەڵکینە بۆچی لە جیاتی داوای یارمەتی لە ئیمام عەلی داوای یارمەتی لە خودا ناکەن؟

– لە شەرەکانی نادرشای ئەفشار لەگەڵ ئیمپراتۆری عوسمانی, تورکەکان وەکو لەگەڵ سوپای نادر دەکەوتنە شەر ئازایەتی و زیرەکی خۆیان لە دەست دەدا.

– نادر بریارێکی دا کە لەئێرەوە بە دواوە ئێرانیان ئازادن بە بیٰ رێگری زیارەتی مەکەی پیرۆز بکەن و سەردانی شوێنە پیرۆزەکانی تری ئایینی لە وولاتانی عەرەبی بکەن و هیچ باج و گومرگیەك نەدەن.

– نادر وای بە پاشای هیند گووت: زۆر ئاگادار بن لە هەڵبژاردنی نوێنەر بۆ دەولەت و ئەو کەسانەی کە دوو روون لە ئیش و کارەکانیان و چاورەوانی هەڵێکن و خۆ ویستن رێگا نەدەن ببنە نوێنەرتان.

– نادر دوای وازهێنان لە بەلوجستان پاکستان و ئەفغانستان و سمەرقەند و بوخارا و خوارزم لە ئۆزبەکستان و تورکمەنستانی ئێستاکە, نامەیەکی نووسی بۆ بەرپرسانی تورکەکانی عوسمانی و تیایدا داوای ئەو شارانەی کرد کە کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی ئێرانیەکان و دوپاتی کردەوە کە ئێران دەبێ بگەرێتەوە سنورەکانی سەردەمی صەفەوی.

– نادر لەسەر سکەکانی خۆی بەم جۆرە نەخشاندە بووی:

سکەم لە زێر کرد ناوی پاشایەتی لە جیهان

نادری ئێرانی و خسرۆی گیتی ستان

و لەسەر مۆری پاشایەتیشی وانووسرا بوو:

ناوکی دەولەت و دین رۆیشتبوو وەکو

خوا ئێرانی بە ناوی نادر لە قەلەم دا

– نامەی نادر بۆ والی عیراق: پاشای عیراق بزانی کە زیارەت کردنی شوێنە پیرۆزەکان لە عیراق مافی رەوای ئێمەیە و ئێمە داواکاری ئەسیرەکانی شەرین کە لەشەر ئەسیری ئێوە بوونە، لەو کاتەی کە هێشتا خوێنی هاولاتیەکانی ئێمە ووشك نەبوویتەوە دەبێ تولە لە ئێوە بکەینەوە، و خوێنی لایانگرانی سولتان برێژین بەو ئەندازەی کە خوێنی ئێرانیەکانیان رێشتووە. لەبەر ئەوە ئەو نامەتان بۆ رەوانە دەکەم تاکو بزانیت کە ئێمە لە ناکاو و بە بێ ویژدانی هێرش ناکەینەوە سەر ئێوە.

فەرمانروای روسیە نامەی رەوان کرد بۆ نادرشای ئەفشار ئەگەر پاشای ئێران بیەوێت روسیە دەتوانی بۆ ئازادی هیند یارمەتی زۆر رەوانە بکات بۆ ئێران بەو مەرجەی کە ئێران یارمەتی روسیە بدات کە روسیە خاوەری ئەروپا داگیر بکات. لەو کاتەی کە روسیە دەیزانی سوپای ئێران بەهێزترین سوپای جیهانی ئەو سەردەمە لەو کاتەی کە ئازاد کردنی خاوەری ئەورووپا بۆ روسیە وەکو ئارەزویەك بوو ئەو پێشنیارەی بۆ فەرمانروای ئێرانی رەوانە کرد، نادر نامەیەکی بۆی نووسی کە لە دوای سەلام بەم جۆرە بوو. هیندیەکان چەندها سال غەدریان لە ئێران کرد، بۆ ئەو ئیشە هیچ پیویستی بە یارمەتی ئێوە نییە، بۆ زانین ئێوە ئێرانیەکان پیویستیمان بە جێگا و وولاتی تر نییە.

وەلامی نادرشای ئەفشار واتای ئەو راستیەیە کە ئەو بۆ ئارەزوە گەورەکانی چاوی لە یارمەتی کەس نییە بێجگە لە یارمەتی خەلکی ئێران و بە

ووتەی(ئارد)ی گەورە زانای ناسراوی وولاتەکەمان: پیاوان پێشرەون, و رێگا دەکەنەو بە ئەو کەل و پەلانە کە کەل وپەلی وولاتی خۆمانە و نە یارمەتی وولاتانی بیگانە.

خوی داگیرکاری روسەکان لە تەواوی مێژوو وەکو وولاتانی ئینگلیز و فەرانسە دیارە کە دەبێ ئەو سێ وولاتە لە هەموو دودمانەکان بخرێتە بەر چاو.

مەزاری نادرشا:

مەزاری نادرشا باڵەخانەیەکە لە باغی شوێنەواری نادری لە شاری مەشهد کە بە بۆنەی یادەوەری نادرشا ئەفشاری لە ساڵی (١١٤٢) ی هەتاوی لە لایەن هۆشەنگ سەیحون دیزاین و دروستکرا.

مێژوونامە:

نادرشا لە ژیانی خۆی فەرمانی دروستکردنی مەزارێکی بچووکی دا لە سەرەوەی شەقامی مەشهد, ئەو مەزارە بچووکە لە ساڵی (١١٤٥) ی کۆچی قەمەری لە تەنیشت چوار باغی شاهی و رووبەرووی مەرقەدی ئیمام رضا لە خشت و خۆر دروستکرا, قوام السلطنە لە کۆتایی سەردەمی قاجاری (١٢٩٦) ی هەتاوی لە شوێنی یەکێك لە گۆرە کاول بووەکانی نادری, مەزارگەیەکی نوێ بۆ دروست کرا و ئێسقانەکانی لە تاران هێنراوە بۆ ئەو مەزارگەیە, باڵەخانەی نوێ کە لە شوێنی ئێستای مەزاری ئەوە ماوەیەك بەرپا بوو, هەتاکو ئەنجومەنی شوێنەواری نەتەوەی ئێران لە ساڵی (١١٣٥) ی هەتاوی مەزارگەیەکی باشی لە لایەن قوام السلطنە لە هەمان جێگا مەزارگەیەکی بۆ نادرشا دروستکرد کە لێ وەشاو بیت بۆ نادرشا ,دروستکردنی ئەو مەزارگەیە لە ساڵی (١٣٣٦) دەستی پێ کرد و لە ساڵی (١٣٤٢) تەواو بوو, باڵەخانەی نوێ ی مەزارگەی نادر ئەفشار

لە ڕێکەوتی (١٢) ی مانگی (١) ی ساڵی (١٣٤٢) بە ئامادە بوونی محەمەد رضا شای پەهلەوی بە پشتیوانی ئەنجومەنی شوێنەواری نەتەوەی ئێران لە باغی نادری کراویەوە.ئەو مۆزەیە ئێستاکە لە ژێردەسەڵاتی بەڕێوبەرایەتی شوێنەواری فەرهەنگی سەرپەرەشتی دەکرێت, لە کۆتایی ساڵی (١٣٨٦) باغی مۆزەی نادری کە لەسەر شێوەی سەردەمیانە دروست بکرێت و دەسکاری کردنی ناوەوەی کرا , دوای شەش مانگ داخرانی مۆزەخانەکە دووبارە کراوە.

گروپی باغی موزەخانەی نادری:

مەزارگەی ئێستای نادرشا کەوتووتە گۆشەی باکوری ڕۆژئاوای چوار ڕێگای شەهیدانی (نادری پیشوو) کە لە دوای مەرقەدی ئیمام رضایە, بە گرنگترین شوێنی گەشت و گوزاری مێژووی ناو شاری مەشهد دادەندرێت, ئەو باڵەخانەیە بە رووپێوی (١٤٤٠٠) مەتری چوار گۆشەی دروست کراوە, مەزارگەکە پێکهاتووە لە سەکۆیەکی دوازدە پایەیی, سەر گۆرەکەی بە خێمە داپۆشراوە, سەکۆیەکی بەرز لە تەنیشت گۆرەکەی بە پەیکەری نادرشا کە سواری سەر ئەسپ بووە و سێ کەسی تریش لە دوای ئەو راوەستاون, ژوورێك بۆ فرۆشتنی کتێب و دوو شوێنی تریش بۆ مۆزە.

پەیکەری نادرشا سواری سەر ئەسپ لەگەڵ چەند سەرباز لەسەر باڵای بەردێکی بەرز لە لایەن پەیکەرساز (ئەبو الحسن صدیقی) دروست کراوە, پیداویستیەکانی گۆرەکە بەزۆری لە بەردی در و رەقی گرانیتی شاخەکانی مەشهد دروست کراوە, هەندێك لەو پارچە بەردانەی کە دانراون زۆر گەورەنە, گۆری دووەم لە لایەن نادرشا دروست کراوە, مەزارگەکە بە تەواوی وەکو خێمەی عەشایریە, کە نادر لەناو ئەو خێمانە لە دایك بووە و مردوە, دیوارەکانی

ناوەوەی مەزارگەکەش داپۆشراوە بە بەردی مەرمەری ئۆخرائی بە هەڵبژاردراوە بە رەنگی مەراغەی تاکو کوشتنی نادرشا لە ناو خێمە باشتر دەرکەوێت. مۆزەخانەی نادری لە بەشی سەرەکی باڵەخانەیەك, و بیرەوری مەزاری نادری ئەفشاری پێکهاتووە لە دوو تالار بۆ ناساندنی شوێنەواری مێژووی ئەو سەردەمە.

– تالاری ژمارە یەك: نیشاندەری کەل وپەلی جۆراوجۆرە بە مەبەستی ناساندنی شوێنەواری مێژووی سەردەمی ئەفشاریە, وەکو چەکی جۆراوجۆر, جل و پۆشاکی سەربازی سەردەمی ئەفشاری, تابلۆی وێنەی لە نادر, و وێنەی شەر, وەکو تابلۆی شەری کەرنال, و کەل و پەلی سوارکاری وەکو زین و بەرگی ئەسپ لە سەردەمی ئەفشاری تاکو سەردەمی قاجاری, چەند نووسراوی خەتی نایاب لە مێژووی ئازاد کردنەکانی نادری و دوو شیر کە تایبەتە بە نادر لەسەر یەکێکیان ووشەی (السلطان نادر) نووسراوە و لەسەر ئەوی تریان کە لە ساڵی (١١٤٨) ی کۆچی لە دەشتی مۆغان رۆژی تاج دانانی نادر لە لایەن میللەتی ئێران پێشکەش کرا بە نادر و لە سەر شیرەکە ئەو بەیتە شیعرە نووسراوە:

هەیە سولتان لە سەر سولتانەکانی جیهان

شای شایان نادری صاحب قەران

–تالاری دووەم: کە لە ساڵی (١٣٧٣) زیاد کرا لە سەر گروپەکە و لە ناو تالارەکە سکەی جۆراو جۆر, و قاپ و ئەو کەل وپەلانەی کە پێشکەش کران بە نادرشا لە سەردەمی صەفەوی تاکو سەردەمی هاوچەرخ لەوی نمایش کراون, هەروها لە گۆشەی باکوری مەزارگەی نادر, مەزاری محەمەد تەقی خانی پەسیان سەرکردەی خوراسان نێژراوە.

پەیکەری نادرشا:

پەیکەری نادرشا بە سواری ئەسپ و ئەفسەرەکانی لە سەر شوێنی نووستنی هەمیشەیی سەرکردەی ئەفشار لە ناوەراستی قەرەبارلغی مەشهەد دانراوە, دیزاینەری ئەو پەیکەرە بە رووپێوی ( ٦/٥ ) مەتر لە لایەن پەیکەرساز ئەبو الحسن الصدیقی مامۆستای پەیکەرسازی هاوچەرخ کە لەساڵی (١١٣٥) لەگەڵ دیزانی نوێکردنەوەی مەزارگەی نادر لەگەڵ هۆشەنگ سەیحۆن دەست پێ کرا, دروست کردنی پەیکەرەکە لە لایەن کۆمپانیای برۆنی لە ژێر دەستی مامۆستا صدیقی و چاودێری بالوێزخانەی ئێران لە ئیتالیا بەرەوە پێش چوو, و لە ساڵی (١٣٣٩) بە دواوە لە تیَ پەرەراندنی تەرمەکەی بە شەش سندوق لە هەموو شارەکانی ئێران گەیشتە مەشهەد و لە سەر تاوەرێکی (١٢) مەتری کە ئەندازیار سەیحون بۆ ئەو شاکارەی مامۆستا ئەبو الحسن صدیقی دیزاینی کردە بوو دانرا، ئەو پەیکەرە یەکێکە لە گەورەترن پەیکەرەکانی کە لە لایەن مامۆستا صدیقی دیزاین و دروست کراوە, ئەندازەیاری دروست کردنی تاوەری پەیکەرەکە کە باڵەی خانەیەکی ناو بەتاڵ و بەرەولێژە, (١٢)ە مەترە بە بەراورد کردن بەرزترین بەشی پەیکەرەکە واتا تەوری نادر و گوی ئەسپەکەیە نزیکەی (١٧) ە مەترە, پایەکانی بەرەوە سەرەوەی تاوەرەکە لە سەرەوە لە شێوەی پلیکانە و لە بەشی ناوەندی بەرەو لێژێکی توندە تاکو دەگاتە سەر زەوی, لە ناوەوی ژوورەکە شوێنەوارێکە, شوێنەوارێکی بەردی دانراوە کە لە سەر بەردەکە ناوی ئەو کەسانە نووسراوە کە یارمەتی دەر بوون بۆ دروست کردنی پەیکەرەکە و مەزارگەکە و نیشانی پەیکەرەکەی لەسەر نەخشێراوە,پەیکەرساز ( صدیقی) دەم و چاوی نادری لەسەر تایبەتمەندیەکانی کە نووسراون لە کتێبەکان و

وێنەی مێژووی دیزاین کراوە دروست کردووە، شێوەی شەرکەرێکی بێ باك بە تایبەتمەندی بیابان گەری لە سەر ئەسپەکەی دانراوە کە لە پشت سەری مۆسیقا لێدەرێك، ئاڵای هەڵگرتووە و چەند شەرکەرێکی عەشایری راوەستاون.



چاپخانەی رۆژهەلات/هەولێر

رەمزی نافع قوربانیە گەورەکەی بەرژەوەندی زلهێزان و سەرگەرمی رێبازی کوردایەتی لە هەولێر